رۆمان

# قۆڵبڕ





نووسینی: عەزیز نەسین

وەرگێڕانی: عەزیز گەردی

له

بلاوكراوەكانی




ناوەندی ئاوێر
بۆ چاپ و بلاوكردنەوە

07504242101
07504209495

| | |
|---|---|
| ناوی كتێب | قۆلپ |
| بابەت | رۆمان |
| نووسینی | عەزیز نەسین |
| وەرگێڕانی | عەزیز گەردی |
| دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆك | ئاكار جەلیل كاكەوەیس |
| چاپ | یەكەم |
| نرخ | ٦٠٠٠ دینار |
| تیراژ | ١٠٠٠ دانە |

شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی (١٥١) ساڵی ٢٠١٤ی دراوەتێ

**لە بلاوكراوەكانی:**

**ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاوكردنەوە**

**ژمارە ( ١٧٢ )**



**وەرگێڕانی ئەم رۆمانە پێشکەشە بە گیانی پاکی**

**کاك حەمید عەبدوڵلاکاکەوەیس**



## کورتەی ژیانی عەزیز نەسین

* عەزیز نەسین ناوی قەڵەمو خوازەیەتی. ناوی راستەقینەی خۆی (محەمەد نەسرەت)ەو نازناوی (نەسین)ە. نەسین واتە (تۆ چ کارەی؟)
* عەزیز نەسین لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی، لە 12/20 /1915 دا، لە دوورگەی (هیبلی) سەر بە ئەستەنبۆڵ لە دایك بووە.
ئەو دوورگەیە یەکێکە لە دوورگە عەیاننشینەکانی تورکیا. بەڵام وا نەبێ باوکی عەزیز نەسین عەیانو نەجیبزادە بووبێ، بەڵکو باوکی کارمەندێکی سادەی شارەوانی بووو لە بەر ئەوەی شوێنی کاری لەو دوورگەیە بوو، بە ماڵەوە لەوێ دەژیا.
* عەزیز نەسین کە لە دایك بوو، بە کۆرپەیی زۆر لەرو لاواز بوو. پێش خۆی چوار برای یەك لە دوای لە برسان مردنو تەنیا ئەو مایەوە بۆ ئەوەی ئەو پەیامە سەنگینە بگەیەنێ کە گەیاندی.
* عەزیز نەسین قۆناغی سەرەتایی هەر لەو شارە خوێند. عەزیز نەسین هەر چەندە لە خێزانێکی نەخوێندەوار بوو، هێشتا دە ساڵی لە تەمەنی تەواو نەکردبوو، کەلکەلەی نووسین لە سەری دا. بەڵام لە بەدبەختی خۆیەوە کە ویستی دەست بۆ قەلەم ببا، لەگەڵ منداڵە هەژارو نەدارەکانی دی رەوانەی قوتابخانەی داخیلی سەربازییان کرد. خۆی دەیەویست ببێ بە نووسەر کەچی بوو بە سەرباز. دبلۆمی لە ئەکادیمیای جەنگ وەرگرت.
* ساڵی (1933)، کە یاسای هەڵبژاردنی نازناوی خێزان لە تورکیا بوو بە تەوزیمی، (نەسرەت) نازناوی (نەسین)ی بۆ خۆی هەڵبژارد.

* ساڵی (1938) بوو بە ئەفسەرو لەو سەردەمەدا دەستی بە نووسین کردو لە بەر ئەوەی نەیدەتوانی بە ناوی راستەقینەی خۆی بنووسێ، شتی بە ناوی باوکی (عەزیز نەسین) بڵاو دەکردەوە. لەمەوە ئەم ناوەی بە سەردا سەپا. ئەمەیش سەرێشەیەکی زۆری بۆ باوکی پەیدا کرد کە کارمەندێکی دەوڵەت بوو. چونکە کارمەندی دەوڵەت نابێ رەخنە لە دەوڵەت بگرێ. پاشان نووسینەکانی زۆر سەرێشەیان بۆ خۆیشی پەیدا کرد.

* (عەزیز نەسین) ساڵی (1944) وازی لە سەربازیی هێناو دەسی بە کاری رۆژنامەوانی کرد. رۆژنامەیەکی دەرکرد بە ناوی (تان) کە زوو جێگای خۆی کردەوە بەڵام دەوڵەت لە ناوی برد. دوای ئەوە چووە دەستەی نووسینی گۆڤاری (یەددی جون).

* (عەزیز نەسین) بە ناوی خوازەیی جۆراو جۆر بابەتەکانی خۆی بۆ گۆڤارو رۆژنامەکان دەنارد، کە ناوە خوازەییەکەی ئاشکرا دەبوو، خێرا نازناوەکەی دەگۆڕی. کتێبێکی بە ناوی خوازەیی بڵاو کردۆتەوە: (وا نەبووەو هەر وایش نابێ).

* ساڵی (1946)، بە هۆی نووسینەکانی کەوتە زیندانو پێنج ساڵ زیاتر لە دونیای رۆژنامەوانی دوور کەوتەوە.

* دوای دەرچوونی لە زیندان، خەریکی کتێبفرۆشییو وێنەگریی بووو دووبارە دەستی بە نووسین کردەوە.

* (عەزیز نەسین) لە سەردەمی خوێندنی سەربازییەوە دەستی بە نووسین کرد. یەکەم جار چیرۆکەکانی خۆی لە گۆڤاری (یەددی جون)و دوای ئەوە لە گۆڤاری (میللەت)و گۆڤاری (یەنی ئادەم) بڵاو دەکردەوە.

* (عەزیز نەسین)، جگە لە بڵاو کردنەوەی چیرۆكو وتار لە رۆژنامەی (تان)، دەستی بە نووسینی چیرۆکی گاڵتەئامێز کرد.

* پاشان بە هاوکاری (سەباحەدین عەلی)ی برادەری گۆڤاری (مارکۆ پاشا)ی دەرکرد کە تایبەت بوو بە داشۆرین. بە وای ئەو داشۆرینانەوە دووبارە کەوتەوە زیندان.

* (عـەزیز نەسـین)، دوای ئـازادبوونی لـە زینـدان، دەسـتی بـە نووسـینی چیرۆك کردەوەو ئەم جارە گۆڤاری گاڵتەئامێزی (ئاق بابا)ی بڵاو کردەوە. لە هـەمان کاتـدا، کۆمەڵە چیرۆکێکی خۆی چاپ کرد.

* عەزیز نەسین لە 1995/7/6 کۆچی دوایی کردووە.

* (عـەزیز نەسـین) دوو سـاڵ لـە سـەر یـەك، لـە پێشـبڕکێی جیهـانی نووسـینی گاڵتەئامێزدا، کە ساڵانە لە ئیتالیا رێك دەخرا، خـەڵاتی (دار خورمـا)ی زیـڕینـی بـە دەست هێنا.

* (عەزیز نەسین) دوو هەزار چیرۆكو پەنجاو سێ کتێبو حەفت شانۆگەری زیـاتر نووسیوە. زۆربەیان بۆ زمانانی دونیا وەرگێڕدراون.

* تـا ئێسـتا کۆمـەڵێ چیرۆكو کتێبی (عـەزیز نەسـین) کـراون بـە کـوردی وەکـوو: گێلەپیاوو بیرەوەرییەکانی دوورخراوەیەكو کلکبڕاوەکانو....

* (عەزیز نەسین) داهاتی زۆری نووسینەکانی خۆی بـۆ (بنیـادی نەسـین) تـەرخان کردووە کە تایبەتە بە ژیاندنو پێ خوێندنی منداڵی بێ کەسو کار.

* (عەزیز نەسین) لە 7/6/ 1995 کۆچی دوایی کرد.

## • پێشەکی وەرگێڕ

پەیدا کردن‌و وەرگێڕانی ئەم کتێبە هەقایەتی خۆی هەیە. ساڵی 975، ئیشی ماموستایەتی خۆم گواستەوە بەغدا بۆ ئەوەی لەوێ لە پاڵ دەرزگوتنەوەدا خوێندنی زانکۆ تەواو بکەم بەڵام تەقدیر لەگەڵ تەگبیر نەهات‌و بۆ خوێندن وەرنەگیرام‌و دوای سێ ساڵ مانەوەم لەوێ بە نائومێدی‌و هەناسە ساردی گەڕامەوە. لەوێ لەگەڵ کۆمەڵێ برادەری خۆیی دوو ژوورمان لە خانوویەکی دووو نهۆمی نۆ ژووری لە حەیدەرخانە بە کرێ گرتبوو. یەکێ لە برادەرەکان کاک حەکیم کاکەوەیسی باوکی (یاد)ی (برادەر خۆم) بوو. لەوێ برا بچووکی کاک حەکیمم ناسی کە ناوی کاک حەمید بوو. جار جار دەهاتە سەردانی کاک حەکیم‌و بەو بۆنەیەوە بووین بە دۆست‌و ئاشنا. کاک حەمید ئەوساکە تەندروستی باش نەبوو. کاک حەمید حەزی لە کتێب‌و خوێندنەوە دەکرد بەڵام نازانم شتی دەنووسی یان نا؟

جارێکیان لە باسی نووسەران قسە هاتە سەر عەزیز نەسینی تورک. گوتی کتێبێکی ئەو نووسەرەم هەیە بە ناوی (چاخان). منیش بە زمانی سووتای داوام لێ کرد بۆم بێنی بیخوێنمەوە. بۆی هێنام‌و خوێندمەوە. کە بۆم بردەوە، مردم‌و سووتام وەری نەگرتەوە. گوتی بۆ خۆت بێ، بەڵام بەو مەرجەی وەری بگێڕی. گوتم بەخوا کاک حەمید ئەو بەڵێنەت پێ نادەم چونکە من خۆم زۆر حەز لەو نووسەرە ناکەم.

وەختەك بیستم کام حەمید لە (2005/11/3) عەمری خوای کردووە (گیانی بە بەهەشت شاد بێ). ئێستایش کە بە بیرم دێتەوە کزەم لە جەرگەوە دێ، هەم بۆ خۆی کە زوو ماڵاوایی لێ کردین‌و هەم بۆ ئەوەی چۆن بێ دڵیم کردو تا مابوو کتێبەکەم وەرنەگێڕا؟ پاشان هەر بۆ خاتری گیانی پاکی ئەو کردم بە کوردی‌و

ڕەشنووسەکەم هەلگرت. بەم دواییە بڕیارم دا پێیدا بچمەوەو چاپی بکەمو پێشکەشی بکەم بە گیانی پاکی کاک حەمید عەبدوڵڵا کاکەوەیس.

بەو دواییە زانیم کاک حەمید دەستی نیگارکێشانی هەبووەو هەندێ نیگاری لە پاش بە جێ ماوە. هەر بەو بۆنەوەیەش وامان پێ باش بوو هەندێ لە نیگارەکانی لەگەڵ هەڵسەنگاندنێکی مامۆستا جەلیلی مامەی وەکوو پاشکۆیەکی ڕۆمانەکە بڵاو بکەینەوە.

**عەزیز گەردی، بەحرکە**

## پێشەکی نووسەر

کۆمەڵ باشترین مامۆستایە کە دەرزی ژیانمان فێر دەکا. لەم دونیا تێکەڵو پێکەڵەیەدا کەسانی جۆراو جۆر زۆرن. هەر کەسە بیرێکی لە سەرو سەودایەکی لە دڵدایە... جا دەبێ هەر چاوێکمان بکەینە چوار چاوو ئاگاداری خۆمان بین..

قۆڵبڕەکان دەورگێڕی شانۆی پیسو کرێتی ئەم کۆمەڵەیەن کە لە وڵاتی ئێوە، لە شاری ئێوە، لە گەڕەکی ئێوەو بگرە لە ماڵی ئێوە خۆیان دانووساندووەوە داویان داناوەتەوەو خۆیان بۆ راو ئامادە کردووە...

ئەو قۆڵبڕانە، ئێمە خۆمان دروستیان دەکەین...ئەگەر ئێمە کارمان دروست بێ، ئەگەر پێویستمان بەوە نەبێ بە ڕێی ناڕەوا بچینە پێش، قۆڵبڕ پەیدا نابن بۆ ئەوەی ببن بە بەڵای سەری خۆمانو کۆمەڵەکەمان.

عەزیز نەسین

## (1)

### (سەگ لە بەر سێبەری دیوار وەردەکەوێ‌و بە خەیاڵ وا تێ دەگا پیاوێکی هونەرمەندە!!)

پۆستخانەی شارۆچکەکە لە کەلاوەیەکی گۆندایەو کەوتۆتە سەر شەقامی سەرەکی. ڕێچکۆڵەیەکی خۆڵی باریک لە پێش ئەو بینایەوە دەچێتە گۆڕەپانی شارۆچکەکە . ئەم ڕێچکۆڵەیە هاوین خۆڵەپۆکەو بەهار پڕ قوڕو زیلاقەو لە زستاندا تەپۆڵەیەکی گەورەی بەفر پێك دێنێ.

گۆڕەپانی شوورەبەندی بەر دەم پۆستخانە سەیرانگاو شوێنی ڕابواردنی گەنجانی شارۆچکەکەیە. عەسران دوو دوو و سێ سێ لەوێ پیاسە دەکەن‌و بە دەم قسە کردنەوە چاوەڕێی گەیشتنی پۆستە دەکەن. پاسی پۆستە هەموو ڕۆژێ سەعات چوار، بە شەقامی سەرەکیدا تێدەپەڕێ‌و چەند دەقیقەیەك لە بەردەم بینای پۆستەخانە دەوەستێ، شاگرد پۆستەچی وەکوو بزنە کێوی خێرا بە سەر ترومبێلەکە هەڵدەگەڕێ. کیسەکانی پۆستە فڕێ دەداتەخوارەوەو وەك برووسکە پەتەکان دووبارە توند دەبەستێتەوە بۆ ئەوەی زوو بکەوێتەوە ڕێ.

هاوین، ڕۆژێ، گەنجەکان وەکوو هەموو جارێ لە بەر دەم پۆستەخانە کۆ ببوونەوەوچاویان بڕیبووە ئاسۆی دوور. پێش ئەوەی پاسی پۆستە لە ڕێگا دەر بکەوێ، تۆزو گەردی لە ئاسۆ دەردەکەوت. لە پڕ چەند لادییەك بە خەنی خۆشی ئاسۆیان نیشانی یەکتر دا...

- ئەوە هات !

- هەر دەڵێی بەچکە شێرە، تۆزو گەردی پێش خۆی دەگا.

- ئەمڕۆ ڕۆژنامە دێ !

- بەڵێ، پێنج شەممەیە، دێ!!

ئەو تۆزو خۆڵەی وەکوو هەوری تاری لە ئاسۆوە بەرز ببووەوە، وردە وردە نزیك کەوتەوەو پاسی زەردی پۆستە دەرکەوت.

ڕۆژنامەفرۆشی شارۆچکەکە خۆی ئامادە کرد بۆ ئەوەی هەر ترومبێلەکە ڕاوەستا بەستەی ڕۆژنامەی لێ وەربگرێ.

ترومبێلەکە لە بەردەم بیناکە وەستا. شاگرد پۆستەچی وەك گوللە بە ترومبێلەکە هەگەڕا، چوو پەتەکانی کردەوە.

لەو نەفەرانەی دابەزین، سەرو سیمای نەفەرێك زۆر سەرنجی خەڵکەکەی ڕاکێشا. ڕەفتارو هەڵسو کەوتو شێوازی جل لەبەر کردنی بە هیچ جۆری بە خەڵکی ئەو ناوچەیە نەدەچوو.

جانتایەکی شینی پڕ کتێبو گۆڤاری پێ بوو لە سەر زەوی داینا...بە دەست، تۆزو خۆڵی لە جلەکانی تەکاند. بێ ئەوەی گوێ بە سەرنجی بە مەراقی لادێیەکان بدا، نەختێ تەماشای ئەم لاو ئەو لای کرد. کە دڵنیا بوو نیشانەکانی تەواوەو بە غەڵەت نەچووە، دەستی دایە جانتاکەیو بە هەنگاوی توندو پتەو، بە ڕێچکۆڵە خۆڵەکەدا، بەرەو گۆڕەپانی شارۆچکەکە کەوتە ڕێ.

نەگەیشتبووە گۆڕەپانی شارۆچکەکە، لە بەر دەم تابلۆیەکی کاڵبووەوە وەستا لێی نووسرا بوو: (ئوتێلی نوێی پالاس). نەختێ سەنگرایەوە، ئینجا چووە ژوورەوە.

ئەو ڕۆژە، بۆ بەیانی، ئەو ڕێبوارە نەناسیاوە نامەیەکی دوورو درێژی بۆ برادەرەکەی نووسی.

# (2)

## (ئەو شارۆچکەیەی خاکی مردووانیان بە سەردا کردووە)

برادەری ئازیز...

ئێستا (1342)کم لە تۆو لە دەریاوە دوورم‌و لە شوێنێ هەناسە هەڵدەکێشم (1286)م زیاتر لە سەر رووی دەریا بەرزترە.

دوای ئەوەی دوو رۆژو شەوێك بە شەمەندەفەر رێم بڕی‌و دانە رۆژێکیش سواری پاس بووم، گەیشتمە شوێنی کار کردنم کە ئەوەندە رۆژم دەژمارد داخۆ کەی دەیگەمێ.

راستییەکەی ژیان سەراپای تراویلکەیەکی گەورەیە. کە مرۆ لە دوورەوە تەماشای دەکا، وەکوو باخ‌و کانی‌و درەخت‌و سەوزایی دەکەوێتە بەر چاو، بەڵام کە دەگاتە جێگاکە دەبینێ جگە لە بەردو قوم‌وخاك‌و خاشاکی بیابان هیچی تر نییە...

هەر چەندە من پێشتریش دەمزانی شوێنی کاری نوێم شارۆچکەیەکی بچووکە‌و ئەوەی سینەماو شانۆو بگرە ئاوی بۆڕی‌و کارەباو تەندروستی‌و قوزلقورت‌و ژەهری مارە تێیدا نییە. من خۆم بۆ بەرەو رووبوونەوەی ئەو گیروگرفتانە ئامادە کردبوو، بەڵام دۆخەکە زۆر لەوە خراپترە کە من بیرم لێ کردبووەوە.

ژیان، لێرە بۆ مرۆڤێکی وەکوو من کە لە پایتەختی وڵات گەورە بوویم، هی ئەوە نییە بەرگەی بگیرێ، بەڵام کە دوای ئەو هەموو راکە راك‌و پارتی بازییە تازە دەستم لە کار گیر بووە، ناچارم بەرگەی هەزار لەمە خراپتریش بگرم!!!

حاڵەتی من وەکوو ئەو گەشتیارە ئەمریکییانە وایە کە دەیانەوێ بۆ دۆزینەوەو لێکۆڵینەوە بچنە ئەو جەنگەڵانەی تا ئێستا پێی بنیادەمیان پێ نەکەوتووە. ئەمانە چۆن شلەژاوو نارەحەتن؟ چۆن لە ترسی روو بە روو بوونەوەی جانەوەری کێوی‌و گای لێرەوارو شێری درندە وڕو گێژ دەبن؟ منیش ئەو حاڵەتەم هەیە. خۆم لێرە بە بێگانە دەزانم. دەڵێی چوومەتە وڵاتی مرۆڤی کێوی‌و دەمەوێ شوێنێك بدۆزمەوە ناوی لە نەخشەی جوگرافیاشدا نەهاتووە.

دوێنێ، کە گەیشتمە ئێرە، دوای نیوەڕۆی شەممە بوو. وەخت نەمابوو بچم خۆم بە دایەرە بناسێنم، ئەمڕۆ یەك شەممەیەو رۆژی پشووە، دەرفەتێکی باشم هەبوو بۆ ئەوەی بە وردی لەم مەسەلەیە بکۆڵمەوە (تێبینی: لە تورکیا وەکوو وڵاتانی ئەوروپا رۆژی یەك شەممە پشووە.) ئێستا ئەنجامی دۆزینەوەکانی خۆمت بۆ دەنووسم.

لە بەر رێگای دوور، شەکەت ببووم. هەر هێندە لە پاس دابەزیم، یەکەم ئارەزووم ئەوە بوو ئوتێلێکی شیاو بۆ حەسانەوە پەیدا بکەم. ئای لەو ئارەزووە بێ هوودەیە!! لێرە، پێویست ناکا مرۆڤ ئارەزووی (شتێ) لە مێشکی خۆی گەڵاڵە بکا، ئەوەندە بەسە بیر لە (شتێ) بکەیتەوە، یەکسەر لە بەر دەمت ئامادە دەبێ. سێ سەد چوار سەد هەنگاو رۆیشتم، چاوم بە دوو ئوتێل کەوت وەکوو دوو دار شمشاد بەرامبەر بە یەك ڤیت ببوونەوە.

ئەو دوو ئوتێلە هیچ شتیان بە ئوتێل نەدەچوو، تەنیا ناویان ئوتێل بوو. یەکێ ناوی (ئوتێلی نووکاری پالاس)و ئەوەی تر ناوی (ئوتێلی نوێی پالاس) بوو.

ئەم شارۆچکەیە کەوتۆتە سەر رێگای ترانزێتی ئێران‌و تورکیا. شەقامی سەرەکی وەکوو چەقۆ ئەم شارۆچکەیە لە ناوەڕاستەوە دەکاتە دوو لەت. بە هەموو دەمێ پاس‌و ئوتومۆبیلی دوا مۆدێل وەك گوللە بەم شەقامەدا تێدەپەڕن‌و تۆزو خۆڵ بەرز دەبێتەوە ئاسمان. دەرگاو پەنجەرەی بیناکان یەك تفرە توزو خۆڵیان لە سەر نیشتووە. سەرو چاوی خەڵکەکە ئەوەندە خۆڵاوی بووە، هەر کەس بۆ یەکەم

جار خەڵکی ئێرە ببینێ وا دەزانێ ئەمانە کەوتوونەتە ژێر دارو پەردووو تازە لە ژێر یەك دنیا خاكو خۆڵ راکێشراونەتە دەرەوە. هەر دەڵێی بیری خەڵکی ئەم ناوچەیەش کەوتۆتە ژێر تفرە خاكو خۆڵێکی ئەستوور. هەرچەندە ئەم شارۆچکەیە شوێنێکی باشی هەیەو کەوتۆتە سەر رێگای ترانزێت، خەڵکەکە یەك هەنگاویان بەرەو شارستانیو پێشکەوتن نەناوە. بە من بێ پەنجەم لە ناو ئەو خاکە ببەمە خواریو چەقی قورسایی ئەم گوندە بدۆزمەوەو رایبتەکێنم بۆ ئەوەی بەڵکو ئەو خۆڵەی لێ بتەکێو خەڵکەکە لەم خەوەی بێ ئاگایی بە خەبەر بێن...

لەو هەموو قازانجەی کە رێگای ترانزێت بە شار یان شارۆچکەیەکی دەگەیەنێ، خەڵکی ئێرە تەنیا فێری کێشانی جگەرەی ئەمریکی بووین. لە دوێنێ پاش نیوەڕۆوە تا ئێستا، لێرە، هەر کەسێکم دیبێ، دیومە جگەرەی ئەمریکی دەکێشێ. تەنانەت دوو سێ کەس جگەرەی ئەمریکییان پێشکەش کردم... شتی وا بە لای ئەوانەوە جۆرە گەورەییو خۆدەرخستنێکە...

بە تایبەتی گەنجەکان رۆحیان بۆ جگەرەی ئەمریکی دەردەچێ. کاسبکارانی ئەم شارۆچکەیە بە درێژایی رۆژ چاویان دەکەنە چوار چاوو چاوەدێریی جادە دەکەن. هەر هێندە ترومبێلی گەشتیارەکان بوەستێ، لە جیاتی ئەوەی شتی خۆیان بە فرۆشتن بە سەردا یسەپێننو پارە لە بێگانان دەربێنن، یەکسەر تاقیبی جگەرەی بیانی دەکەنو چی پارەیان هەیە بە جگەرەی دەدەن. هەرزانترین جگەرەی ئەمریکی نرخی چوار هێندەی جگەرەی خۆمانە. بەڵام کێشانی جگەرەی ئەمریکیو پێشکەش کردنی شتێکی ترە!!

تەنانەت کارمەندانی دەوڵەتیش هەوەسیان بە کێشانی جگەرەی ئەمریکی دێو دەستی ئاغای کۆنەپەرست ناگێڕنەوە. تازە من تێگەیشتووم کە ئەمریکا دۆستایەتی خۆی لەگەڵ خەڵکی دونیا بە جگەرە دەست پێ دەکا. تۆ وەرە بزانە من لە کوێوە دەستم بە نامەکە کردو ئاخیری قسە خەریکە بەرەو کوێ دەکشێ!! زۆر داوای

بووردن دەکەم. لە بیرم نەبوو من کارمەندێکی بچووکم‌و هەقم نییە دەست لە ئیشی ماقوول وەر بدەم. !!

بە روخسەتتان دەگەڕێمەوە سەر بابەتی سەرەکی. بەڵێ، کە دوو ئوتێلم لە سەر رێی خۆم بینی، لە بەر ئەوەی رووکاری دەرەوەی (ئوتێلی نوێی پالاس) باشتر دیار بوو چوومە ئەوێ...

ئەم ئوتێلە چوار ژوورە. یەکێ لە ژوورەکان شەش نەفەرییە، دوویان هەر یەکە چوار نەفەرییە‌و چوارەمیان دوو نەفەرییە...

خاوەنی ئوتێلەکە بە سەرو سیما وا لە من گەیشت کە پیاوێکی ماقوولم، بردمیە ژوورە دوو نەفەرییەکە کە لە هەموویان پاک‌و خاوێنتر بوو.

لە بەربۆن بۆگەنی دڵم تێك هەڵچوو. خۆم پێ لە ژوورەوە رانەگیراو هاتمە خوارەوە. خاوەن ئوتێل لە سالۆنی نهۆمی خوارەوە بوو. داوام لێ کرد چەرچەف‌و بەرگە بالیفەکان بگۆڕێ. خاوەن ئوتێل بە سەرسامییەوە گوتی: جەناب حەفتەی پێشوو گۆڕیومن... سێ نەفەر زیاتر لە سەری نەخەوتوون!!!

خوێنم هاتە جۆش. ئەو هەموو (کەرایەتییە) لە هیچ گۆشەیەکی دنیادا، تەنانەت لە ناو لێرەوارەکانی ئەمازۆن‌و لە ناو خەڵکە کیوییەکەی ئەوێش، نییە..خاوەن ئوتێل بە رەنگ‌و روومەوە لە مەسەلەکە گەیشت‌و بەر لەوەی من دەمم بکەمەوەو هەرچی جوێنی بە منداڵی فێری ببووم حەواڵەی دەیبابی بکەم، ئەو گوتی: زۆر باشە بۆ خاتری جەنابت ئێستا پێیان دەڵێم بیانگۆڕن.

لە ئوتێل هاتمە دەرەوە بۆ ئەوەی پیاسەیەك بە ناو شارۆچکەکەدا بکەم‌و نارەحەتیم دەر بکەم، چەند هەنگاوێك بەو لاوە تابلۆیەکی شەقبردووم بینی وشەی ریستورانی لە سەر نووسرا بوو. هەوەسی خواردنەوەی چەند پێکە خواردنەوەیەکی لە دڵ بزواندم‌و بێ دەستی خۆم چوومە ناو ریستورانەکە.

ئەمە ریستورانی نمرە یەکی شارۆچکەکە بوو بەڵام هەوای ناخۆش‌و ئەو شێیەی دەکەوتە بەر لووتی مرۆڤ، دڵ‌و هەناوی مرۆڤی تێك دەدا. ئەوەندە پێ لەقەیان لە

خۆڵی ناو عەردەکە دا بوو وەکوو چیمەنتۆی شیشەداری لێ هاتبوو. سێ جار کورسییەکەمم گۆڕی بۆ ئەوەی بەر نەبمەوە. نازانم ناو عەردی ژوورەکە قۆرتو کۆسپ بوو یان پایەکانی کورسییەکە بە قەد یەك بڵند نەبوون. راست رانەدەوەستا.

کە چاوم لە تاریکی را هات، تەماشای کەلو پەلەکانی ریستورانەکەم کرد. شەش مێزیان لە دەوران دەوری سالۆنەکە دانا بووو هەر مێزەو چوار کورسییان لە دەورە ریز کردبوو. تەنانەت دوو کورسییان یەك رەنگو یەك مۆدێل نەبوون. دەتگوت هەر یەکەیان لە سووچێکی دونیا هێناوەو موزەیەکیان نە مۆدێلی جۆراو جۆری کورسیو مێز دروست کردووە.

کورپێژگەیەك بە کۆنە پەڕۆیەك خەریکی سڕینەوەی مێزو کورسییەکان بوو.

چوومە لای مەنجەڵەکانی خواردن. هەموو مەنجەڵەکان سەریان والا بوو. سینییەکانیان بە ریز لە تەك یەك لە سەر سەکۆکە دانابوو. قوماشێکی تۆڕی رەشیان بە سەر دادابوون. هێدی دەستم برد بۆ ئەوەی خواردنەکان تاقی بکەمەوە، یەکسەر تۆڕەکان بەرز بوونەوە ئاسمان. تومەز ئەو تۆڕانە مێشو مەگەسی قەڵەو بوونو لەگەڵ جووڵانەوەی دەستی من هەڵفڕین. ئیتر کەوتمە ناو پەڵە هەورێکی رەشو تاریی مێشو مەگەس.

بە حەپەساوی لە ناوەندی ریستۆرانەکە وەستام. نەمزانی چ بکەم: دابنیشمو ئەو خواردنانە بخۆم، یان یەکەو راست بۆی دەربچم؟ لە بەر ئەوەی خاوەن ریستورانەکە زەق زەق چاوەدێری هەڵسو کەوتو جووڵانەوەکانی دەکردم، نەمتوانی بچمە دەرەوە، هەر چەندە وام پێشان دا گوایە خواردن دەخۆم بەڵام خواردنەکانم نەخوارد.

ئەو دۆلکە ئاوەی لە سەر مێزەکەم بوو، ئەوەندە لە مێژ بوو نەیانشووشت بوو، بە قەدەر یەك پەنجە خلتی لە بن بوو. لە کاتی ئاو خواردنەوەدا بە جۆرێ پەرداخەکەم بۆ دەمم راگرت کە لێوی خوارەوەم بە لێوی پەرداخەکە نەکەوێ. هەر دوو لێوم بردە ناو پەرداخەکەو بە زەحمەت نەختێ ئاوم خواردەوە.

بێ ویژدان خاوەن ریستوران! تۆڵەی هەموو کەم‌و کەسرییەکانی خۆی لە پسوولەی حیسابی من دەرهێنا. بۆ خواردنێکی ئاسایی‌و دوو سێ پیاڵە خواردنەوە بە قەدەر مەسرەفی یەك حەفتە پارەی لێ وەرگرتم. نازانم ئاخۆ لەگەڵ هەموو کەس بەو جۆرە حیساب دەکا، یان بە گەشتیاری بیانی لە من گەیشتبوو؟

بە هەر حاڵ بە گیرفانی بەتاڵ لە ریستورانەکە هاتمە دەرەوە. کابرایەکی ئەسمەر لە تەك ترومبێلێکی دوا مۆدێل وەستا بوو، دەیەویست شتێ بە پۆلیس بڵێ. کەس لە زمانی نەدەگەیشت بەڵام لە جوولاندنی دەستییەوە دیار بوو سکاڵای لە شتێ هەبوو. دە، پازدە ژن‌و پیاوو منداڵ لە دەوری کۆ ببوونەوە گاڵتەیان پێ دەکردو لاسایان دەکردەوە.

منیش بێ دەستی خۆم چوومە لایانەوە بۆ ئەوەی بزانم مەسەلە چییە..

کابرای ئەسمەر تەمەنی دەوری چل‌و پێنج، چل‌و شەش ساڵ دەبوو. کە چاوی بە من کەوت‌و لە دیمەنمەوە زانی جیاوازیم لەگەڵ ئەوانی تر هەیە، بە زمانی ئینگلیزی پرسی: ئایا ئینگلیزی دەزانی؟ من ئینگلیزی نازانم. ئەڵمانیم خوێندووە بەڵام ئەم چەند وشە ئینلیزییەم دەزانی. بە ئەڵمانی وەڵامم دایەوە: نا... ئینگلیزی باش نازانم بەڵام ئەڵمانی دەزانم. ئەم جارە کابرا بە ئەڵمانی دەستی بە قسە کرد: ئەمە چ وەزعێکە!؟ منداڵ شووشەی ماشینەکەمیان بە بەرد شکاندووە!!

سەیرم کرد دیتم راست دەکا. مرۆڤ دڵی دەبوو بە کەباب، ماشینەکە وەکوو بووك وا بوو دەتگوت تازە لە ناو کاغەز دەرهاتووە بەڵام شووشەی لای لێخۆڕی شکا بوو. کە قسەی کابرام بۆ پۆلیس‌و ئەوانی تر وەرگێڕا، هەموو لە قاقای پێکەنینیان دا. پۆلیسەکە لە هەموویان خراپتر بوو، هەر هیچ خۆی لە گوورە نەبرد. شانی هەڵتەکاندو بە قەشمەری گوتی:

- برۆ بابە، برۆ. دەڵێی تازە ماشینت دیوە؟ منداڵ چییان لەگەڵ دەکرێ؟

کابرای گەشتیاری بیانی چاوەڕێی وەڵامی منو هەڵوێستی پۆلیسی دەکرد. بە چاوێکی زەق لە دەمو چاوم نز ببووەوە. نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە. یەکێ لە ناو حەشیمەتەکە گوتی:

- هەموو جارێ شتی وا روو دەدا. ئەمە شتێکی تازە نییە.

سەیرم کرد دیتم خاوەن ئوتێلەکەی منە. پرسیم مەسەلە چییە؟ بە دوورو دێژی بۆی باس کردم:

- هەر کاتێ ترومبێلێکی بیانی بەم جادەیەی ترانزێتدا تێدەپەڕێ، منداڵی لادێیی لە دەم رێگا خۆیان لە ناو تەبارە گەنمو لە پەنا دیواران دەشارنەوەو بەردیان تێ دەگرن...ترومبێل نییە بە سەلامەتی لەم رێگایە دەربچێ. هەندێ جار رێبوارەکان دەمو چاویشیان دەشکێ.

لە پۆلیسەکەم پرسی:

- ئێستا چارەی ئەم جەنابە چیە؟

- چوزانم! لە کوێ بیدۆزمەوە. من چوزانم داخۆ چ حەرامزادەیەك بووە وای کردووە؟

خەڵکەکە لە قاقای پێکەنینیان دا... گەنجێکیان هاواری کرد:

- هەڤیانە.!

کابرای گەشتیاری بیانی، کە زانی تاخیربوون سوودی نییەو هیچی بۆ ناکەن، سواری ترومبێلەکەی بوو رۆیشت. منیش لەگەڵ خاوەن ئوتێلەکە رۆیشتم. لە رێگادا لێم پرسی:

- بۆچی منداڵ ئیشی وا دەکەنو گەورەکان لێیان ناخوڕنەوە.

- بە خوا خەڵکی ئێرە دڵیان زۆر لە رێبواری ئەروپیو بە تایبەتی لە ئیرانیان پڕە. ئۆباڵ وەستۆی ئەوانەی باس دەکەن دەڵێن ئیرانی هەموو رۆژێ، دەستە دەستە بە شتی بە کێش سووكو بە نرخ گران، دەچنە ئەوروپاو کە دەگەڕێنەوە کچێکی قژ زەردو ماشینێکی دوا مۆدێل لەگەڵ خۆیان دێنن. رۆژێ، بە لایەنی کەمەوە

بیست سی ماشین بەم ڕێگایەدا دەچێتە ئیران‌و لە بەر ئەوەی خەڵکی ئێرە، جگە لە زەحمەت‌و تۆزو خۆڵ، هیچی تریان پێ نابڕێ، بۆیە گەورەو بچووکی وڵاتەکەمان چاویان بەرایی نادا هەر تەماشایشیان بکەن. ئیتر بە بەرد هاویشتن‌و شووشە شکاندن‌و عەدم کردنی ناوەوەی ترومبێلەکان بە لایەنی کەمەوە ئازاری ڕۆحی‌و ئاگری ڤین‌و ئێرەییان دادەمرکێتەوە.

ماوەیەك لەگەڵ خاوەن ئوتێلەکە بە قسە کردن، پیاسەمان کرد. لە قسەکانی ئەو جەنابەوە زۆر زانیاریم لە بارەی ئەم شارۆچکەیەوە پەیدا کرد.

ئێرە بە گشتی 1980 کەسی تێدایە. ژمارەی دانیشتوانی دیهاتەکانی دەورو بەری دەگاتە سێ هەزار(3000) کەس. لە رووی جوگرافییەوە، ئەم شارۆچکەیە کەوتۆتە ناوەڕاستی دەشتێکی تەخت‌و فراوان، تا چاو بڕ دەکا باخی میوەو زەوی کشت‌و کاڵییە. لە لای باکووری ڕۆژاوای شارۆچکەکەدا، چەمێك بە ناو قامیشەڵانێکدا تێدەپەڕێ. ئەو چەمە هاوینان وشك دەبێ‌و زەلکاوێکی بۆگەنی لە شوێن بە جێ دەمێنێ، دەبێ بە شوێنی کۆبوونەوەی مێش‌و مەگەس‌و مەلە کردنی گامێش...لە لای باشووری ڕۆژهەڵاتیشەوە، قسنی پیاوچاکێك سەرنج ڕادەکێشێ. لە سەر تا سەری وڵاتدا، لە هەر شوێنێ شارو شارۆچکەو گوندێك هەبێ، بە گوێرەی گەورەو بچووکی شوێنەکە چەند قسنی پیاوچاك هەن.

دوای ئەو پیاسە کورتەیە، بە تەواوی رام لە باری ئەم گوندەوە گۆڕا.خەریکە وردە وردە هۆگری ئێرە دەبم. حەیف دڵم ئەشقی تێدا نییە... ئەگەر ماشووقەیەکم هەبوایەو دڵی بە جەورو جەفا بریندار کردبام، ئەم خاکەم بە لاوە شاعیرانەتر دەبوو.

گەڕامەوە ئوتێل بۆ ئەوەی ئەم نامەیەت بۆ بنووسم. بەڵام هەر هێندە چوومەوە ژوورێ، هەناسەم تەنگ بوو. نازانم نەفتی ڕەشیان لە ژوورەکەم دا بوو بۆ ئەوەی پاکی بکەنەوە، یان (دی دی تی)یان لێ ڕشاند بوو. بە کورتی هەرچی بووبێ بۆنێکی ئەوەندە تیژی لێ دەهات هەر مەپرسە!!! سەیرم کرد ئەگەر خۆم

لە ژوورەوە دەرباز نەکەم، دەخنکێم... پەنجەرەکانی ژوورەوەم کردەوە بۆ ئەوەی هەوای ژوورەوە بگۆڕێو چوومە خوارەوە. خاوەنی ئوتێلەکە گوتی:

- قوربان، پێم گوتن (دی دی تی)یان لە ژوورەکەی تۆ دا. ئیتر نە سۆنیو چەنگەی دەبیو نە کێچ. ئەمشەو بە کەمالی ئیسراحەت بخەوە. ماندووت دەحەسێتەوە...

ویستم لە سالۆنەکە دابنیشمو نامە بۆ تۆ بنووسم.بەڵام رووناکی گلۆپەکە ئەوەندە کز بوو، نەمتوانی. لە خاوەن ئوتێلم پرسی:

- ئەوە گلۆپەکانتان هەمیشە ئاوها بێ شەوقن؟

- نەخێر... دوای سەعات دەی شەو، کارەبا ئەوەندە بە هێز دەبێ، گلۆپەکانمان شەوق لە تیشکی خۆر دەبڕن!! کە دوکان دادەخرێنوخەڵك دەخەوێ ، ئەوسا وەرە تەماشای گلۆپەکان بکە! تا نیوە شەو، هەموو کووچەو بازاڕ وەکوو رۆژ رووناکە، نیوە شەو، گلۆپەکان سێ جار دەکوژێنەوەو پێ دەبنەوە. ئەمە نیشانەی کوژانەوەی کارەبایە. دوای ئەوە هەر کەسێ نەخەوێ، دەبێ چرای نەفتی داگیرسێنی. دووبارە لە ئوتێل هاتمە دەرەوە، باوەڕکە تریفەی مانگ لە گلۆپی کارەبا بەهێزتر بوو. جا حیسابی خۆت بکە، بزانە خەڵکی ئەو ناوچانە ژیانێکی چەند بە دەردەسەرییان هەیە! هەر دەڵێی ئەم شارۆچکەیە لە پشت کێوی قافە، ئەو هەموو شارستانێتیو پێشکەوتنە هیچ کارێکی لێ نەکردووە.

هەر بە خەیاڵتدا نایە ئەو خەڵکە چەند داماوو هەژارو نەدارن! لێرە یەك شت لە هەموو شتێ زیاتر رەواجی هەیە. ئەویش قسەکردنە لە بارەی جەنابی ((زەبووك زادە))... هەموو خەڵکەکە بە ژنو پیاوو بە گەورەو بچووکەوە، کە دەگەنە یەك، دوای سەلامو چاكو چۆنی، دەست بە باسی کردەوەکانی ((زەبووك زادە)) دەکەن:

(زەبووك زادە) وا بوو. (زەبووك زادە) وا چوو!

باوەڕ بکە، هەر لەو ساتەوە کە سواری شەمەندەفەر بووم‌و بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە ناو باس بووم، هەمیشە ناوی جەنابی (زەبووك زادە)م دەکەوتە بەر گوێ. ناوی (زەبووك زادە) ویردی سەر زاری هەموو خەڵکی ئەو ناوچەیەیە. شتی وا لە بارەی بەدفەڕیی‌و قۆڵبڕی‌و ئاین‌و ئۆینی ئەو پیاوە باس دەکەن، مرۆڤ ئەومندە دەهری دەبێ، شاخی لێ دەڕوێ. بە لای منەوە، ئەم قسانە زیاتر لە ئەفسانە دەکەن. ئەگەر راست بێ، بە راستی بینینی ئەو پیاوە شتێکی پێویستە. ئارەزوویەکی گەرم‌و گوڕم نە دڵدا پەیدا بووە بۆ بینینی ئەو پیاوە... حەیف کە لێرە نییە!! دەڵێن چۆتە ئەنقەرەو پاش چەند حەفتەیەکی دی دێتەوە...

هەوڵ دەدەم سەربردەی ئەو کابرایە لە زمانی خەڵکەوە ببیسم بۆ ئەوەی کاتێ بەرەو رووی بوومەوە، هەموو شتێکی لە بارەوە بزانم. گوایە ئەم شارۆچکەیە بە بێ (زەبووك زادە) هیچ کەڵکی پێوە نییە. ئەگەر یەك رۆژ ناوی (زەبووك زادە) لەو شارۆچکەیە نەمێنێ ماڵ‌و دوکانەکان کپ‌و کڕو بێ هەست‌و خوست دەبن.

بە رای خەڵکەکە، ئەو (زەبووك زادە)یە لەگەڵ هەموو پەست‌و نزمی‌و چرووکیشی، وەکوو چاوو رۆحی خەڵکی شارۆچکەکە وایەو هەموو کەم‌و کورتییەکان شارۆچکەکە پڕ دەکاتەوە.

ئایا تۆیش بە لاتەوە سەیر نییە، بێ شك تۆیش رات لەگەڵ مندایە. جا چاوەڕێی نامەی دادێم بکە. هەر هێندە زانیاری تری لە بارەوە وەربگرم لای خۆم دەینووسمەوەو بۆت رەوانە دەکەم.

ئێستا بەرە بەری نیوەشەوە، بینا بە قسەی خاوەن ئوتێل، پاش پێنج دەقیقەی تر گڵۆپەکان دەکوژێنەوە، جا دەبێ ئەم نامەیەی تۆ تەواو بکەم‌و خۆم بۆ نووستن ئامادە بکەم. ئەویش لە ناو چ جۆرە نوینێك!! خۆزگە چەرچەف‌و بەرگە بالیفەکانیان نەگۆڕیبایە. ئەمانە لەوانەی پێشوویش پیس‌و بەچڵکترن!

ئێستا دەزانم بۆچی خەڵك دەڵێن خۆڵی مردووانیان بە سەر ئەم شارۆچکەیە داکردووە. خەڵکی ئێرە، لە خاوەن ریستورانەکەوە بگرە تا خاوەن ئوتێلەکەو هەر

کەسێ کە دیبم مروڤی بزۆزن. گۆڕستان چۆن کش‌و ماتە ئەو شارۆچکەیەش ئاوها بێ دەنگە دەنگە.

خودا ئاخیرم بە خێر بگێڕێ لەو شارۆچکەیە. هەست دەکەم چارەنووسێکی سەیرم پەیدا کردووە. دیمەنی زۆر جوان‌و قسەی زۆر خۆشم لە بەر دەمدایە!!

ئەها!! لە پڕ گلۆپ کوژایەوە. راستی، ئەمە نیشانەی کوژانەوەیە. دەبێ زوو نامەکە تەواو بکەم. خودا حافیز. دوور بە دووری، رووی وەك مانگت ماچ دەکەم‌و داوای سەرکەوتنت لە خوا دەخوازم.

# (3)

## (رۆژ باش جەنابی فەرماندار...)

برادەری ئازیز...

نامەکەت گەیشت. زۆر شادمان بووم کە تۆیش هەوەست بە ژیانی (زەمبووك زادە) دێ. ئەمە وا دەکا بە شێوەیەکی گەرم‌و گوڕتر ئەو یادداشتانە کۆ بکەیتەوەو رێکیان بخەی.

تۆ نازانی چەند خۆشە گوێ بدەیتە باسی کارەکانی ئەو پیاوە!! باوەڕ ناکەم تا ئێستا دایکی زەمانە (قۆلبڕ)ێکی وای هێنابێتە دونیا.

دوای ئەوەی خۆمم بە دایەرە ناساندو کارەکەمم وەرگرت، دەستم بە لێکۆڵینەوەی بارو دۆخی ژیانی (زەمبووك زادە) کرد..

نەمدەزانی لە کوێوە دەست پێ بکەم... پێش چەند رۆژێ، کە هەروا خەریك بووم بە کووچەو کۆڵانەکاندا پیاسەم دەکرد، رێم کەوتە قاوەخانەیەك..

لێرە، یەکێ لەو شتانەی زۆر بە هەرمێنە قاوەخانەیە..خەڵکی بێکارە، کە هیچ رابواردن‌و خۆ خەریك کردنیان نییە، هەر هێندە دەستیان لە ئیش بەر ببێ، خۆیان بۆ قاوەخانە هەڵدەکوتن‌و دوای خواردنەوەی چاو کێشانی قەلوون، تەختە نەردو دەستە کاغەز دێتە ناوەوە.

ئاخر بە لای ئەوانەوە چوونە سینەماو تەماشا کردنی تیاترۆو مەی نۆشین حەرامە، بەڵام تیواز (قومار) قەیدی نییە.

چەند چرکەساتێك لە پشت جامخانەی قاوەخانەکە راوەستام. چەند کەسێك لە سەر سەکۆی ئەم لای قاوەخانەکە سەرقاڵی یاری کاغەز بوون، ئەوەندە بە رقو تووڕەیی کارتیان لە عەرد دەکوتا، دەتگوت زللە لە بناگوێی خاینانی نیشتمان دەدەن.

هێدی چوومە ناو چایخانەکەو لە تەنیشت ئەوانەوە دانیشتم. دوای ئەوەی ماوەیەك یارییان کردو پارەکەیان بنی هات، براوەکان داوای چاو قەلوونیان کردو دۆڕاوەکان بازووی غەمیان خستە بن هەنگڵیانەوە.

وەکوو هەمیشە کە بابەتی هەموو قسەیەك دەچێتەوە سەر (زەبووك زادە)، ئەمجارەیش قسە، گڕ گڕ، هاتەوە سەر ئەو. (بیلالە رەش)ی کوڕی (مەلا بەدری ئاقڵمەند)، کە پارەیەکی زۆری لە تیواز بردبووەوەو شادو شەنگوڵو کەیفساز بوو، بەم جۆرە دەستی بە قسە کرد:

- ماڵی (زەبووك زادە) لە تەنیشت ماڵی ( (هەمزە جووت بەدزادە))یە . ئەو کاتە هەمزە سەرۆك شارەوانی بووو بەینی لەگەڵ (زەبووك زادە) زۆر خۆش نەبوو. هەردووکیان ئەندامی یەك پارت بوون، بەڵام ئیشتان بە سەر پارتایەتییانەوە نەبێ. هەردووکیان بە چاوی دوژمنی خوێن تەماشای یەکتریان دەکرد، زەبووك دەیەویست ببێ بە سەرۆك شارەوانیو هەمزەیش نەیدەویست دەست لە سەرۆکایەتی شارەوانی هەڵگرێ. ئەم هۆیە، بە چاو بچووکە، کارێکی وای کردبوو کە هەردووکیان چاکی یەکتر کوشتنیان کردبوو بە لادا.

سبەینەیەك کوڕەکەی جەنابی (هەمزە) هاتە ماڵمان گوتی:

- یاللا هاوڕێ، هەستە بچین تەماشای دیمەنێکی زۆر جوان بکەین.

- بەو سبەینەی سالحان چ شتێکی جوان هەیە؟

- تۆم بمرێ لە سینەماو تیاترۆو کافە جوانترە! تۆ نازانی دیمەنێکی چەند جوانە.!.

مـن یەکسـەر لـە جێـی خـۆم هەسـتام. جلـم کـردە بـەرو کەوتمـە شـوێنییەوە...
چووینە ماڵی ئەوان. منی بردە ناو خەڵووزدانو گوتی:

- لەم کونەوە تەماشا کە بزانە چ دەبینی؟

کونێکی بە قەدەر یەك چاوی بنیادەمیان لـە ناوەڕاسـتی خشـتەکان کردبـووەوە. مدبەقی ماڵی (زەبووك زادە) زۆر بە باشی لەو کونەوە دیار بوو.

ژنی جەنابی (زەبووك زادە)و دایكو خوشکی بە تەنگاوی خێرا خێـرا سـەرقاڵی کار بوونو بەردەوام دەچوونە ئەم لاو ئەولا. رقم هەسـتاو خـۆم لـە کوڕەکـە تـووڕە کرد:

- بـۆ ئـەم کـارە بانگـت کـردم بـۆ ئێـرە؟ خـەجاڵەت ناکـەی تەماشـای ژنـی خـەڵك دەکەی؟!

پێکەنی:

- هاوڕێ، سەبر بگرە. مەسەلە تەماشا کردنی ژنی خـەڵك نییـە. چاوت لـەوێ لا مەبە، زۆر شت دەبینی.

کوڕەکە هێشتا قسـەکەی بـە تـەواوی لـە دەم نـەهاتبووە دەرێ، دەنگـی (زەبـووك زادە) هات. لە نهۆمی سەرەوە هاواری دەکرد:

- حورمێ، حورمێ، لەگەڵ تۆمە حورمێ! سـوێندم بـە خـودا بـە گـەزی بـە دارت هەڵدەواسم.. ئەوە حەفتەیەکە پێت ناڵێم پارێزگـار دەبێتـە میوانمـان. ئێسـتا چـار چییە؟!

کوا هیربار،؟ بۆچی کەباب حازر نییە؟ کوا بەرخبرژ؟

(زەبووك زادە) بە هاتو هاوار لە پلیکانە هاتە خوارەوە. وازی لە ژنەکەی هێناو بەرۆکی خوشکەکەی گرت.:

- کچـی، تـۆ بـۆ وڕو گێـژ بووی؟بۆچـی وەکـوو پەیکـەر وەسـتاوی؟ زوو بـڕۆ ژوورەکان گەسك بـدە! کورسـییەکان بسڕەوە. دۆشـەكو لێفـەکان ڕێـك بخـە، ئێسـتا پارێزگار دێ.

ئاخیری کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێناو پێشانی خوشکی دا:

- ها... تەماشای ئەم کاغەزە بکە.

کچەکە، بێ ئەوەی تەماشا بکا، وەڵامی دایەوە:

- تەماشام کرد.

کوڕەکەی جەنابی (هەمزە) دەمی هێنایە بن گوێم‌و بە دزی گوتی:

- یەك حەفتەیە هەموو ڕۆژێ بەیانی ئەم نامەیە نیشانی کچەکە دەداو دەڵێ: ها... تەماشا کە!

(زەبووك زادە) هەروا کە نامەکەی بە دەستەوە بووو دەستی بۆ لای خوشکی ڕاداشتبوو، هاواری کرد:

- پێت دەڵێم ئەمە بخوێنەوە. خوێندەواریشت لە بیر نەچووبێتەوەو ئەم هەموو پارەیەمان لێ سەرف کردی بە هەدەر چووبێ. بخوێنەوە، بزانە نامەکە هی کێیە؟ بزانە پارێزگار چ ڕێزێکی بۆ برات دەربڕیوە؟

کچەکە نامەکەی وەرگرت‌و ویستی بیخوێنێتەوە.. بەڵام هەرچی کردی بێ فایدە بوو. دەنگی وەکوو (ت.. گ..م.ء)ی لە دەم دەهاتە دەرەوە.

(زەبووك زادە) زۆر تووڕە بوو. هاواری لە سەر کرد:

- بۆچی ئاوزینگان دەدەی؟ وەکوو بنیادەمان بخوێنەوە...

- نازانم.. (ت..گ..م ء)ە ؟ یان (تێ.. گاف.. میم)ە.

- کفتەو ژەهری مارە، جاشەکەر. ئەوەی دەیبینی پیتی یەکەمی ناوی حکوومەتە. (ت) یانی تورکیا، (گ) یانی گەورە، (م) یانی میللەت، (ء ) یانی ئەنجوومەن. ئەگەر هەمووی بە سەر یەکەوە بخوێنیتەوە (ت..گ..م ء) مەبەستی (ئەنجوومەنی گەورەی میللەتی تورکیا)یە. چما ئەمەیان لە قوتابخانە فێر نەکردوون؟

کچە بە ترس‌و لەرز وەڵامی دایەوە:

- نەخێر..

(زەبووك زادە) زیاتر توورە بوو.

- گەوجە، من خۆم چەند جار پێم گوتی؟ باشە ئێستا پێم بڵێ بزانم كێ ئەم نامەیەی بۆ برات ناردووە؟

- پارێزگار...

- هەر بژی! باشە پێم بڵێ بزانم نیشانەی ناوی كورتكراوەی حكوومەت چییە؟

كچە دیسان نەیتوانی مانای پیتە كورتكراوەكان لێك بداتەوە. (زەبووك زادە) وەكو گورگی پێكراو دەستی بە نوورە لوور كرد.

- دەك خوا زەلیلت كا كچ! خودایە، من لە دەست ئەو ژنە بێ عەقڵانە خاكی كوێ بكەم بە سەر خۆما؟ ئەمانە یاری بە چارەنووسی من دەكەن. بەیانی كە من بووم بە نوێنەری ئەنجوومەن، تەگبیرم لەگەڵ ئێوە چییە؟ چۆن دەتوانم بتانبەمە ئەنقەرەو نیشانی خەڵكتان بدەم.

ئەم جارە (زەبووك زادە) رووی كردە دایكی:

- نەنە، تۆ تا ئێستا قەت پارێزگارت دیوە؟

- نەخێر... نەنە گیان. من چ ئیشم بە پارێزگار هەیە؟ ئینشاللا لەمەودوا لە سایەی تۆوە دەیبینم.

(زەبووك زادە)، بە شێوازی كوڕی پیاوێكی گەورە، نامەكەی لە گیرفانی ناو گوتی:

- تۆ ئەوە هیچ!.. تا ئێستا، هیچ كەس لەم شارۆچكەیەدا پارێزگاری نەدیوە، بەڵام لە سای سەری كوڕی خۆت، هەموو هەژارو داماوەكانی ئەم شارۆچكەیە پارێزگار دەبینن...

پاشان بە دەم چوونە لای دەرگای حەوشەوە هاواری كرد:

- قاوەیەكی گەرمم بۆ بێنن...

لە سەرەخۆ بە كوڕی جەنابی (هەمزە)م گوت:

- ئەم كابرا (زەبووك زادە)یە دەیەوێ بە بێجامە بچێتە كۆڵانێ؟

کوڕی جەنابی (هەمزە) پێکەنی:

- وس ! بێدەنگ بە ! بەشە خۆشەکەی دوای ئەمە دێ.

هێدی، لە سەر پەنجەی پێ لە ناو خەڵووزدان هاتینە دەرەوە. چووینە کۆڵانێ، خۆمان لە تەك دوکانی ئەمینی بزرگان شاردەوە بۆ ئەوەی باشتر تەماشای ڕووداوەکە بکەین.

(زەبووك زادە) دوو کورسی لە بەر دەرگای ماڵەوە دانا بوو. بێجامەی لە بەرو سۆنی لە پێدا بوو. لە سەر کورسییەك دانیشتبووو پێی لە سەر کورسییەکەی دی درێژ کرد بوو...

وەکوو ئەوانەی لە داوەتی ڕەسمیدا خواردن دەخۆن، فنجانە قاوەکەی خواردەوە. ئینجا جگەرەیەکی داگیرساندو دەستی بە یاری کرد بە تەسبیحە قل گەورەکەی. دەنگی تەقە تەقی تەسبیحی (زەبووك زادە) دەگەیشتە ئەو سەری شارۆچکەکە! بە کوڕی جەنابی (هەمزە)م گوت:

- کاکە، واز لەم شێتە قۆڵێرە بێنە. وەرە بچینە قاوەخانە دابنیشین یاری کاغەز بکەین.

- سەبر بگرە، هاوڕێ، نەختێ حەوسەڵەت هەبێ. مەجوولێوە. دیمەنی ڕاستەقینە دوای ئەمە دێ. من دەچم بانگی هاوڕێکان دەکەم لە قاوەخانە...

کوڕی جەنابی (هەمزە)، بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی من بکا، بە هێواشی ڕۆیشت. ئەوەندەی پێ نەچوو لەگەڵ چەند گەنجێکی ئاوایی هاتەوە. هەموو خۆمان لە سیلەی دوکانەکە شاردەوەو چاوەڕێی ڕووداوی ترمان کرد. (زەبووك زادە) پشتی لە ئێمە بوو، ئاگای لێ نەبوو.

لە کوڕی جەنابی (هەمزە)م پرسی:

- ئاخیری چ دەبێ؟

- نەختێ سەبر بگرە... خۆت دەبینی...

لەو ماوەیەدا (زەبووك زادە) لە جێی خۆی هەستا. ئیكلامی كێشاو بە دەنگی بەرز گوتی:

- وەعەلەیكەسسەلام جەنابی فەرماندار.

هەموومان لە سەرسامییان دەممان بەش بووەوە. ئەمە چ ئیشێكە؟! ئەم كابرایە بۆچی (دەور) دەگێڕێ؟ ئەوە سەلام لە كێ وەردەگرێتەوە؟ خۆ كەس لێرە نییە. كوڕی جەنابی (هەمزە) بە پەنجە ئاماژەی كرد بێدەنگ بین.

- وس... بێدەنگ..! با بەماشبینی.. دیمەنە سەرەكییە ئێستایە.

(زەبووك زادە) دووبارە ئیكلامی كێشاو بە دەنگێكی بەرزتر گوتی:

- وەعەلەیكەسسەلام، جەنابی سەرۆكی شارەوانی. چ حالە؟

هەمووومان تەماشای كوڕی جەنابی (هەمزە)مان كرد:

- خەریكە چاكو چۆنی لەگەڵ باوكت دەكا...

كوڕی جەنابی هەمزە پێكەنی:

- دەبینن؟ باوكم هێشتا لە ناو نوێندایە... ئەم كابرایە چاكو چۆنی لەگەڵ دەكا...

(زەبووك زادە) بێ ئەوەی گوێ بە ئیمە بدا كە تەماشای رەفتارو جوولانەوەمان دەكرد، یەك لە سەر یەك ئیكلامی دەكێشا:

- سەلام جەنابی سەرۆكی نووسینگە... بە چاوان... قوربان...هەر كاتێ دەرفەت ببێ پێ سەر بەرز دەبم. بە خێر هاتی... بە سەلامەتی.

هەر وەخت بوو لە پێكەنینیان بچرێین. كابرا بە رۆژی روناك سەختەچیاتی دەكرد. زۆر بە شێوەیەكی ئاسایی لەگەل سەرۆكە خەیاڵییەكان قسەی دەكرد.

- خەیاڵت ئاسوودە بێ، جەنابی فەرماندار... من ئەم ئیشە بە پارێزگار پێك دێنم!! من هەرچی بڵێم جێ بە جێ دەبێ. لە لای سەرەك وەزیرانیشەوە خەیاڵتان ئاسوودە بێ. من بۆ ئەنقەرەم نووسیوە.

کوڕەکەی جەنابی (هەمزە) لاسای (زەبووك زادە)ی کردەوەو بە هەمان شێوەی ئەو، دەستی بە قسە کرد. هەمان رستەی (زەبووك زادە)ی دووبارە کردەوە:

- چاوەڕێ دەکەم وەڵام لە ئەنقەرە بێتەوە.

لە کوڕەکەی جەنای (هەمزە)م پرسی:

- باشە تۆ ئەم قسانە لە کوێ فێر بووی؟

- ئەوەندەم ئەو قسانە بیستووە، هەمووم لەبەر کردووە.

(زەبووك زادە)، ئینجا لەگەڵ سەرۆکەکانی دی دەستی بە سەلامو چاكو چۆنی کرد. دیار بوو دەیەویست بەوای ئەو دەورو بەرە، کە گوێیان لە دەنگی بوو، وا پێشان بدا سەرۆکەکان هەموو بەیانییەك دێنە بەر دەرگای ماڵیو کرنۆشی بۆ دەبەن.

بێ گومان زیاتر مەبەستی ژنو خوشکی بوو. پەردەی ئەستووری بەو پەنجەرانە دادابوو کە کەوتبوونە سەر جادە. هەرگیز لێ نەدەگەڕا ژنو خوشکی تەماشای کۆڵانێ بکەن.

ئەو کابرایە تەنانەت درۆی لەگەڵ خانەوادەی خۆیشی دەکرد. دەیەویست بەم رەفتارو جووڵانەوەیە خوشكو ژنی تەفرە بدا.

بیلال چرکەساتێك بێ دەنگ بوو. پیاڵە چاکەی خواردەوەو گوتی:

- چار چییە؟ تا ئێستا هیچ کەس مرۆڤی ئەوەندە فێڵبازو قۆڵبڕی نەدیوەو هیچی لەگەڵ ناکرێ. ئەگەر بتەوێ تووڕی هەڵدەی، ناکرێ تووڕی هەڵدەی.. ئەگەر بتەوێ بیفرۆشی، ناکرێ بیفرۆشی... هیچ چارەمان نییە، بمانەوێو نەمانەوێ، دەبێ بەرگەی بگرین.

# (4)

## (سەرۆك وەزیران داوەتی كردووە...)

لە قاوەخانەكە هاتمە دەرەوە. لەگەڵ هاوكارەكانم ڕێك كەوتبووین ئێواری سەرێك لە یانەی مامۆستایان بدەین. لەم شارۆچكەیەش وەكوو هەموو شارۆچكەكانی دی، (یانەی شار)و (یانەی راوچییان)و (یانەی هونەرمەندان)و هەزارەها شوێنی رابواردنو كات بە سەر بردن نییە. مامۆستاكان كۆبوونەتەوەو ژوورێكی قوڕیان بە كرێ گرتووەو ناویان ناوە (یانەی مامۆستایان). باشە لە دێر زەمانەوە گوتوویانە: (كەچە پێڵاوی كۆن لە بیابان نیعمەتە.) ئەوانەیەش هەرچی هەبێ با ببێ، بەڵام دەكرێ یەك دوو سەعات وەختی لێ ببەیتە سەر.

كاتێ كە چوومە ژوورەوە، چەند مامۆستایەك خەریكی قسەو گفتو گۆ بوونو وەكوو هەموو جارێك بابەتی باسەكەیان (زەبووك زادە) بوو!!

جەنابی میرزا (رەزا) دەیگوت:

- ئەگەر دەریا مەرەكەبو جەنگەل قەڵەم بێ و سەربردەی ئەو بێناموسە بنووسی هێشا بەش ناكا.

(مەلا بەدری ئاقڵمەند)، بە تووڕەییو ناڕەحەتی، وەڵامی دایەوە:

- نا، وا نییە. هێواشتر برۆ.. لە حوكمدان پەلە مەكە. راستە (زەبووك زادە)ی مرۆڤێكی ئاژاوەچییە، بەڵام خزمەتێكی زۆری شارۆچكەكەمانی كردووە... ئەگەر (زەبووك زادە) نەبوایە، دەمێ بوو ناوی شارۆچكەكەمان لە نەخشەی وڵاتیش سڕابووەوە.

یەکێ لە مامۆستا گەنجەکان بە تووڕەیی پرسی:

- ئەو کابرا (قۆلبڕ)ە، چ خزمەتێکی ئێمەی کردووە؟

- خزمەت لەوە گەورەتر؟ سەرۆك وەزیران داوەتی کردووە بۆ چارەسەر کردنی گیرو گرفتەکانی وڵات بچێتە ئەنقەرە.

چەند نەفەرێك لەگەڵ بیستنی ئەم خەبەرە چاویان زەق بووەوەو لە سەرسامیان دەمیان بەش بووەوە.

جەنابی میرزا (رەزا) گوتی:

- کێ ئەم خەبەرەی هێناوە؟

- من بە چاوی خۆم دیم...ئێوەیش دەتوانن بچن ببینن... داوەتنامەکان هەر یەك و دوو نین... ئێستا ئەوە، یەك مانگە سەرەك وەزیران بەردەوام نامەی بۆ دەنووسێ:

( برایماغا، دەستم بە دامانت چێشتێکمان لێ ناوە، گیرمان تێدا خواردووە! خەریکە ئابڕوومان لەبەر دەم دەوڵەتانی دەرەوە دەچێ... لە تۆ بەولاوە، هیچ کەس ناتوانێ ئەم ئیشە جێ بە جێ بکا، بە یەکەمین شەمەندەفەر وەرە ئەنقەرە!!.)

کەس دەنگی لێوە نەهات. بابەتەکە ئەوەندە گرنگ بوو هەمووی مات کرن. ئاخیری میرزا (رەزا) بێدەنگییەکەی شکاند:

- ئەدی بۆ نەچووە؟

- چۆن بچێ؟ ئێستا کەریان لە قوڕێ عاسێ بووە، بۆیە بیریان لە (زەمبووك زادە) کردۆتەوە.

یەکێ لە مامۆستاکان گوتی:

- رەنگە هەر لە بەر ئەم ئیشەیش بێ پارێزگار ویستبووی بێتە ماڵی.!!

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) بە سەرلەقاندن پشتگیری لە قسەکەی کرد:

- بەڵێ، هەر لە بەر ئەوەیش بوو، کاتێ (زەمبووك زادە) زانی پارێزگار مەبەستی چییە؟ هەر چەندە یەك دونیا پارەی خەرج کردبوو، داوای بوردنی لێ کرد..

جەنابی میرزا (رەزا)، کە ماسوولکەی دەموچاوی بە ئاشکرا دەلەرزی، گوتی:

- توخوا سەیری ئەو (زەمبووك زادە)یە بکەن!.. خەریکە یاری بە ئاگر دەکا!... کە وەڵامی دەوڵەت نەداتەوەو تەوازۆ بۆ پارێزگار بێنێتەوە، هەمووومان سوورگوم دەکەن..

مەلا بەدر بای لە بەرغەبابەی کرد:

- چ؟ ئێمە سورگوم دەکەن؟ جا کەس زات دەکا بەرامبەر (زەمبووك زادە) کاری وا بکا؟ ئەو، کاتی خۆی هەموو قسەکانی بە سەرۆك وەزیران‌و وەزیرەکان گوتووە. رای خۆی لە بارەی هەموو شتێکەوە پێشان داوە تەنانەت هەڕەشەیشی لێ کردوون: (ئێوە خەریکە غەڵەت دەکەن. ئەگەر شتەکە قۆڕ ببێ، من هەقم بە سەردا نییە.) بەڵام دەوڵەت گوێی پێ نەداوە، بۆیە ئەویش ئێستا لە سەرۆك وەزیران تووڕە بووەو دەڵێ: (ئەمە پەیوەندی بە منەوە نییەو من هەقم بە سەر ئیشی دەوڵەتەوە نییە.) بەڵام ئایا سەرۆك وەزیران قەت واز دێنێ؟! خەبەری ناردووە:

- تۆ هەرگیز ناتوانی لە من تووڕە ببی. ئەمە ئەرکێکی میللییە. ئەگەر سکت بە ئێمەیش ناسووتێ، بەلانی کەمەوە، سکت بە میللەت بسووتێ. ئێستا مادەم تۆ نایەیتە ئەنقەرە، ئێمە دێینە لای تۆ.!

وا بزانم هەر ئەمشەو یا سبەی، سەرۆك وەزیران، خۆی، یان نوێنەرەکەی، دێتە لای (زەمبووك زادە).

دەتگوت بە کوتك لە مێشکم دەدەن. ئەگەر بڵێم ئەمانە قسەکانیان گاڵتەیە، وا نییە. هەرگیزاو هەرگیز بچووکترین نیشانەی گاڵتە لە رەفتارو هەڵس‌و کەوتیانەوە دیار نییە. ئەگەر بڵێم قسەکانیان راست نییە و شتی وا عەقڵ نایگرێ. سەرۆك وەزیرانی وڵات ئەوەندە دەست‌و پێ سپی نییە لە چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی تێ بمێنێ‌و دەستەو داوێنی کابرایەکی نەناسراوی شارۆچکەیەکی بچووك ببێ.

خودایە، خۆت پەردە لە سەر ئەم مەتەلە لابەرە. بێ گومان کابرا بەو ناوەی کە سەرۆك وەزیران، یان نوێنەری دەوڵەت دێتە ماڵی، دەیەوێ خەڵکەکە بخاپێنێ،

ئەگەر نا، ئیبراهیم (زەمبووك زادە) کێیە کە دەوڵەت داوای ئامۆژگاری لێ بکا؟!
ئاشکرا دیارە کابرا ئەقڵی ئینگلیزانی هەیە! خەڵکی ئێرەی باش خستۆتە ژێر
رکێفی خۆیەوە.

تۆ نازانی چەند حەز دەکەم بیبینم!! بینینی ئەو پیاوە ئەرکێکی سەر شانە
بەڵام راستییەکەی ترسێکی تایبەتی دڵی داگرتووم‌و تا ئاگادارییەکی تەواو لە بارەی
بارو دۆخی پەیدا نەکەم، دروست نییە بچمە لای..

## (5)

**(ئەگەر ببێ بە نوێنەر...)**

ژوورێکی باشم لە خانوویەکی هەوراز شارۆچکەکە پەیدا کردووەو دوو سێ رۆژە لە ئوتێل گواستوومەتەوە بۆ خانووە نوێکە. ئێرە لە زۆر لاوە لە ئوتێل باشترە. ئیتر قەیدو بەندی ژیانی ئوتێلم لە سەر نییە... شەوانیش لە دەنگە دەنگی هاتو چۆی ترومبێل ورو گێژ نابم.

پەنجەرەکانی ژوورەکەم بە سەر باخچەیەکی خۆشو سەوزدا دەڕوانن. لە هەمووی باشتر ئەوەیە، خاوەن ماڵێکی باشم هەیە..خانم خەیریە مامانی شارۆچکەکەیە. ژنێکی دامەزراوو قسە خۆشە

شەوان، هەر دەرفەتی ببێ، چیرۆکم لە بارەی بیرەوەرییەکانی خۆیو کردەوەکانی (زەمبووك زادە) بۆ دەگێڕێتەوە.

شەوی یەکەم کە هاتمە ئەم خانووە، هەر چەندە هێشتا جێی خۆم نەگرتبووو بە تەواوی دانەمەزرا بووم، خانم وەکوو یەکێ کە بیەوێ نهێنییەکی گرنگ ئاشکرا بکاو ئاگادار نەبێ کە بۆی هەیە ئەنجامێکی خراپی هەبێ، بە پەلە هات لە هەیوانی بەردەم ژوورەکەی من دانیشتو دەستی بە قسە کرد:

- ئاخ رۆڵە گیان، کەس نییە ئەو (زەمبووك زادە)یە بەزی خۆی لە لەشی نەدابێو کڵاوی لە سەر نەنابێ! تۆ تازە هاتوویتە ئەم شارۆچکەیەو هێشتا خەڵك باش ناناسی! پێویستە ئەم شتانەت پێ بڵێم... چونکە دڵنیام ئاخیری رۆژێ دێ، کڵاو لە سەری تۆیش دەنێ!!

رۆڵـە گیـان، مـن ئـیتر بـە خـەڵکی ئێـرە دادەنـرێم. هەشـت سـاڵی ڕێکـە مـاڵم لێرەیە... مـن لـە ئەسـتەنبۆل زەماوەنـدم لەگـەل مێردەکـەم کـرد. مێردەکـەم پـاش ماوەیەك نەخۆش کەوت. باخو باخچەی لێرە هەبوو، خانوویەکیشی لـە بـاوکی بـە میرات بۆ مابووەوە.

یەکەم جار بـۆ حەسـانەوەو گـۆڕینی ئـاوو هـەوا هاتینـە ئێـرە، بـەڵام مێردەکـەم عومری ئەوەنـدە درێژ نەبوو، خاکی گۆڕ رایکێشایە ئێرە...

لە پاش مەرگی ئەو رەحمەتییە، من چاوم بەرایی نەدا بـە تـەنیایی بگەڕێمـەوە ئەستەنبۆل. دیتم ئیستا چارەنووس ئێمەی هێناوەتە ئێرەو رزقمان لێرەیە، بـڕۆین بچینە کوێ؟

کچەکەم لێرە بوو بە مامۆستا. لە قوتابخانـەی سـەرەتایی ئێـرە دەرز دەڵێتـەوەو خۆیشم باخو باخچەی مێردی رەحمەتیم بەڕێوە دەبـەمو لێـرە مامـانی دەکـەم. لـە بەر ئەوەی ئێرە مامانی لێ نییە، من مامانەتی ژنانی ئـەم شارۆچکەیە دەکـەم. زۆر لـە ژیـان رازیـم. خـەڵکی ئێـرە زۆر بـاشو نـەجیبن، بـەڵام حـەیفو مخـابن ئـەو (زەبـووك زادە)یـە هـەموو خـەڵکی بـەدناو کردووە...ئەگـەر ئـەو کـابرا تەلەکەبازو فۆڵبرە گۆڕ بە گۆڕ بچووبایەو سایەی لە سەر خەڵکی ئەم شارۆچکەیە لا کەوتبایـە، ئەم شارۆچکەیە هیچ عەیبو کەمو کەسری نەبوو...

پرسیم:

- خەیریە خان، (زەبووك زادە) چی لە تۆ کردووە؟

ئاخێکی دوورورێژی هەڵکێشاو بە غەمگینی وەڵامی دایەوە:

- نەنە، برینم مەکوڵێنەوە. ئەو نامەردە کڵاوی لە سەری دەسـرۆك لـە سـەرێکی وەکوو منیش ناوە.

- کڵاوی چی لە سەری ناوی؟

- ئاخ نەنە، چ بڵێم؟ ئـەو کاتـە (زەبـووك زادە) هێشـا ژنـی نـەهێنا بـوو؟.. مـنو دایکی دەستەخوشكو دڵسۆزی یەکتر بووین. شەوو رۆژ، بە یەکەوە بووین. لە دەمی

خۆمم دەگرتەوەو باڵندەی ئاسمانو ماسی دەریام بۆ دایكو خوشكی (زەمبووك زادە) لێ دەنا. بەهادارین میوەو بە نرخترین شیرینیم بۆ دەكڕینو لە بەر دەمم دادەنان. هیچ چارەم نەبوو، من دایكی كچێك بوومو ئەویش خاوەنی كوڕێك بوو، دەمەویست بە هەر جۆرێ بێ، دڵیان رابكێشمو كچەكەم بدەم بە (زەمبووك زادە)...

رۆژێ، ئەو برایماغایە هاتە ماڵمان ... تۆ نازانی چ دەورێكی گێڕا؟ لە دڵی خۆمدا گوتم: (ئەوە ئیشەكە بوو!!) من چ بزانم پلانی لێ داناوەمەتەوە...

دوای ئەوەی بە گەرمی بە خێرهاتنم كردو هەزار جۆر حەلواو شیرینیو میوەم لە گەرووی كرد، بە خەجاڵەتیو ناڕەحەتی گوتی:

- خەیریە خان، ماماڵەیەك هەیە دەمەوێ بیكەم، خێرێكی زۆری تێدایە، بەڵام هەزار لیرەم كەمە، ئەگەر دەكرێ...

لە خەجاڵەتی قسەی لە گەروو عاسی بوو! منیش نەمویست زاوای ئایندەم خەجاڵەت بێ، لێ نەگەڕام كوڕە لەوە زیاتر خەجالەت بێ، یەكسەر چووم ئەو هەزار لیرەیەم هێنا كە پاش چەند ساڵ رەنجو زەحمەتكێشان بۆ بە شوودانی كچەكەم پاشەكەوتم كردبوو. هێنامو بە هەردوو دەست لە پێشم دانا.

لەو رۆژەوە، (زەمبووك زادە) بوو بە سوارەو ئێمە پیادە، تەنانەت دایكو خوشكیشی پەیوەندییان لەگەڵ بڕیم. رۆژێ، بیستم (زەمبووك زادە) خەریكە زەماوەند لەگەڵ كچێكی تر دەكا ! تومەز ئەو مامەڵە بە سوودەی دەیەویست بیكا ئەو ژن هێنانەی بووو پارەی بۆ ئەم كارە پێ دەویست.

خەبەرم بۆ نارد:

- كچەكەت نەهێنام بە جەهەننەم!! بە لانی كەمەوە، هەزار لیرەكەم بدەوە..خوا قبووڵ ناكا مرۆڤ پارەی ژنێكی بێوەژنو كچێكی هەتیو بخوا! ئەگەر پارەكە نەدەیتەوە ئابڕووت دەبەم.

بەڵام تۆ مەڵێ كابرا لەو دار بیبانە نییە كە بەو جۆرە بایە بلەرزێو بەر دەرگا جێ بێڵێ...وەڵامی دایەوە:

- من زۆر حەز دەکەم پاش ملە قسەی خراپم پێ بڵێن بۆ ئەوەی ناوبانگ دەر بکەم!

دیتم نەخێر فایدەی نییە... چاوم لە پارەکە پۆشی، بەڵام ئایا ئیشەکە بڕایەوە؟ ئێستا ئەو، وازی نەدەهێنا. رۆژێ، دایكو خوشکی هاتنە ماڵمان..من هیچ بە سەر خۆمم نەهێناو باسم نەکرد بۆچی برایماغا زەماوەندی لەگەڵ کچێکی تر کردو بۆچی منیان داوەت نەکرد بۆ ئاهەنگی زەماوەند. بە هەر زەحمەتییەك بوو دانم بە خۆمدا گرتو بە خێرم هێنان:

- بە خێر بێن.. چ عەجەب ئێمەتان بیر کەوتەوە؟ فەرموون فەرموون! ئێی؟ ئێستا چ دەکەن؟

دایکەیش بێ ئەوەی بە سەر خۆی بێنێ، چاكو چۆنی کردو گوتی:

- خەیرییە خان، هەر مەپرسە چیمان بە سەر هاتووە!! ئەگەر دەتزانی ماڵمان چەند بێ سەرو بەرە، (دەوڵەت) دەیەوێ بە میوانی بێتە ماڵمان.

کچەکەم چاوێکی لێ داگرتمو پرسی:

- ئەوە کام (دەولەت)ە دەیەوێ بێتە ماڵتان.

دایکە راچڵەکی:

- دەوڵەت دی!! هەموویان برادەری رۆح بە رۆحی کوڕی منن...

ئینجا رووی کردە کچەکەی:

- کچێ، بۆچی لاڵ بووی زمانت ناگەڕێ؟!باس بکە نامەکەی (دەوڵەت) چی تێدا نووسرا بوو؟

کچەکەی وەکوو قوتابییەك، کە وەکوو تووتی دەرزەکەی لە بەر کردبێو لەبەر دەم مامۆستا وەڵام بداتەوە، دەستی پێ کرد:

- (دوای ئەحوالپرسینو داوای سەلامەتیتان.. ئێمە لە چارەسەری ئەو گیرو گرفتە پەکمان کەوتووە، بەم زووانە دێینە خزمەتتان بۆ ئەوەی بە یەکەوە گفتو گۆی لە سەر بکەین!!)

- کچێ، شتێکی تریشی نووسیبوو.

دایكو کیژ ئەوەندە ئەو قسانەیان کرد، ئیتر ئێمە نەمانتوانی ناوی پارە بێنین.

دایکە گوتی:

- خەیرییە خان، بووکە تازەکەمان کوڕەکەمی بەدبەخت کردووە

منو کچەکەم کەیفمان بەم قسەیە هات، بەڵام بە خورتی دانمان بە خۆماندا گرت، پرسیمان:

- بۆچی؟

- حکوومەتو دەوڵەت زۆر لە کوڕەکەم دەکەن دەڵێن: دەبێ ببی بە نوێنەری ئەنجوومەن.. وڵات پێویستە سوود لە هی وەکوو تۆ وەربگرێ، بەڵام برایم لە بەر ئەو ژنە رازی نییە قبووڵ بکا. دەڵێ: ئەو ژنە ئابڕووومان لای نوێنەرەکان دەبا...راست دەکا. ژنە لە من کۆڵەوارترو نەخوێندەوارترە! سەرو بچمێکی وایشی نییە... بۆیە دەیەوێ ژنەکەی تەڵاق بدا..

کچەکە، کە تا ئەوسا بێدەنگ بووو گوێی دابووە قسەکانی دایکی، سەرنجێکی لە کچەکەی من داو بە داخو خەفەتەوە سەری بادا:

- چەندم ئامۆژگاری کرد!! بەڵام خوا سەبەبکاری ئەو ئیشە بگرێ کە بە ئەفسوونو فرتو فێڵ براکەمی هەڵخەڵەتاند...نازانم چییان دەرخوارد دا کە بیرو رای خۆی گۆڕی!

هەموو قسەکانیان بۆنی ئاشنایەتی لێ دەهات. جا بەو حاڵە مەگەر من شێت بووم ناوی پارە بێنم، ئەویش لەبەر دەم مرۆڤی ئاوها!!

لە فەرماندارەوە بگرە تا سەرۆکی شارەوانیو دادوەری دادگا هەموو رۆژێ بەیانی لە بەر دەمی ماڵەکەی ریز دەبنوئیکلامی بۆ دەکێشن.

راستی ئەگەر قسەکەیان راست بێو (زەمبووك زادە) بە راستی بیەوێ ژنەکەی تەڵاق بدا، هیچ دروست نییە ئێمە ناوی پارە بێنین.

راستیان گوتووه (سیاسەت دایكو باوكی نییە.) پێویستە لە مرۆڤی سیاسەتمەدار بترسین. ئەوانە ژنو منداڵیان بە لاوە وەكوو چڵكی دەست وایە. وەكوو ئەوەی یەكێ بیەوێ دەستی بشوا.. دەست شووشتنو ژن تەڵاقدان بە لای سیاسەتمەدارانەوە یەك شتە.

بە كورتی ئێمە هیچ باسی قەرزەكەمان نەكرد. سێ چوار رۆژ بە سەر ئەم مەسەلەیەدا تێپەڕی، رۆژێ، دوای نیوەڕۆ، (زەبووك زادە)م لە كۆڵانێ بینی. رێگای بێرەدا نەبوو، بەڵام نازانم لێرە چی دەكرد. كە چاوی بە من كەوت ئیكلامی كێشاو گوتی:

- پوورە خەیرییە، چۆنی؟

بە سەر پێوە هەندێ قسەمان كرد. زۆر ناڕەحەت بوو كە چەند رۆژێكی تر سەرۆك وەزیران، یان نوێنەرەكەی دێتە ماڵی. گوتی:

- سەرۆك وەزیران منی بە پیاو داناوە. منیش دەبێ تۆڵەی بۆ بكەمەوە. ئەم كارە لە بنچینەدا ئەركی بەڕێوەبەری ناوچە، یان فەرماندارە... بەڵام ئەوان لە ئیشی وا ناوەشێنەوە. من دەبێ پێشوازی لە سەرۆك وەزیران بكەم.

- ئینجا نامەیەكی لە گیرفانی دەرهێناو پێشانی دام.

كچەكەم نامەكەی وەرگرتو تەماشای كرد. بەراستی مۆری رەسمی پێوە بوو. بە داماوی گوتم:

- برایماغا، ئەمە ئەركی سەر شانی هەموومانە.

كچەكەم هەندێ پارەی لە مووچەكەی پاشەكەوت كردبوو. دەوری پێنج سەد لیرە دەبوو. چوو هێنای لە پێش (زەبووك زادە)ی دانا... من بە خەجاڵەتباری گوتم:

- ئەگەر كەمو كورتییەك لە داوەتی سەرۆك وەزیران هەبێ مایەی شەرمەزارییە بۆ هەموومان.(زەبووك زادە) دەیەویست وەرنەگرێ:

- نەخێر پووره گیان، نامەوێ. لە باتی ئەوەی من یارمەتی ئێوە بدەم، ئێوە خەریکن من خەجاڵەت دەکەن. من خۆم بیرێکی لێ دەکەمەوە. پێویستە خەڵکی ئەم ناوچەیە خۆیان بیرێکی لێ بکەنەوە. من ئەگەر ببم بە نوێنەر، بۆ کێ دەبم بە نوێنەر؟ خۆ بۆ خۆم نییە.. سوودی بە خەڵکی ئەم ناوچەیە دەگا.

ئەو پارەکەی وەرنەدەگرت و ئێمە لێی دەپاڕاینەوە:

- دە توخوا وەر بگرە!

مرۆڤ چ بزانێ خەڵك چی لە ناو دڵدایە؟! دایکی دێ دەڵێ: هەموو گرەگرەکانی ئەم شارۆچکەیە، هەموو رۆژێ دێنە لای کوڕەکەم.)

نامەکەیشی نیشان دام. ئیتر دەکرێ پێی باوەڕ نەکەم؟! بۆیە زیاتر پێم داگرت. بیرم کردەوە لەوانەیە رووی نەهێنێ لە کۆڵانێ پارە وەربگرێ. هینامانە حەوشە. گوتم:

- برایماغا، پارەکە وەرگرە!

دیسان نەدەچووە ژێر بار.

- تۆبەو ئەستەغفیرەللا. ناتوانم وەربگرم، عەیبە!!

- باوکە گیان، تۆ شەرەف و ئابرووی ئەم شارۆچکەیە دەپارێزی... بۆ خاتری ئێمە، ئەو میوانداریيە دەکەی. پێت دەڵێم وەری بگرە.

لە شەرمان دەم و چاوی ئارەقەی کرد:

- پووره خەیرییە، تۆ بێوەژنی، لە باتی ئەوەی من یارمەتی ئێوە بدەم، عەیبە پارەتان لێ وەربگرم. خەڵك ببیسێتەوە چ دەڵێ؟! ئابرووم دەچێ.

- رۆڵە گیان، کێ دەزانێ؟ ئەمە نهێنییەکە لە بەینی من و تۆ. کوڕە بم ئەگەر بە کەس بڵێم.

- لەگەڵ ئەوەشدا دڵم بۆ ناچێ وەری بگرم. دەچم لە بانق وەردەگرم... سوپاس بۆ خودا لە بانق ئوعتوبارم هەیە.

ئەوەندی دەمان کرد پارەکەی وەرنەدەگرت. ئەوەندەی نەما بوو تووشی دەستەو یەخەی یەکتر ببین، (زەبووك زادە) دیتی من بە راستی تووڕە بوویم، نەختێ نەرمی کرد. ئاخیری دوای ماوەیەك، لە من قسەیەك و لەو قسەیەك، پێنج دانە سەد لیرەییم لە گیرفانی نا... پیشتریش هەزار لیرەم دابوویێ ... بیری لێ بکەوە هەزارو پێنج سەد لیرەی جاران لەگەل هەزارو پێنج سەد لیرەی ئێستا زۆر جیا بوو... ئەو کاتە ئەو پارەیە باخێکی سێ هەزار مەتری پێ دەهات. کاشکێ ئیشەکە بە هەزارو پێنج سەد لیرە ببڕایەوە!!. من و کچەکەم پێشبڕکێمان بوو لە سەر پارە دانە ئەو سەگی سەگبابە.

ئای ئەگەر دەتزانی چ پارەیەکمان داوەتە ئەو وا لێ کراوە!! ئاخیری ژنەکەیشی تەلاق نەدا. دوو سێ سالّ بە سەر ئەو مەسەلەیەدا تێپەڕی. نە توانیمان هەزار لیرەکە وەربگرینەوەو نە پێنج سەد لیرەکە. سوپاس بۆ خودا زوو تێگەیشتین ئەگەر نا، ئێمەیشی وەکوو ئەو خەلّکە دەخستە سەر ساجی عەلی!!

# (6)

## (سێ جوامێر دەچنە لای...)

(ئـەمین بازرگـان) یەکێکـە لـە ریـش سـپییەکانی ئـەم شارۆچـکەیە. زۆربـەی کاروباری ئێرە، تەنانەت ناکۆکی ژن و مێردی شارۆچکەکەیش لە سـەر دەسـتی ئـەو چارەسەر دەکرێ.

پێش چەند رۆژێ، هاتـە سـەردانی مـن. دوای چاك‌و خۆشـی‌و ئـەحواڵ پرسـین، قسە هاتە سەر کردەوەکانی (زەبووك زادە). گوتی:

- (ئولـو جـان)و (سـوجەن) دوو گونـدن لـە گونـدە گـەورەکانی ئـەو ناوچـەیە. ئاقاریان لە سەر یەکە.

- خەڵکی ئەو دوو گوندە بەردەوام لە سەر بەشە ئاووو زەوی‌و زار ناکۆکییان لـە بەینداپەو قرەقرپانە لەگـەڵ یـەك. تـا ئێسـتا چـەندین جار تووشـی شـەڕو لێـدانی خـوێنین هـاتوون‌و کاریـان بـە دادگـاو زینـدان گەیشـتووە. ماوەیـەك پـێش ئێسـتا (سەبری بەگ)ی کێخوای (ئولوجان) بڕیار دەدا کۆتـایی بـەم بەزمـە بێنـێ. لە دڵـی خۆیدا دەڵێ: ئەم ئیشە تەنیا بە (زەبووك زادە) دەکرێ‌و بەس..

بەدبەختەی ناهەق نەبوو. هەر کەسێ ئیشەکەی تەگەرەی تـێ بکـەوێ، دەچـێتە لای (زەبووك زادە). کابرا هەموو تەگەرەو گیروگرفتێك بە ئاسانی چارە سەر دەکا.

نەیدەتوانی بە دەستی بەتاڵ بڕوا. (زەبووك زادە)یش مەسرەفی دەوێ. ئـەویش دەبـێ بـە رێگایـەك ژیـانی خـۆی بـەڕێوە ببـا.. هـیچ کـارو کاسـبی‌و هـیچ موڵـك‌و دەرامەتێکی نییە.

(سەبری بەگ) دوو پێستە پەنیرو گۆزە دۆشاوێك‌و هیـزە رۆنێکی حـەیوانی لـە کەرەکەی بار کردو بەرەو ماڵی (زەبووك زادە) کەوتە رێ.

(زەبووك زادە) بە هیچ جۆرێ رازی نـەدەبوو دیارییـەکانی وەربگرێ، بـەڵام بـە روویەکی خۆش گوێی لە قسەکانی گرت:

- فەرموو بڵێ بزانم دەردت چییە؟

- جـەنابی (زەبـووك زادە)، دەسـتم بـە دامێنـت، وەرە بکـە بـۆ خـاتری خـواو پێغەمبـەر ئـەم ئیشـەمان بـۆ پێـك بێنـە . هـەموو رۆژێ، لادییـەکان لـە سـەر شتی پڕوپـووچ دەکەونــە گیـانی یـەکترو خـوێن دەڕێـژن... خەریکـە ژیانمـان نـامێنێ ئەوەندەی منداڵەکانمان هەتیو بن‌و گەنجەکانمان بکەونـە زینـدان.. بـە ئێـوە نـەبێ ئەم ئیشە بە کەس پێك نایە.

- ناکۆکیتان لە سەر چییە؟

هەموو کەس دەزانێ زەوی‌و زاری داوێنی چیا هی خـەڵکی (ئولـو جان)ە. چوار سەد، پێنج سـەد سـاڵ پـێش ئێستا تاپۆمـان هەیـە. راسـتی (ئولو جان) نـاوی بابـە گەورەی بنەماڵەکەمانە بـە سـەر ئـەو زەوی‌و زارەوە ماوەتـەوە. لەگـەڵ ئـەو هـەموو بەڵگەو سەنەدانەش (سوجنی)یەکان هاتوون دەستیان بە سەر زەوی‌و زارەکانمـان دا گرتووە. هەموو رۆژێ، مـەڕەکانیان دێـنن لـە نـاو زەوی‌و زاری ئێمـە دەلـەوەڕێنن... هەموو شەوێ، گەنجەکان دێن ئاوی ئێمە دەدزن... ئیتر ئومێدمان بـە هـیچ نـەماوە، خۆمان دەخالەتی ئێوە کردووە...

منداڵم بە سەدەقەت بن فریامان کەوە. ئەگەر بارو دۆخ وا بڕوا ئەنجامی خراپ دەبێ. گەنجەکانی هەردوو ئاوایی لە ناو دەچن..

(زەبووك زادە) پشتگیری قسەی (سەبری بەگ) کرد:

- راست دەکەی.. دەورو زەمان خراپ بووە. کەس قەناعەت بە بەشی خـۆە ناکا. هەندێ کەس نە دینیان هەیەو نە ویژدان. لە سەر شتی پڕو پووچ مـرۆڤ دەکوژن. ماڵی گەورەو گچکان دەخۆن. حەڵاڵ‌و حـەرام نـازانن. کارمەنـدانی دەوڵـەتیش دیـار

نین. سەریان گەرم کردووەو هیچ هەقیان بە سەر ئەم ئیشانەوە نییە. کەس ئیشی خۆی ناکا.. هۆکەیشی ئەوەیە مرۆڤی لێهاتووی لە سەر ئیش دانانێن... هەڵبەت تۆ رۆژنامەت خوێندۆتەوە. هەر جارەی بیانەوێ چەند کەسێك دابمەزرێنن، تاقی کردنەوەی وەرگیرانیان دەکەن.. دەزانی ئەو تاقی کردنەوەیەی دەڵێن چییە؟ تاقی کردنەوەی سەگبابیو زرنگیو پشتی یەك لە عەردی دانە! هەر کەسێ ئەو سیفەتانەی زیاتر هەبێ، سەرکەوتنی مسۆگەرترە..

- برا، ئاشکرایە هەق بە لای گوندی ئێوەدایە... زەویو زارەکە هی ئێوەیە. بەڵام کوا بۆ یەکێ حەقی ئێوە وەربگرێ! ئەگەر هەقو حیسابێك بدەی یەکسەر کارەکەت پێك دێنن.. چار چییە.

من سکم بە ئێوە دەسووتێ. لە ئەنقەرە برادەرم زۆرە، بەڵام ئەم کارە بە نامەو تەلەفۆن چارەسەر ناکرێ. هیچ چارەی نییە من دەبێ خۆم بچمە ئەنقەرە و پارە بەمو بەو بدەمو ئیشەکە پێك بێنم.

(سەبری بەگ) لێ دەزانێ...بە هەر حاڵ ماوەیەك سەرو کاری لەگەڵ دایەرەکان هەبووەو ئاینو ئۆیینەکە دەزانێ. بە خەجاڵەتەوە پرسی:

- ئەم کارە چەندی پارە تێ دەچێ؟!

(زەبووك زادە) لەم قسەیە تووڕە بوو:

- ئەو قسەیە چییە؟ ئێوە هەقتان بەسەر ئەو شتانەوە نەبێ. من خۆم پێکی دێنم. راستە هیچم بە دەستەوە نییە، بەڵام دەتوانم ئەوەندە یارمەتی هاوشارییەکانم بکەم.. دەچمە ئەنقەرە، بەرۆکی هاورێکانم دەگرم، تاپۆی زەویو زاری ئێوە وەردەگرمەوەو دەیهێنمەوە.

(سەبری بەگ) دەستی بردە ناو کیسەی پارە، بەڵام (زەبووك زادە) قبووڵی نەکرد.:

- سوێندم بە خودا چیدی چاكو چۆنیت لەگەڵ ناکەم. قەت ناکرێ پارە لە ئێوە وەربگرم.

- ئاخر برایماغا، شتی وا چۆن دەبێ. ماندووبوونی خۆتان ئەوە هیچ، نابێ پارە لە گیرفانی خۆتان سەرف بکەن.

- راستە، بەڵام من ئامادە نیم پارە لە ئێوە وەربگرم..

- برا گیان، ئێوە واز لە کارو کاسبی خۆتان دێنن، دەچنە ئەنقەرە، ماوەیەك لەوێ دەمێننەوە، ئەمە هەمووی پارەی دەوێ.

- گوتم نابێ.. خوا شایەدە کارەکەتان بۆ ناکەم.

ئەم قسەیەتو ئەو قسەیەت، ئەوەندەی نەمابوو دەستەو یەخەی یەکتر بن. پارەکە لە بەینیان بوو، سەبری بۆ لای زەبووکی هەڵدەداو زەبووك بۆ لای سەبری هەڵ دەدا. پارەیەکی کەمیش نەبوو. دوو هەزار لیرە گاڵتە نییە. تا ئێستا کێ دیویەتی پارە ئەوەندە بێ قیمەت بێ!؟

ئاخیری (سەبری بەگ) بە هێواشی دوو هەزار لیرەکەی لە ژێر دۆشەکی (زەبووك زادە) ناو بە سوپاس و دوعا کردنەوە گەڕایەوە گوند.

ماوەیەك بەسەر ئەو مەسەلەیەدا تێپەڕی ، (سەبری بەگ) چووە لای (زەبووك زادە)و لێی پرسی:

- کاری زەوی و زارەکە بە چی گەیشت؟

(زەبووك زادە) بە داخ و خەفەتەوە سەری باداو گوتی:

- ئەنقەرە ئەوەندەی سەگی برسی تێدایە، مرۆڤ لە بەدواداچوونی ئیشەکە پەشیمان دەبێتەوە. هەر بجووڵێیتەوە، دەبێ پارە بدەی. حیسابم لە دەست دەرچوو. لە سێ هەزار لیرەوە تا پێنج هەزار لیرەم دەرخواردی کارمەندانی دەوڵەت داو هێشتا تەواو نەبوو.

(سەبری) شەرمەزار بوو کە ئەو هەموو زەحمەتەی داوەتە بەر (زەبووك زادە)و گوتی:

- ئێمە زمانی ئەوەمان نییە تەوازۆتان بۆ بێنینەوەو ناتوانین تۆڵەتان بۆ بکەینەوە. خوا پاداشتان دەداتەوە...

- بێ گومان من بۆ خاتری ئێوە ئەو کارەم کرد کە هاوشاری خۆمن ئەگەر نا، بۆ یەك ملیۆنیش ئامادە نیم منەتی ئەو نەفس نزمانە هەڵبگرم. ئەوان قەت بەوەندە پارەیە تێر دەبن؟! دەبێ دووبارە بچمە ئەنقەرەو بە هەقو حیسابدان ئیشەکە تەواو بکەم.

(سەبری بەگ) دیسان پارەی دەرهێنا.

- ئەم پارەیە لە شانی تۆ ناوەشێتەوە بەڵام بایی مەسرەفێکی کەم دەکا.

(رەبووك زادە) وەکوو رۆژی یەکەم نوورە بوو:

- ئەوە چ قسەیەکە تۆ دەیکەی؟! ئەگەر یەکێ گوێی لێ بێ من پارەم لە هاوشارییەکانی خۆم وەرگرتووە، ئەوسا تەگبیری چییە؟ خەڵك چم پێ دەڵێن؟

(سەبری بەگ) ئەم جارە، بە هێدی سێ هەزار لیرەی لە ژێر دۆشەك دانا!..

سێ چوار مانگی تر بە سەر ئەم مەسەلەیەدا تێپەڕی، کێخوای گوندی (ئولو جان) دیتی (زەبووك زادە) هیچ خەبەری نییە... هەندێ دیاری لە کەرەکەی بار کردو چووە ماڵی (زەبووك زادە)... (زەبووك زادە) دیسان دەستی پێ کرد:

- (سەبری) گیان، هەر بە غەڵەتیش یەك کەسی راستو بە ویژدانیان لە سەر ئیش دانەناوە. رۆژ بە رۆژ رەوشتی ئەو خەڵکە زیاتر تێك دەچێ. پێش چەند رۆژێ، نامەیەکی توندم بۆ ئەنقەرە نووسی. ئەگەر یەك دێری ئەو نامەیە لە بن گوێی هەر سەگێ بخوێنیتەوە، هار دەبێ. دەزانی نامەکەم بۆ کێ نووسی؟ بۆ بەڕێوەبەری گشتی، خۆی، کە ئیشی تۆی بە دەستە...بەم جۆرە دەستم پێ کردبوو: ( جاشە کەری بەڕێز،...) ئاخر زۆر برادەری دڵسۆزی یەکترین. ئاو بەبێ روخسەتی یەکدی ناخۆینەوە. داوام لێ کردبوو بە دوو سێ رۆژ کارەکەی تۆ تەواو بکاو رەوانەی بکاتەوە... بێ شەرەفە وەڵامی نەدامەوە...

- ناچارم بۆ تەواو کردنی کارەکەی تۆ دووبارە ملی رێ بگرمو بچمە ئەنقەرە! چارەم نییە... گفتم پێداوی بە هەر نرخێ بێ، دەبێ گفتەکەم بێنمە دی. من ئامادەم هەتا گیانی خۆم لە رێگای هاوشارییەکانم بەخت بکەم.

(سـەبری بـەگ) بـەم هـاتو چوونە لـە پـڕ هەسـتی کـرد کـە (زەبـووك زادە)ی دەییووس دەوری دوازدە هەزار لیرەی لێ بەرداوەتەوە.

لەو پارەیە، هەشت هەزار لیرە هی خۆی بوو، ئەوەی تری بە ناوی بە رەسمی کردنـی تـاپۆی زەوی‌و زارەکـە لـە خـەڵکی گونـد وەرگرتبـوو. خـەڵکی گونـدیش کـە زانیـان هـیچ خەبـەرێك نـەبوو، بـەرۆکی (سـەبری بـەگ)یـان گـرت: ( یـان تـاپۆی موڵکمان بدەرێ، یان پارەکەی خۆمان دەوێتەوە!)

(سـەبری بـەگ) دوو سێ ڕۆژ مۆڵەتی لە خـەڵکی ئاوایی وەرگـرت. هاتـە شـارو چـووە لای (نـووری سـەفار)...(نووری سـەفار) یەکێکـە لـە ڕیـش سـپییەکانی شارۆچـکەکە. لـە بـەر ئـەوەی چـەند سـاڵێك لـە ئەسـتەنبوڵ بـووەو نـەختێ خوێندەواریشی هەیە، هەموو کەس حیسابی بۆ دەکا. (سەبری بەگ) پێـی وا بـوو تاکە کەسێ کە دەرەقەتی (زەبـووك زادە) بـێ (نـووری سەفار)ە. بـەڵام هـەر هێنـدە (سەبری بەگ) دەستی بە باسی دەردەدڵی خۆی کـرد، ئـاهو ناڵەی (نـووری سەفار) گەیشتە گەشکەشانی فەلەك. ئەویش لە دەست (زەبووك زادە) دڵی پڕخوێن بوو.

(سەبری بەگ) بڕیاری خۆی داو بە (نووری) گوت:

- ئێستا هاتووم ڕای ئێوە وەربگرم. بڕیارم داوە بچم داوای پارەکەی لێ بکەمەوە، ئەگەر دایەوە ئەوە هیچ، ئەگەر نەیدایەوە، ئەوەندەی لێ دەدەم تا ڕەپ ڕادەوەستێ. تۆ ڕات چییە؟ ڕازی یان نا؟

پێش ئەوەی (نووری) وەڵام بداتەوە، (جەمال بەرگدروو) بە شیوەن‌و لە خۆدان هاتە دوکانێ. (نووری سەفار) قسەی خۆی لە بیر کردو لێی پرسی:

- کاك (جەمال)، ئەوە چ خێرتە؟

- برام، هاتوومەتە لات، ڕێگایەکم نیشان بدەی. دەبێ ئەمڕۆ ئەو (زەبووك زادە) ناکەسبەچەیە بکوژم.. خۆ لە چوونە سەردار زیاتر نییە. منداڵ بێ سەرپەرشت دەمێننـەوە، بـە جەهەننـەم!! بـە لانـی کەمـەوە بـە لـەناوبردنی (زەبـووك زادە) گەورەترین خزمەت بە هاوشارییەکانم دەکەم. ئێستا تکات لێ دەکەم لە ڕێگای ئـەم

ئەرکە گەورە کۆمەڵایەتییەوە یارمەتیم بدە! بە لای تۆوە وا باشە بە چەقۆ تیکە بە تیکەی بکەم، یان دەستی لە خنخنۆکی بنیێمو ئەوەندە رایبگوشم تا بە دۆزەخ موشەرڕەد دەبیێ؟ راستی پێم حەیفو مخابنە دەست لە لەشی پیسی ئەو پیاوە بدەم.

(نووری سەفار) برینی کولایەوەو بە زەحمەت دانی بە خۆیدا گرت:

- برا، تۆ دەردت چییە؟ تووشی چ بەڵایەکی کردووی؟

(جەمال بەرگدروو) دەستی بە باسی خوی کرد:

- کاتێ برا بچووکەکەم قۆناغی ناوەندی لێرە تەواو کرد، سوور بوو بچێتە زانکۆ. ئێوە خۆتان ئاگاداری کارو کاسبی منن. ئەم شارۆچکەیە خۆی چییە، دەبێ بەرگدرووی چی بێ!

بە زەحمەتو مەشەقەت مەسرەفی حەفت سەر خێزان دەردێنم. چۆن دەتوانم برام بنێرمە شارو مەسرەفی خواردنو هەقی زانکۆی دابین بکەم؟ کابرایەکی شیر حەڵاڵ پێی گوتم: ( دەوڵەت قوتابخانەی ناوخۆی خۆڕای هەیە. بینێرە، با لەوێ بخوێنێ.)

- برا، من شارەزای رێو رەسمی ئەنقەرە نیم. پیاو بۆ کاری وا دەبێ پارتێکی هەبێ.

- پارتی لە (زەبووک زادە) باشتر لە کوێ دەست دەکەوێ؟! سەرۆك وەزیران هیچ قسەی رەت ناکاتەوە. ئەو راسپاردەیەك بکا بەسسە... ئەگەر ئەو بڵێ، لە زانکۆ وەری دەگرن، بێ دەرز خوێندن، بڕوانامەی دەدەنێ.

لە خەڵکی تریشم بیستبوو کە (زەبووك زادە) ئافتاوەکەی ناوی زۆر دەگرێ. دەمزانی دەستی لە وەزارەتەکان هەیەو هەموو رۆژێ بە تەلەفۆن لەگەڵ سەرۆك وەزیرانو کابینەی دەوڵەت قسە دەکا. ئیتر نەدەبوو خۆم تاخیر بکەم. بە غارە غار چوومە ماڵی (زەبووك زادە):

- (ئیبراهیم بەگ)، دەستم بە دامانت حاڵو مەسەلە ئاوهایە... بە هەر جۆرێ بێ دەبێ ئەم ئیشەم بۆ جێ بە جێ بکەی!

(زەبووك زادە) زۆر بە خوێن ساردی وەڵامی دایەوە:

- هیچ خەمت نەبێ! سەرۆکی زانکۆ ئەوەندە لەگەڵ من خۆیییە، کاتێ کە دەمبینێ، دەست لە ملم دەکاو سێ چوار ماچم لێ دەکا... ئێستا نامەیەکی بۆ دەنووسمو پێیدەڵێم. ئەگەر کارەکەت بۆ نەکا، ئیتر خۆی تێ ناگەیەنم. تۆ هەقت نەبێ. ئەم کارە بە من گەیشت. لە سەدا سەد پێکی دێنم.

کاتێ ئاوها بە پتەویو دڵنیایی وەڵامی دامەوە، سێ تۆپە قوماشم بە قەرزو قولە کڕیو دوو حەفتەیش شەوو رۆژ رەنجم کێشاو دووریمو کردم بە جلو بەرگو بۆم برد... (زەبووك زادە) پرسی:

- کاك (جەمال) پارەی جلو بەرگەکە چەند دەکا؟

شتی وا چۆن دەبێ (ئیبراهیم بەگ)، من پارە لە تۆ وەر بگرم؟! من زۆر قەرزاری تۆم.

ناکەسبەچە بە جۆرێ تووڕە بوو، بە راستی سەرم سوڕما:

- ئەم قسانە چییە؟ یانی دەبێ من بەرامبەر ئەنجامدانی کاری هاوشارییەکانم پارە وەر بگرم؟ رۆڵە گیان، ئەگەر خەڵکی ئەم شارۆچکەیە بیانەوێ بۆ هەر کارێکی بۆیان دەکەم، پارەم بدەنێ، کەس شەڵواری لە پێدا نامێنێ. فەرموو پارەی جلەکان وەر بگرە. نامەوێ ئیتر گوێم لەم قسانە بێ!!

لە ترسی ئەوەی نەوەك تووڕە بێ، دەستە پارەکەم لە (زەبووك زادە) وەر گرت، بەڵام بە هێواشی لە ناو گیرفانی یەکێ لە دەستە بەرگەکانم ناو لە ماڵی هاتمە دەرەوە.

ماوەیەك پێ چوو، هاوین خەریك بوو تەواو دەبوو، کاتی دەست پێ کردنی دەرزو خوێندن نزیك بووەوە، چوومە لای (زەبووك زادە):

- (ئیبراهیم بەگ)، دەستم بە دامانت، خەریکە کاتی دەرز بەسەر دەچێ...

(زەبووك زادە) بە سەرسامی پرسی:

- بۆچی وەڵامی زانكۆت لە ئەنقەرەوە پێ نەگەیشتووە؟!

- نەخێر.

- راوەستە... ئێستا رەگ و كۆكی سەرۆكی زانكۆ دەردێنم!

دەستی دایە كاغەزو قەڵەمێك و دەستی بە نووسین كرد... بە دەمییەوە هەرچی دەینووسی بە دەنگی بەرز دەیخوێندەوە:

-( دۆستی نازیزم، (عوسمان)ی بێ شەرەف... )

گوتم:

- (ئیبراهیم بەگ)، تۆ ئەم نامەیە بۆ كێ دەنووسی؟

- دەبێ بۆ كێ بێ؟ بۆ سەرۆكی زانكۆ خۆیەتی...

ئینجا نەختێ لە فكر راچوو... و سەری بادا:

- نا، نامە بە كەڵك نایێ... دەبێ خۆم بچمە ئەنقەرەو دوو سێ شەقازللە لە پاتێلی بدەم... بۆ ئەوەی ئیشی براكەت پێك بێنێ.

منیش قوماشم كڕی و پاڵتۆیەكم بۆ دووری لە ئەنقەرە تاكی نەبوو. ئاخ!! حەیف بۆ ئەو هەموو دەرزییەكەی بە كارم هێنا .. تا ئێستا هیچ كەس كلاَوی وای لە سەری من نەناوە... بە گیانی تۆ (نووری سەفار)، ئەگەر ناسنامەی ئەو پیاوە بەتاڵ نەكەم، نامووسم نییە.

كاك (جەمال) لە تووڕەییان خوێنی هاتبووە جۆش و چاوی سوور ببوو. لە پڕ هەستی كرد (نووری سەفار) وەكوو یەكێ كە ددانی ژان بكا، بەردەوام سەری بەملاو بەولادا بادەدا. پرسی:

كاك (نووری) ئەوە تۆ چیتە؟

- هەر مەپرسە... من لە هەمووتان خراپترم.

- خۆ قاتی ئەو ناكەس بەچەیە تۆیشی نەخاپاندووە؟

- لە هاوشارییەکانمان، کێ هەیە ئەو بێناموسە تەفرەی نەدابێ؟ دەڵێی خوا هەموومانی کەڕو کوێر کردووە. لەگەڵ ئەوەی هەموو ڕۆژێ بە چاوی خۆمان فرتو فێڵەکانی دەبینین، دیسان پێی هەڵدەخەڵەتێین...

- دە باس بکە، بزانم چ بەڵایەکی بە سەر تۆ هێناوە؟

- خۆتان وەزعی من دەبینن، دوکانم دەرگای نییە، بانی تێکچووە... ئیشەکەیشم ئەوە دیارە. بە ساڵو بە مانگ یەکێ مەنجەڵو دەست مەنجەڵەکەی دێنێ بۆی سپی بکەمەوە. ئەگەر سەراپای کارەکە قازانج بێ، بە زۆر نانی وشکی منداڵەکانم دەردێنێ. پار، شارەوانی رایگەیاند دوکانەکەم بەر جادە دەکەوێ. تۆ نازانی بە بیستنی ئەم خەبەرە چم بە سەر هات؟ خەبەری ئیعدامم بوو بیستم. چونکە ئەگەر ئەم دوکانەم لە دەست بچووبایە، منداڵەکانم نانی وشکیشیان لێ دەبڕا. لە کاتێکا کە دەستو پێم لێ گوم ببوو، (زەبووك زادە)م بیر کەوتەوە. بە نائومێدی چوومە لایەوەو گوتم:

- (ئیبراهیم بەگ)، دەستم بە دامانت تۆ گەورەی ئێمەی... باوکی هەژارو لێقەوماوانی. لە خوای بە زیاد بێ هەموو کارێکت پێ دەکرێ.

ئەوەندە سەخڵەت بووم قسەم پێ نەدەکرا. دەستم بە گریان کرد. (زەبووك زادە) دڵی دامەوە:

- ڕۆڵە گیان، مەگری، بڵێ دەردت چییە... هەر چی هەبێ، هەر ئێستا بۆت جێ بە جێ دەکەم.

ڕووداوەکەم بۆ باس کرد. (زەبووك زادە) بە تووڕەیی هاواری کرد:

- لەو کاتەوە کە ئەو (جووت بەد زادە) قورمساغە بۆتە سەرۆکی شارەوانی ئێرە، خەڵك ڕۆژی خۆشیان نەدیوە. حەیف بەینم لەگەڵیا خۆش نییە. بەڵام بە فەرماندار دەڵێمو ئەگەر نەبوو، بە پارێزگار دەڵێم. ئەگەر ئەویش ئیشەکە نەکرد، یەکسەر دەچمە ئەنقەرەو کارەکەی تۆ یەك لا دەکەمەوە.. هیچ خۆت ناڕەحەت مەکە!!

ئەوەندە بە توندی قسەی دەکرد، مردووی زیندوو دەکردەوە... منیش ساڵەهای ساڵ بوو پەنجا لیرەم دینار دینار کۆکردبووەوەو لە ناو دۆخینی شەڵوارم شاردبوومەوە، دەرم هێناو لە پێش (زەبووك زادە)م دانا:

- جەناب، ئەو پارە کەمەیە لە شانی ئێوە ناوەشێتەوەو بەشی مەسرەفی ڕێگای ئەنقەرە ناکا بەڵام لە دێر زەمانەوە گوتوویانە: (دیاری مێروو قاچی کوللەیە). هەر هیچ نەبێ دەتوانن قاوەیەکی پێ بخۆنەوە. بە سەدەقەی منداڵەکانت بم، ئەگەر ئەم کارەم لە دەست بچێ، ژن و منداڵم لە ناو دەچن...

(زەبووك زادە) بە سەرە سمك پارەکەی تێ هەڵدایەوە لای من:

- سەگ باب، ئەگەر مرۆیەکی ساویلکەو خۆش باوەڕ نەبای بە شەقازللە لە پاتێل دان لە ماڵی خۆم دەرم دەکردیتە دەرەوە. پارەکەت هەڵگرەو بڕۆ لە بەر چاوم بزر بە...دوای یەك عومر خزمەتی ئەو خەڵکە، تازە بێم پارە لە یەکێکی وەکوو تۆ وەربگرم؟ بڕۆ دوو ئیشی خۆت.. ئەگەر فەرمانی سەرۆك وەزیرانیش بێ، کەس ناتوانێ دوکانی تۆ تێك بدا.

- من لە ترسان پەنجا لیرەکەم هەڵگرت، بەڵام لە باتی ئەوە چل و هەشت پارچە هیرباری سفری ماڵی (زەبووك زادە)م سپی کردەوە کە ئەگەر پارەکەی بدابایە سەدو پەنجا لیرە زیاتری دەکرد. جگە لەوەیش لەگەنێکی گەرماوو دەستە مەسینەو لەگەنێکی سفرو مەنجەڵێکی گەورەیشم بە دیاری پێشکەش کرد. سەرجەمی ئەمە هەمووی دەوری پێنج سەد لیرە دەبوو. ئەگەر ئیشەکەم پێك هاتبا، قیرۆسیا نۆشی گیانی بێ، بەڵام ئەمڕۆ بەیانی شارەوانی ئاگاداری کردمەوە حەفتەی دادێ دوکانەکەم تێك دەدەن.

کە (نووری سەفار) قسەکەی تەواو بوو، دەتگوت ئەویش کاسەی سەبری لە سەری رژاوەتەوە، داهاتەوە، دەستی دایە شیشەیەکی سوورەوەبووی سەر کوورەو گوتی:

- یاللا کورینە، بۆ پێشەوە... تا ئەو ناکەسبەچەیە لە ناو نەبەین، کەس لەم شارۆچکەیە ئیسرەحات لە خۆی ناکا. ئەمە ئەرکێکی نەتەوایەتییە... لە خزمەتی سەربازی گرنگترە...

(نووری سەفار) بە پێش کەوت. (سەبری بەگ)و (جەمال بەرگدروو) بە نەعرەتە لێدان کەوتنە دوایەوە.

یەکێ چەقۆیەکی گەورەی بە دەستەوە بووو یەکێکی تر مقەسێکی بەرگدروون‌و (نووری)ش شیشە ئاسنێکی سوورەوە بووی بە دەستەوە بوو..

هەر کەسێ لە رێگادا بەم جۆرە دەیبینین، دەکەوتە شوێنیانەوە.

لەو رۆژگارەدا، ( (هەمزە جووت بەدزادە)) سەرۆکی شارەوانی بووکە. یەکێ بوو لە دوژمنە سەرسەختەکانی (ئیبراهیم زەبووك زادە)و ماوەیەك بوو لە دوای دەرفەتێك دەگەڕا بۆ ئەوەی حیسابی خۆی لەگەڵ ئەم پیاوە پیس‌و قۆڵێرە یەك لا بکاتەوە. هەر هێندە ئەم خەبەرەی بیست، خۆی گەیاندە مەیدانی شەڕو بە دادانی دروشمی ئاگرین هەست‌و سۆزی ئەو سێ جوامێرەی لە رادە بە دەر وروژاند.

(کاروانی مەرگ) بەم بارو دۆخە گەیشتە بەر دەرگای ماڵی (زەبووك زادە).. زەبری مست‌و پێلەقەی ئەو حەشامەتە ئەوەندە توند بوو، دەرگای ماڵی (زەبووك زادە) ئەوە هیچ، ئەگەر دەرگای قەلایش بوایە خۆی ل بەر رانەدەگرت. ئاخیری دەرگا کرایەوەو سێ گەنجەکە چوونە ژوورەوە بۆ ماڵی (زەبووك زادە). ئەوانەی تر لە بەر دەرگا کۆبوونەوەو چاوەڕێی جەنازەی خەڵتانی خوێنی (زەبووك زادە)یان کرد.

دوای ماوەیەك چاوەڕوانی دیتیان هیچ دەنگ لە ژوورەوە نایێ. (هەمزە جووت بەدزادە) گوتی:

- هەڵبەت ئیشەکە تەواو بووە. (زەبووك زادە)یان تیکە تیکە کردووە. ئێستا کە ئەوەندە درێژەی کێشا، دیارە خەریکی شووشتنی جەنازەکەین. دەرفەتیان نەداوە دەنگی دەر بێ. غافلگیریان کردووە.

کاتێ (هەمزە بەگ) خەریك بوو بەو جۆرە قسەی دەکرد، دەرگای ماڵی (زەبووك زادە) کرایەوەو هەر سێ گەنج بە شادو گوشادیو بە سەرو سیمایەکی رازی هاتنە دەرەوە.. هەرسێکیان یەك لە دوای یەك دوعایان بۆ (زەبووك زادە) دەکرد:

- خوا عەمر درێژت بکا!

- خوا لە پێش دۆستو دوژمن سەر بڵندت بکا!

- خوا لێت رازی بێ!

حەشامەتی خەڵکەکە لە سەرسامییان لە جێی خۆیان وشك بوون. ئەوەندەی نەمابوو دوو شاخیان لە سەر سەر بڕوێ.

بارو دۆخەکە بە جۆرێ بوو، کەس زاتی نەدەکرد پرسیارێك بکا. هەموو بە کپو بێ دەنگی پەرتەیان کرد.

(جووت بەدزادە) لە سەرخۆ بە یەکێ لە هاورێکانی گوت:

- من دەمزانی ئەو (زەبووك زادە) چ چەقاوەسوویەکە! لێم مسۆگەر بوو بە قسەی خۆش شەڵوار لە پێی ئەو سێ گەنجە دەکاتەوە کە بۆ کوشتنی چووبوونە ماڵیو پاشان پێیان دەڵێ: (بە خێر هاتن).

ئەو سێ گەنجە تا یەك حەفتە بۆ کەسیان باس نەدەکرد ئەو رۆژە لە ماڵی (زەبووك زادە) چ رووی دا. هەر چەندە زۆریشیان لێ کردن هیچ ئەنجامی نەبوو... دەیانگوت:

- بوونی (زەبووك زادە) بۆ خەڵکی ئێرە نیعمەتێکی گەورەیە. حەیف کە هەندێ کەس چاویان پێ هەڵنایێ سەیری بکەنو لە حەسوودییان شەق دەبەن... کابرا ئیمامزادەیە! کە ئێمەی لە سەر پلەکانە بینی، لە کەیفخۆشییان قاقا پێکەنی. بەر لەوەی ئێمە هیچ قسەیەك بکەین گوتی:

- جەنابینە، زۆر داوای بوردن دەکەم، پێش پێی ئێوە، سەرۆکی جەندرمـە هات، لە ژوورەوە چاوەڕێ دەکا... روخسەت بدەن یەکەم جار ئیشی ئەو پێک بێنم ئەوجا دێمە خزمەت ئێوە...

ئێمەی بردە ژوورێکە تر.

(نووری سەفار) باسی کرد گوتی:

- کە ناوی سەرۆکی جەندرمـەمان بیست، هـەناومان پسا... تاقـەتمان لـە قاچدا نەما... ئەگەر جەنابی ئەفسەر لە ژوورەوە بێتە دەرێو ئێمە بەم حاڵە ببینێ، کە هەرسێکمان چەکدارین، تـەگبیرمان چییە؟ لـە ژێـر پێلەقـە وردو خاشمـان دەکا. تەماشای دەمو چاوی (سەبری بەگ)ی کێخوای گوندی (ئولو جان)م کـرد، دیـتم لـە ترسان هەموو گیانی دەلەرزێ. لەبەر ئەوەی ددانـی تـاقم بـوو، دەنگی تەقـە تـەقی پێک کەوتنی ددانەکانی دەهات. لـە حـاڵی (جـەمال بەرگـدروو) هـەر مەپرسـە، زۆر سەرشۆڕ بوو. رەنگی سپی وەك پەلکە پیازی لێ هاتبوو. لە قوژبنێکی ژوورەوە خۆی کز کردبووو لە سەر زەوی هەڵتووتا بوو بە جۆرێ هەستم دەکرد لەگەل بیستنی ناوی فەرماندەی جەندرمە خۆی پیس کردووە بۆیە ناتوانێ هەستێتەوە سـەر پـێ. منیش چوومە ژوورەوەو دەرگام داخستو دانیشتم چاوەڕێی رووداوی نوێم کرد. لە ژووری تەنیشتەوە دەنگی قسە کردنی (زەبـووك زادە)و جـەنابی ئەفسـەر بـە باشـی دەهات...(زەبووك زادە) بە قایم قسەی دەکرد ... جەنابی ئەفسەر بە هێدی وەڵامی دەدایەوە:

- ئەفسەر، تۆ هیچ ناڕەحەت مەبە... حەزت لە کوێ بێ دەتگوازمەوە ئـەوێ. بـۆ هاورێکانم دەنووسـم.. ئەگـەر نـەبوو، خـۆم دەچمە ئەنقـەرە. هـەموو کارمەنـدانی دەوڵـەت خـوا خوایانــە مــن داوای شـتێکیان لێ بکـەم. ئـێ، ئێمــەیش رۆژگارێـك زەحمەتمان لە گەڵ پارت کێشاوە. هەموو کەس حیسابمان بۆ دەکا. خـاتر جـەم بـە، کارەکەت بۆ پێك دێنمو بۆ هـەر کوێ حـەز بکـەی دەتنێرمـە ئـەوێ. بـەڵام منـیش یەك داوام لە تۆ هەیە...

- ئەمر بکە جەنابی (ئیبراهیم خان)، خزمەتکارت هەمیشە بە دڵو گیان ئامادەیە دەستووراتی تۆ جێ بە جێ بکا...

- سەیر کە ئەفسەر، نابێ هاوشارییەکانی من تووشی کەمترین ناڕەحەتی ببن. من حەز لە شتی وا ناکەم. تا من لەم شارۆچکەیە بم، نامەوێ کاری نایاسایی لێرە روو بدا. پێویستە هەموو کارێك بە شێوازێکی راستو دروست جێ بە جێ بکرێ.. ئەمە بەو کەسە بڵێ کە دێتە جێگای تۆ... لە بەر ئەوەی ئەو غەریبە لە شار، نامەوێ دڵی بشکێنمو ئازاری بدەم. من هیچ قسەی ترم نییە، دەتوانی بڕۆی. ئەگەر ناڕەحەت بووی، بۆم بنووسە، هەفت نەبێ.

جەنابی ئەفسەر، بە دەنگێکی پڕ پاڕانەوە، وەڵامی دایەوە:

- ئەگەر روخسەت بدەن بەندە چەند دەقیقەیەك هەندێ سکاڵام هەیە.

- بەڵام دەبێ کەمێ سەبر بگری ئیشی هاوشارییەکانم جێ بە جێ بکەم، پاشان...

- بەڵێ، ئێوە فەرموون. بەندە لێرە چاوەڕێ دەکەم تا ئیشتان تەواو دەبێ.

- ئێمە کە ئەو قسانەمان دەبیست، هەموو گیانمان دەلەرزی:

- ئای وای! دیتت چ غەڵەتێکمان کرد؟ (ئیبراهیم بەگ) کە بەم جۆرە قسە لەگەڵ فەرماندەی جەندرمە بکا، ئیتر دیارە ئێمە تەگبیرمان چییە...

کێخوای (ئولو جان) یەکسەر چەقۆکەی لە باخەڵی شاردەوە، (نووری سەفار) نەیدەتوانی شیشە ئاسنەکە لە بەرکی بنێ، لە پشت دەرگای ژوورەوە شاردییەوە، (جەمال بەرگدروو) ئەوەندە پەشۆکا بوو، مقەسەکەی هەروا بە دەستەوە بوو.

(زەبووك زادە) هاتە ژوورەوەو زۆر خۆییانە گوتی:

- جەنابینە، زۆر بە خێر بێن!.

بەڵام کە چاوی بە مقەسی گەورەی بەرگدروون کەوت، لە دەست (جەمال بەرگدروو)، نەختێ سەرسام بووو گوتی:

- کورە، ئەوە چییە لە دەستت؟

(جەمال بەرگدروو) زیاتر پەشۆکا، بە منجە منج وەڵامی دایەوە:

- دیتم جلتان کۆن بووە، هاتم ئەندازەتان بگرمو چەند دەستە بەرگێکتان بۆ بدوورم.

(زەبووك زادە) پێکەنی:

- من خۆم پێویستم بە جلو بەرگ نییە، بەڵام دایکم مانتۆیەکی گەرەکە. مانتۆیەك بۆ ئەو بدوورە..

ئینجا رووی بۆ لای کیخوای (نونو جان) وەرگێڕا:

- (سەبری بەگ)، ئیشەکەی تۆ خەریکە تەواو دەبێ. مەیلەو تەواو بووە. کە لێرە رۆیشتی، مژدە بە خەڵکی ئاوایی بدە بڵێ زەویو زارەکە بوو بە هی خۆمان.

(سەبری بەگ) زۆر کەیف خۆش بوو. بێ ئەوەی کەس پێ بزانێ، پێنج سەد لیرەی لە بن دۆشەکەکە نا.

کە نۆرەی (نووری سەفار) هات. گوتی:

- (ئیبراهیم ئاغا) من هیچ ئیشم نییە...دیتم هاوشارییەکانم دێنە سەردانی تۆ، منیش ویستم لە حاڵو ئەحواڵت بپرسم. ئەوە بوو هاتمە خزمەتت. ئیشاللا حاڵت باشە... یا خوا خوا رۆژ بە رۆژ عەمرو سەرفیرازیت هەر زیاد بکا...ئێمەیش لە سای تۆ زۆر باشین.

- هەر سێ کەس دەست لە پێیان درێژتر لە ماڵی (زەبووك زادە) هاتنە دەرەوە. رۆژێ، ئێمە چەند کەسێك لە دوکانی (نووری سەفار) بووین، رووداوی ئەو رۆژەی بۆ باس کردین، هەمووومان لە جێی خۆمان وشك بووین. خەریك بووین باسی ئەو مەسەلەیەمان دەگرد، جەندرمەیەکی سەرکار هاتە دوکانێ.

- جەندرمەی سەرکار دوو بادی هێنا بوو (نووری) بۆی سپی بکاتەوە. (نووری) لە جەندرمەکەی پرسی:

- سەرکار، سەرۆك جەندرمەی نوێ کەی دێ؟

جەندرمەکە بە سەرسامی وەڵامی دایەوە:

- سەرۆکی چی؟ هیچ بڕیاری وا نییە کە سەرۆکەکەمان بگۆڕێ...

- حەفتەی رابردوو، لە دانیشتنێکدا، بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو سەرۆکەکەتان باسی دەکرد دەیەوێ بگوازرێتەوە..

جەندرمەکە بە ئاوازێکی گالتەجاڕانە گوتی:

- خەونت دیوە، خێر دەبێ ئینشاللا! سەرۆکەکەمان ئەوە بیستو شەش رۆژە ئیجازەی هەیە... سێ چوار رۆژی تر مانگەکەی تەواو دەکاو دێتەوە.

- باوکە گیان، حەفتەی رابردوو لە ماڵی (زەمبووك زادە)...

جەندرمەی سەرکار لێ نەگەڕا (نووری) قسەکەی تەواو بکا:

- بێ شك ئەو قۆڵبڕە فشەکەرە دیسان دەوری بۆ ئێوە گێڕاوە. ئەمە جۆرە ئاینو ئۆینێکی کابرایە، لە ژووری تەنیشتەوە بە ناوی ئەوەی لەگەڵ فەرماندەی ئێمە قسە دەکا، لە بەر خۆیەوە بە قایم قسە دەکاو پاشان دەنگی دەگۆڕێو خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوە!

(نووری سەفار) وەکوو تۆپی یاری کە دەرزی تێ را بکەن، فش بووەوەو لە جێی خۆی، خۆی کز کرد. بەسەزمان تازە تێگەیشت فێڵی لێ کراوە. چووبوون ئیشی خۆیان پێك بێنن‌و هەقی خۆیان وەر بگرن، کەچی شتێکی تریشیان خستە سەر. ئەوەیە دەڵێ: (بۆ ریش چوو سمێڵی لە سەر دانا.)

(جەماڵ بەرگدروو) مانتۆیەکی بۆ دایکی (زەمبووك زادە) دووری... کێخوای (ئولو جان) پێنج سەد لیرەی لە ژێر دۆشەکەکەی دانا. (نووری سەفار)یش سێ دەفری سفری بە سەرقاپەی، بە دیاری پێشکەش کرد.

بە کورتی پێت بڵێم ئەگەر یەك تیپە سەرباز بچێ بیەوێ (زەمبووك زادە) دەستگیر بکا، بە چەك داماڵاوی دێتەوە. (زەمبووك زادە) هەموویان تەفرە دەدا:

- رۆڵە شیرینەکانم، فەرماندەی تیپەکەتان برادەرێکی دڵسۆزی منە پێی دەڵێم یەکەو پلە بە هەمووتان بدا.

بەم قسانە ئەوە هیچ چەکیان دەکا، شتێکیشیان بە ناوی بەرتیل لێ دەقاچێنێتەوە. ئەگەر پێمێرد بێو بیەوێ رۆحی ئەو کابرایە بکێشێ، بە پێڵاوی خۆی راناگا، بە لنگە پێڵاوێك رادەکا.

برا گیان، ئەو بێناموسە لە هیچ کوێی دونیا تاکی نەدیتراوەو نەبیسراوە. ئاگادار بە بەزی ئەو کابرایەت بە لەش نەکەوێ.

بە قسەکانی (ئەمین بازرگان) مەراقم چەند بەرابەر زیادی کرد بۆ بینینی (زەبووك زادە)... هەستێکی سەیر سەراپای گیانی داگرتم. چۆنی باس بکەم وەکوو هەستی گەنجێ وا بوو کە شەوی زاوایی بیەوێ بچێتە پەردە. یان وەکوو هەستی شاخەوانێك وا بوو کە بیەوێ بۆ دۆزینەوەی شتی پێش مێژوو بچێتە ناو ئەشکەوتێکی تاریك.

لەم نیشە، هەم دەترسمو هەم چێژی لێ وەردەگرم، بەڵام هەرچی دەبێ با ببێ... ئامادەم نارەحەتی قبوول بکەمو بە هەر نرخێ بێ دەبێ ئەو پیاوە لە نزیکەوە ببینمو ئەگەر بکرێ دەستو پەنجەیەکی لەگەڵ نەرم بکەمو تێی بگەیەنم پیاو دەبێ لەگەڵ مرۆڤی گەورە شەڕ بکا، نەك کڵاو لە سەر چەند لادێییو مرۆڤێکی ساویلکە بنێ...

بە حەولو قووەتی خوای بەم زووانە خەبەری سەرکەوتنی خۆمت بۆ دەنووسم.

# (7)

## (ئەو دیارییەی لە جێگایەکی گەورەوە هاتووە...)

بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە:

(زەبـووك زادە) ڕۆژانـی شـەممە دەهاتـە کۆبوونـەوەی مامۆسـتایانو چـەند سـەعاتێك قسـەی لـە بـارەی پێشـکەوتنی ولاتو ئـەو کارانـە دەکـرد کـە بـۆ شارۆچکەکەی کردووە، یان لە ئایندەدا پێویستیان بە کردنە

هەموو ئەنـدامانی وەزارەتـی پـەروەردە لـە دەست ئـەو پیـاوە قـۆڵبڕو جەلبـەزو فێڵبـازە وەزالـە گـەوتبوون. لـەوە زیـاتر توانـای بـەرگری درۆیـە شـاخدارەکانیمان نـەبوو. ئەوەنـدە بـەو شـێوازو جوولانـەوە تایبەتییـەی لـە کـاتی قسـە کردنـدا بـە خۆیەوەی دەگرت، نارەحەت دەبووین دەتگوت دەرزیمان لە دڵ را دەکەن.

هەمووومان دەمـانزانی ئـەو سـەگبابە لامەزەبـە چـەند بێناموسـە، بـەڵام نـازانم هۆی چییە کاتێ ڕوو بە ڕووی دەبووینەوە، دەممان دەبەستراو وەکوو چۆلەکە چۆن بەرامبـەر بـە مـار توانـای جوولانـەوەی نییـە، ئاوهـا ئـەنجامی هـەموو کـارێکی دەپووکاندینەوە.

ئاخر ئەو بێ دایكو باوکە قۆڵبڕەیش قسەی گەورە گەورە دەکا. بچووکترین قسەی باسی وەزیـرو وەکیلانـە. لە پارێزگـار بـە خـوارەوە، هەقی بەسـەر کەسـەوە نییە

کاتێ کە ناچار دەبێ ناوی سەرۆك دایەرەکان بێنێ، ئاوازی قسە کردنی ئەوەنـدە سەنگینو بێ ئەدەبانەیە دەڵێی خۆی ئەو پایەیەی پێداون.

رۆژێکی شەممە تاقەتمان چووو بڕیارمان دا لە یانە کۆببینەوەو هۆی ها لەو (زەبووك زادە) هیچو پووچە بکەین بۆ ئەوەی ئەقڵی بێتەوە سەر. جەنابی (ڕەزا)ی میرزای فەرماندار و (مەلا بەدری ئاقڵمەند)و (ئەمینی بازرگان)و جەنابی (ئیحسانی تەڤاویت)یشمان داوەت کرد. بە ڕێکەوت جەنابی (جووت بەدزادە)و جەنابی (مورتەزا)یش هاتن...بەڵام (زەبووك زادە) خەبەری نەبوو.

مەلا (بەدری ئاقڵمەند) گوتی:

- هاوڕێیە، ئێمە ئەگەر پێشی قۆنبڕینو درویەکانی ئەو بۆرەپیاوە نەگرین، بە تەواوی سوارمان دەبێ...

(ئەمین بازرگان) پشتگیری قسەکەی کرد:

- بەڵێ، ڕاستە... بەڵام وا مەزانن وەستان لە رووی، کارێکی ئاسانە!! دەبێ خودا خۆی پشتو پەنامان بێ...

جەنابی (ڕەزا)ی میرزای فەرمانداریش گوتی:

- هەر چی مۆڵەتێکی بدەین کار خراپتر دەبێ...وا چاکە هەر ئێستا مستێکی لە قەپۆزی بدەینو رسوای بکەین، بۆ ئەوەی چیدی چاوو رووی نەیێ بێتە ناو خەڵك.

(ئیحسان تەڤاویت)یش گوتی:

- ئەو بۆرە پیاوە بۆتە بەڵا بە سەرمانەوە. هەر رۆژە بە فێڵێك تەڵەکەبازی دەکا. رۆژێ، دەڵێ پارێزگار دێتەماڵم... جارێ وا بڵاو دەکاتەوە، نوێنەری دەوڵەت دێتە سەردانی بۆ ئەوەی لە بارەی کارو باری وڵاتەوە پرسی پێ بکا.

(هەمزە جووت بەدزادە) کە تا ئێستا بێدەنگ بوو، قاقا پێکەنیو گوتی:

هەر هەموو کاری ئە پیاوە تەلەکەبازییە... پێش چەند رۆژێ، منداڵەکانمان دیمەنێکی شانۆییان لی دیبوو. دوو سێ دانە کورسی لە بەر دەرگای ماڵەوە دادەنێو دادەنیشێ. ئینجا لە کاتێکا کە کەس لە کۆڵانێ نییە، بۆ فریودانی ژنو منداڵو هاوسێکانی، بە دەنگی بەرز دەڵێ:

- فەرموو فەرموو جەنابی فەرماندار... خێرو بەرەکەتتان هێنا جەنابی سەرۆکی داداگا... وەعەلەیکەسسەلام جەنابی سەرۆکی جەندرمە...

جەنابی (مورتەزا)، خوا سەلامەتی کا، بەبێ پێشەکی گوتی:

ئەگەر بێ، دەبێ دەرزێکی وای بدەم، تا ماوە لە بیری نەکا. لە بەر دەم هەمووتاندا، هەموو کارە پیس و پلۆخەکانی بە روو دادەدەمەوەو یەك تفی لە چارەی دەکەم تا هەموو هەموو گیانی شەلالی ئارەقە ببێ!

جەنابی میرزا (رەزا) هاتە ناو قسەی جەنابی (مورتەزا):

- ئاوها نابێ ...

- ئەی چۆن دەبێ؟

- باوکە گیان، ئەو (زەبووك زادە)ی من دەیناسم هەر روخسەتیش نادا ئێوە قسە بکەن. هەر هێندە بگاتە ئێرە، یەکسەر دەست بە قسەی پڕو پووچ دەکا ... لە هاتنی پارێزگارەوە تا داوەت کردنی سەرۆك وەزیران و فلان وەکیل و فلان وەزیر...

- باشە، منیش ئەودەم دەوێ. کە گەیشتە شوێنێکی ناسك مستێکی لە دوڕ دەمی دەدەم بۆ ئەوەی تا ماوە ئەم جۆرە کەڵەکبازی و قۆڵبڕینە نەکا. پێی دەڵێم:

- باشە، بۆرە پیاو تۆ شەرم ناکەی ئەم قسانە دەکەی، سەگباب، وا دەزانی خەڵك مێشکی کەریان خواردووەو باوەڕ بەو قسەقۆڕانەی تۆ دەکەن؟ تۆ توولە سەگی کێیت، تا سەرۆك وەزیران لە دووت بنێرێ... دەتەوێ کێ بەم قسانە فریو بدەی؟ ما ئێمە منداڵین، چییە؟!

(ئیحسانی تەقاویت) لە هەموویان زیاتر وروژا بوو، گوتی:

- ئەگەر دەتانەوێ من دوو زللەی لێ دەدەم... لە بەر چاوی ئێوە، دوو شەقازللەی وای لێ دەدەم، ئاگری لە چاوان بێ. رازین؟

- زۆر باشە.

جەنابی میرزا (رەزا) نارەزایی دەربڕی:

- من کارمەندی دەوڵەتم، دەبێ خۆم لە بگرەو بەردەو لێدانەی خەڵك بە دوور بگرم، ئێستا کوو بێم رازی بم ئێوە لە بەر چاوی خەڵك لە یەکێ بدەن؟! من لە دڵەوە رازیم بەڵام ئەگەر بەشداری بکەم، دەبێ بە مایەی دەردەسەری. (زەبووك زادە) دەچێ لای لێپرسراوانی وەزارەت شکاتم لێ دەکا، ئەوسا ناچار دەبم بە دەستی خۆم بیخنکێنم.

کە ئەوانی تر ویستیان وەڵامێکی بدەنەوە، (زەبووك زادە) لە دوورەوە دەرکەوت. هاورێکان قسەیان بڕیو وەکوو راوچی کە روزی بەفرو سەرما لە پشت تەپۆلکەیەك خۆی لە کەمین دەنێ بۆ ئەوەی نیچیرێ بە تەلەکەیەوە ببێ، خۆیان بۆ ئەو نێچیرە ئامادە کرد. (ئیبراهیم زەبووك زادە) هات. سەڵامی کرد:

یەکسەر بوو بە بێدەنگییەکی کش و مات. (ئیحسانی تەقاویت) بە مەلا (بەدری ئاقڵمەند)ی گوت، کە لە تەنیشتی دانیشتبوو:

- هەستم دوو شەقا زللەی لێ بدەم، یان نا؟

مەلا (بەدری ئاقڵمەند) وەڵامی دایەوە:

- ئێستا سەبر کە، بزانم چ دەبێ. ناگرێ بە بێ پێشەکی لە یەکێ بدەی. با دەست پێ بکا، ئینجا...

(زەبووك زادە)، بێ ئەوەی کەس پرسیاری کردبێ، یان قسە قافی هاتبێ، دەستی پێ کرد:

- ئەوانەیش گاڵتە بە من دەکەم. بەردەوام خەبەر دەنێرن: دێینە لات. بەڵام رۆژەکە دیاری ناکەن. من ناچارم هەموو رۆژێ خۆم بۆ هاتنیان ئامادە بکەم. بڕیارم داوە سبەی خەبەریان بۆ بنێرم ئیتر پێویست ناکا بێنە ماڵمان...

جەنابی (هەمزە جووت بەدزادە)ی سەرۆکی شارەوانی قسەی بە (زەبووك زادە) بڕی:

- (ئیبراهیم گیان)، دیسان کێ دەیەوێ بێ؟ پیمان بڵێ. با ئێمەیش بزانین.

- کاکە، هیچ کەس... لە ئەنقەرە نامەیان نووسیوە دەستەیەك دەیانەوێ بێنە ئێرە. چەند نەفەرنو کەی دێن؟ دیار نییە. دەیانەوێ بێ خەبەردان بێن، بە خەیاڵی خۆیان وا دەزانن غافڵگیرم دەکەن. بەڵام نازانن دەستە پاچەن... هـ..هـ..هـ..ی ئەگەر سەد کەسیش بن، بە چاوتروکانێك سفرەیان ئامادە دەکەم.

(ئەمین بازرگان) بە گاڵتە گوتی:

- (ئیبراهیم بەگ)، مەگەر پاشای فەرەنگ دەیەوێ بێتە ماڵت؟چییە؟

(رەبووت زادە) بە خوێن ساردی نامەیەکی لە گیرفانی دەرهێناو بۆ لای (ئەمین بازرگان)ی راداشت:

(ئەمین بازرگان) هەر هێندە چاوی بە نامەکە کەوت، چاوو برۆی کەوتنە سەما... دەتگوت چاوی خەریکە لە قەپێلك دێتە دەرەوە. ئینجا نامەکەی دایە (ئیحسانی تەقاویت)... دەزانی (ئیحسان بەگ) تووشی چ حاڵەتێك هات!! وەکوو سەربازێ لە بەردەم ئەفسەرەکەی وەستا بێ، هەموو گیانی بوو بە نەشتەر. ئەوەندەی نەما بوو هەستێ سەڵامی سەربازی وەربگرێ...

(ئیحسانی تەقاویت) بە رێزەوە نامەکەی دایە من. وەرم گرتو دەستم بە خوێندنەوەی نامەکە کرد. لەپڕ دەستم لەرزی.. لە سەرەوەی کاغەزەکە بە خەتێکی زۆر خۆش نووسرا بوو: (ئەنجوومەنی گەورەی میللی تورکیا). بێ دەستی خۆم تەماشای مۆری نامەکەم کرد. (سەرۆکی لیژنەی داواکارییەکانی ئەنجوومەنی گەورەی میللی تورکیا).

بە جۆرێ هەموومانی خستبووە ژێر کاریگەری خۆیەوە، نەماندەتوانی ماوەیەکی زۆر نامەکە لای خۆمان گل بدەینەوە چونکە نەفەری دواوە بە بێ سەبری چاوەڕێی خوێندنەوەی نامەکەی دەکرد. منیش نامەکەم دایە دەست (مەلا بەدری ئاقڵمەند)...

(زەبووك زادە) گوتی:

- هاوڕێی دڵسۆزمە.

ئەو قسەیەی وەکوو تۆپ لە ناو دانیشتنەکەماندا دەنگی دایەوە... ئەمان...سەیر کە کابرا هاوڕێی چۆنی هەن!! دوای ئەوە قەت دەکرێ لە رووی (زەبووک زادە) بوەستین!؟

(ئەمین بازرگان)و (جووت بەدزادە) خەریك بوون ئاماژەیان بە یەك دەدا. ئەم ئاماژەی بەو دەدا ، یاللا دەست پێ کەو ئەو بەمی دەگوت تۆ یەکەم جار دەست پێ کە. من دوای تۆ دێم.

دوای ئەوەی نامەکەیان دی، کێ رات دەکا قسە بکا؛ (مەلا بەدری ناقتمەند) لە شوێنی خۆیەوە تەکانێکی داو بە لارو لەوێری دانیشت... کۆکەیەکیشی کرد... ویستی دەمی بکاتەوە، پۆستەچی لە دوورەوە هاتو سەلامو عەلێکێکی دوورو درێژی کردو یەکسەر چووە لای (زەبووک زادە)و بەستەیەکی لە بەر دەم داناو گوتی:

- جەنابی (زەبووک زادە)، نامەیەکت بۆ هاتووە.

(زەبووک زادە) رووی گرژ کردو گوتی:

- دیسان لە کوێوە هاتووە؟

- بەخوا نازانم... چوومە ماڵتان. گوتیان لێرە نییە. لەبەر ئەوەی کاغەزەکە زۆر پەلەیە، لێرە هێنامە خزمەتتان.

- من چاویلکەم نەهێناوە، بیخوێنەوە بزانم کێ ناردوویەتی؟

(ئیحسانی تەفاویت) دەستی دایە زەرفەکەو وەکوو یەکێ ئاگری بە دەستەوە گرتبێ وەزعی تێکچووو بە منگە منگ گوتی:

- وەزیری کشتو کاڵ لە ئەنقەرە ناردوویەتی...

(زەبووک زادە) بزەیەکی هاتێ:

- باوکم، وازی لێ بێنە... گوتم بزانە داخۆ کێیە ئەوەندە بە پەلە پەل نووسیویەتی... دیارە دیسان، رەحمەت لە باوکی، ئێمەی بیر کەوتۆتەوە. پیاوێکی باشە...

(زەبووك زادە) لیرەیەكی دایە پۆستەچی:

- زەحمەت نەبێ ئەم بەستەیە ببەوە ماڵێ.

كەس هەناسەی لە بەر نەدەهات. دەتگوت سیحری لە هەموویان كردووە.
(جووت بەدزادە) وەكوو گورگی ئەنگاوتە پێچی دەخواردەوەو بە پستە پست بۆڵ بۆڵی دەكرد:

- تەماشای ئەو دەییووسە قۆڵبڕبابە بكە چۆن خۆی بە چاك دادەنێ! ئاخر تۆ دوری كێی یا وەریری كێتو كاڵ یادت بكا؟

پۆستەچی ویستی لە دەرگاوە دەربچێ، (زەبووك زادە) بانگی كرد:

كورە، راوەستە بزانم... بەڵكو خواردنی تێدا بێ..! گوا بیكەوە! ئەگەر خواردنە بۆچی بیبەیتە ماڵەوە... عەیبە.

داوی بەستەكەیان كردەوە. قووتووە چوكلاتێكی نایابی تێدا بوو. كارتێكیشی لە بان بوو.

(زەبووك زادە) گوتی:

- (ئیحسان بەگ)، من چاوم باش نابینێ... كارتەكە بخوێنەوە، بزانم چی تێدایە...

(ئیحسان) كارتەكەی وەرگرتو خوێندییەوە:

- (برای ئازیز جەنابی (ئیبراهیم زەبووك زادە)، ئێستا كە تۆ لە ئەنقەرە دووری، پێم حەیف بوو بە تەنیا ئەم چوكلاتە بخۆم. پێش دوو سێ رۆژ، هاورێیەكم لە دەرەوە ئەم چوكلاتەی بۆ ناردم. بە بێ تۆ لە گەرووم نەچووە خوارێ...قوتوویەكم بۆ ناردی بۆ ئەوەی دەمت شیرین ببێو لەمەودوا لە نامەكانتا ئەوەندە قسەی تفتو تاڵمان پێ نەڵێی. ئەو نامەیەی حەفتەی پێشوو ناردبووت، نیشانی جەنابی سەرۆك وەزیرانم دا . فەرموویان: دەبێ كارەكەی هەر پێك بێنی، با نارەحەت نەبێ. جەنابی سەرۆك وەزیران نەختێ لێت رەنجاوە چونكە ماوەیەكە

نامەت بۆ نەنووسیوە... دەبێ نامەی هەر بۆ بنووسی. ئەگەر کاتت بە دەستەوە نییە نامە بنووسی، بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ بکە.)

ئەوانەی لەوێ بوون لە سەرسامییان هەر چاوێکیان بوو بە چوار چاو.

- ئەو کوڕەی (زەبووك زادە) کێیە وەزیرەکان نامەی وای بۆ بنووسن.! سەرۆك وەزیران لێی بڕەنجێ.!

(زەبووك زادە) چوکلاتەکەی پێشکەش هاوڕێکان کرد:

- فەرموون ناوەکەی شەربەتی تێدایە... فەرموون بیخۆن... گرەگرەکانی وڵات شتی باش دەخۆن...

کاتێ کە پۆستەچی چووە دەرەوە، (ئیحسان تەفاویت)، کە لە تەك (زەبووك زادە) دانیشتبوو، دەستی بە پستە پست کرد لە بن گوێی. من بە باشی گوێم لە دەنگی بوو:

- کاکە (ئیبراهیم خان)، ئێمە لە تۆ بەولاوە کەسمان نییە... لە تۆ پێوە کێ ئامادەیە بەرگریمان لێ بکا؟ جەناب، عەرزت بکەم من ئێستا بیستو نۆ ساڵە لەم وڵاتە رەنج دەبەمو زەحمەت دەکێشم. کاتێ کە (تەفاویت بووم)، لە بەر چاوی خۆم هەقیان خواردمو خواردیان...سێ ساڵ خزمەتیان لە بن پێ نام. بەم کارە دەڵێن چی؟ تۆ بڵێ. ئایا دەزانی چەندم راگە راك کرد.؟! جێگا نەما سکاڵای بە بەر نەبەم... بەڵام کێ گوێ دەداتێ؟ کەس وەڵامی نەدامەوە. دەمەوێ بزانم ئایا خودا قبووڵ دەکا هەقی بابایەکی غەریبو پیرەمێرد بخۆن؟! ئاخر بۆچی؟ لە بەر ئەوەی سەر بە هیچ پارتێك نیم. خۆڕا نییە گوتوویانە: (زللەیکیان لە بنا گوێی هەتیوێك دا، گوتی ئای پشتم!) لێیان پرسی: یانی چی؟ بنا گوێ چ پەیوەندی بە پشتەوە هەیە؟ وەڵامی دایەوە: ئەگەر پشتم هەبوایە، نەدەوێران زللە لە بنا گوێم بدەن...

- جەنابی (ئیبراهیم)، ئێوە بە لانی کەمەوە بەو پایەیەی هەتانە وەزیرو وەکیلەکان دیاریتان بۆ دەنێرن. شتێکم بۆ بکە. بەخوا ئێمە هەمووومان شانازی بە ئێوە دەکەین... ئاخر گاڵتە بەسسە... لەوەتی دیموکراتی هاتۆتە وڵاتەکەمان،

وەزیرەکان قوتووە چوکلاتیان بۆ کێ ناردوە؟ ئەوانە هەموویان دەستیان قرِساوەو دیاری پێشکەش کردن ئیشی ئەوان نییە. جا بزانە چ حیسابێك بۆ تۆ دەکەن کە دیاریت بۆ دەنێرن! جەنابی (ئیبراهیم)، تۆ باش دەزانی من کابرایەکی چاپلووس‌و مەراییکەر نیم‌و بۆ خۆ خۆشەویست کردن ئەم قسانە ناکەم. راستی دەڵێم... تۆ یەکێکی لەوانەی دەبێ پەیکەرت بۆ بکەن...

ئێستا برام، دەتوانی چارەیەکی دەردی من بکەی؟ بە خێری منداڵەکانیشت بێ تەحسیری مەکە...

خەریك بوو لە چاپلووسی‌و دووڕوویی (ئیحسان تەقاویت) دیق بکەم. کەس نییە بەو کابرایە بڵێ: (ناپەسەندی‌و بێ شەرمیش سنووری هەیە..)

پێش چەند دەقیقەیەك دەیگوت: ئەگەر روخسەت بدەن دوو شەقا زللە لەو بێناموسە دەدەم... ئیستایش خۆی بە سەدەقە دەکاو خۆی قوربانی منداڵەکانی دەکا. تف چرووکی سەگباب.

(زەبووك زادە) دەستێکی بە پشتی (ئیحسان تەقاویت) دا هێنا:

- برا، ئەمە هیچ نییە...وا دانێ تەواو بووە... بەڵام هەر کاتێ دەرفەتت بوو، سەرێ لەماڵەوەمان بدە...بۆ ئەوەی شتەکان بنووسمەوە. ئەوەی تری لە سەر من. مرۆڤ کە بیەوێ پارە بدا، هەموو شتێ پێك دێ. لەم وڵاتەدا، شەرەف‌و ویژدان‌و رەوشت یانی پارە... چ دەکەی برا، ئەوە ئەوهایە!! ئەمرۆ بەرتیل حاکمی رەهای ژیانمانە.

(ئیحسان تەقاویت) بە دوودڵی گوتی:

- ئەم ئیشە چەندی تێ دەچێ؟ مەسەلەیەکی باوە دەڵێن: ( بەر لە پشت گرانتر نابێ.)

(زەبووك زادە) ئەوەندە تووڕە بوو، دەتگوت جوێنی ناموسیان پێداوە. بە دەنگێکی گلەیی ئامێزەوە گوتی:

- (ئیحسان بەگ)، من چاوەڕێی ئەو قسانەم لە تۆ نەدەکرد! تۆ لە نزیکەوە شایەتی‌و دەبینی من پارەو ژیان‌و عومری خۆمم بۆ هاوڕێکان تەرخان کردووە، ئینجا دێی قسەی وا دەکەی!؟ بە راستی ئافەرین بۆ تۆ...!!

- (ئیحسان تەقاویت) بە خەجاڵەت‌و شەرمەزاریی، دەستی بە تەوازۆ هێنانەوە کرد:

- داوای بوردن دەکەم جەنابی (ئیبراهیم)، بەڵام ئێوە کە ئەو هەموو زەحمەتە دەکێشن، خۆ نابێ مەسرەفەکەیش لە گیرفانی خۆتان بدەن ؟

- چ دەبێ ئەگەر بۆ خاتری هاوشارییەك چەند (دینارێك) بەرتیل بدەم؟ هەموو ژیانی من هی هەژارانە...تۆ بە سەر پێیی سەرێك لە ماڵی ئێمە بدە، هەقت بەسەر ئەوەی تردا نەبێ...

(ئیحسان تەقاویت)، کە کەوتبووە ژێر ئەو هەموو گەورەیی‌و ئاغایەتییەی زەمبووك زادە، بێ دەستی خۆی ئیکلامی کێشاو گوتی:

- رەسەنایەتی بنەماڵە شتێکی ترە.! ئێوە لە سەر سفرەی باوکتان گەورە بووین. پارەو سامان‌و ماڵی دونیاتان بە لاوە پوولێك ناهێنێ...

وای گوت‌و هەستا چووە ئەو سەری هۆڵەکە. (ئەمین بازرگان) دەتگوت دەمێکە چاوەڕێی تەواو بوونی قسەی ئەوان دەکا، وەکوو برووسکە چوو لە تەك (زەمبووك زادە) دانیشت. ئەویش ئیشێکی هەبوو. جا کەس هەیە ئیشی نەبێ؟! دوای ئەویش (مەلا بەدری ئاقڵمەند) ئیشی خۆی پێ گوت. من لە دڵی خۆمدا گوتم: (هەی بێناموسی سەگباب، ئیشی سەرەکی لای منە، دەردو ئازار لای منە! لێناگەڕێن من بچمە پێش‌و دەردی خۆم بە (زەمبووك زادە) بڵێم.) ماوەیەکە دەمەوێ رەزامەندی دۆزینەوەی کانزایەك وەر بگرم‌و لە مامۆستایەتی‌و شەڕەشەقی منداڵان بحەسێمەوە... بچم تەمەنێك لە ئوتێل‌و سەیرانگاکانی دونیا گەشت‌و گوزار بکەم.

ئاخیری نۆرەی من هات... مەسەلەکەم بۆ (زەمبووك زادە) باس کرد... هێشتا نیوەی قسەم مابوو، لە جێی خۆی هەستا:

- روخسەتم بدەن مرەخەس بم، کارێکی پێویستم هەیە... بەڵام ئایا من لێ گەڕام بڕوا؟! منیش دەبێ قسەی خۆم بکەم. بازووم گرتو دامنایەوە. مەسەلەکەم هەموو بۆ باس کرد. پێکەنیو گوتی:

- چ ئیشێ لەوە باشتر هەیە!! سەرچاوەیەکی داهات بۆ شارۆچکەکەمان دروست دەبێ. چما ئەو سەگبابانەی لە دایەرەکان دانیشتوون ئەم شتانەیان بە مێشکدا دەچێ؟ چما قەت بیر لە زیاد کردنی داهاتی وڵات دەکەنەوە؟ ئەوان تەماشای دەستی مرۆڤ دەکەنو بەس، بەرتیل بدەی، ئیشت دەڕوا، بەرتیل نەدەی هەر گوێش لە قسەت ناگرن. بچیتە هەر دایەرەیەك، دەبێ پارە لە دەلینگی شەڵوارت بڕژێ. راستیان گوتووە: (لە ئاخیری زەمانی نامووسو غیرەت نامێنێ. ئەگەر یەك کەسی بە شەرەفو ویژدانیش بمینێ، رەوانەی شێتخانەی دەکەن... هەموو کەمو کورتییەکە لەوانەی سەرەوەیە. نەتبیستووە گوتوویانە: (ماسی لە سەرییەوە بۆگەنی دەبێ نەك لە کلکی.)

گۆم کەوتبووە بەر قاشۆ. زانیم مەبەستی چییەو دەیەوێ چ بڵێ. چاوێی دەرفەتێکم کرد بۆ ئەوەی (بەرتیل)ی پێ بگەیەنم.

بە رێکەوت ئەو دەرفەتە زوو رەخسا. بینیم لە گیرفانەکانی بە دوای ئاغزە جگەرەدا دەگەڕێ! یەکسەر هەزار لیرەییەکم لە ناو پاکەتی جگەرە ناوو پێشکەشم کرد.

- با ئەم پاکەتەتان لابێ. من پاکەتێکی ترم هەیە.

ئاخیری (زەبووك زادە)م بە رێ کرد. رۆیشت. من گەڕامەوە یانە... جەنابی (مورتەزا) باسی مرۆڤایەتی دەکرد: (راستیان گوتووە بنیادەم شیری خاوی خواردووە. بابە، ئەو هەمووخزمەتەی ئێمە دەکاو ئێمەیش قەدری نازانینو پاش ملە قسەی لە سەر دەکەین. ئەمە لە ئینسانییەت دوورە. خوا پێی خۆش نییە زەحمەتی خەڵك بە هەند هەڵنەگرین.)

ئامادەبووان قسەکەیان پشت راست کردەوە:

- بە ڕاستی وایە!

- ڕاستە!

- بەڵێ، ئێمە ڕەوشتمان تەواو نییە!

- پیاوی وەکوو (زەبووک زادە) لەم وڵاتەدا نەبووەو نابێ! کابرا وەلییە...

دەتگوت هەموومان پێشبڕکێمانە لە سەر پیاهەڵدانی (زەبووک زادە). هەر کەسە هەوڵی دەدا بەرزتری بکاتەوە.

دوو سێ ڕۆژ دوای ئەوەی هەموومان هەق و حیسابمان لەسەنیم بە (زەبووک زادە) کردو ڕەوانەی ئەنقەرەمان کرد بۆ ئەوەی نیشەکانمان پێک بێنێ، چاوەڕێ و ئومێدەوار لە یانە دانیشتبووین، (ئەمین بازرگان) وەك بەرازی پێکراو لە دەرگاوە خۆی کرد بە ژووری.

- بابە، ئەمە چ بێناموسێکە! چ سەگبابێکە! خەتای خاکی ئەم شارۆچکەیەیە کە بێناموسی وا پەروەردە دەکا. ئەو هیچ و پووچە ئابڕووی بردووین و لای هەموو عالەم ڕووی ڕەش کردووین. ئیتر زات ناکەین لای هیچ کەس بڵێین خەڵی فلانە شارۆچکەین... ئەگەر لەو سەری دونیاش خۆمان بناسێنین، دەڵێن هی وڵاتی (زەبووک زادە)ن و یەکسەر شار بە دەرمان دەکەن! نازانین تەگبیر چییە لەگەڵ ئەو هیچ و پووچە؟

ئەوەندەی دەمەویست گرێ بکەمەوەو بزانم مەسەلە چییە، بواری نەدەدا. خۆم هەڵکوتایە ناو قسەکانی و پرسیم:

- جەنابی (ئەمین)، چ بووە؟ چ هەیە؟

- ئیتر دەتەوێ چ بێ ...

ئەم قۆڵبڕە بێ دایك و باوکە کڵاوی لە سەری هەموومان ناوە...

- ئاخر مەسەلە چییە؟

- ئەمڕۆ خەریك بووم قسەم لەگەڵ لێخوڕی ماشینی پۆستە دەكرد، قسە هاتە سەر (زەبووك زادە)... لێخوڕەكە پێكەنی. پرسیم بە چ پێدەكەنی؟ یەكەم جار ویستی نەڵێ، بەڵام كە پێمداگرت، گوتی:

- حەفتەی پێشوو، (زەبووك زادە) لە دووی ناردم گوتی وەرە كارێكی گرنگ گرنگم هەیە. چووم بزانم چ دەڵێ. فووتوویەكی دامێ ناوو ناونیشانی خۆی لە سەر بوو. گوتی: ئەم فوتووە لە ئەنقەرە بخەرە پۆستە با لەوێوە بێ.

كە ویستم ناڕەزایی دەربڕم: ئاخر ئەمە چ كارێكە؛ دە بیرەییەكی لە ناو دەستم نا. ئێمەیش پیاوی فزوولی نین... چ پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە چی تێدایە؟ و بۆچی كابرایەك دیاری بۆ خۆی رەوانە دەكا؟ ئێمە ئەوەندە خێرەمان پێ بڕا بەسسە. ئەوەی تر پەیوەندی بە ئێمەوە نییە...

گۆم كەوتە بەر قاشۆ تومەز دیاری سەرۆك وەزیران ئەو فوتووە چوكلاتە بووە. بیری لێ بكەوە، شتی وا بە ئەقڵی ئەجنەدەیش دانایێ. سەیر كە كەچرەفتاریو حەرامزادەیی گەیشتۆتە كوێ؟!

بێ شەرەفی لە هەمووی گەورەتر ئەوەیە هەموومانی خاپاندو هەقو حیسابێكی باشی وەرگرتو بۆی دەرچوو.

(ئیحسان تەقاویت) وەكوو گەچی مردە داچەكابوو:

-بە راستی ئێمە زۆر گێلین! دیتت چۆن تەفرەمان خوارد؟!

ئاخر ئەم (زەبووك زادە) چ (...)ێكە كە سەرۆك وەزیران بۆی بنووسێ: (هەر ئەمرێكت هەیە بڵێ، تا یەكسەر جێ بە جێی بكەم!). ئێمە چەند گەر بووین كە باوەڕمان بەو قسانە كرد. بە راستی ئەگەر ناوی خۆمان بنێین (كەر)، سووكایەتی بە (كەر) دەكەین....

منیش ئەوەندە تووڕە ببووم، ئەگەر چەقۆت لێ دابام، خوێنم لێ نەدەهات. دەردی خۆم بە كێ بڵێم؟ كێ باوەڕ دەكا من هەزار لیرەم بەو بێناموسە داوە؟ ئەگەر وام گوتبا گاڵتەیان پێ دەكردم. دوو سێ ساڵ خۆم گوشی و لە دەمی خۆمم

گرتەوە تا ئەو هەزار لیرەیەم کۆکردەوە، ئێستا (زەمبووك زادە) خەریکە بە پارەی من لە ئوتێلەکانی کەناری دەریا کەیف دەکا...

سەیرم کرد ئەگەر لە یانە بمێنمەوە، تووشی دڵەوستە دەبم. لە یانە هاتمە دەرەوەو دامە کێوو بیابان. بەڵام فایەی چییە خەفەتخواردن بۆ من پارە ناکا. چاوم دەرێ ئەگەر جارێکی تر هەڵبخەڵەتێم. هەر چەندە من سووچم نەبوو.

جەناب، هێشا زۆری ماوە ئەو خەڵکە (زەمبووك زادە) بناسن. لە هەموو دونیادا هیچ دایكو باوکێك منداڵی وا ناجسنو قۆلبڕیان لێ بە پاش نەکەوتووە!

بە بیستنی ئەم چیرۆکە مات بووم. بینینی پیاوێکی وا بۆ من لە هەموو شتێ گرنگترە... هەست دەکەم چەند پێویستم بە ئاوو هەوا هەیە، چاو پێکەوتنی ئەو پیاوە بۆ من ئەوەندە پێویستە. لە پەنجەرەوە تەماشای لای تەپۆلکەکانی هەوراز شارۆچکەکەم کرد. سەگنی ماشینەکە خەریك بوو بەستەی رۆژنامەی لە سەر باسەکە فڕێ دەدایە خوارێ. تۆ نازانی خوێندنەوەی رۆژنامە لێرە چ تامو چێژێکی تێدایە! ئەمەیش شتێکی ئاساییە. مرۆڤ زیاتر ئارەزووی ئەو شتە دەکا کە نییەنی. وەکوو دەڵێن: (تۆ کە لە سەر فوراتی، چ قەدری ئاو دەزانی؟) لێرە، حەفتەی دوو جار، پۆستە دێو رۆژنامە دێنێ، رۆژی شەممەو رۆژی پێنج شەممە. ئەگەر چی رۆژنامە چوار رۆژ دوای دەرچوونی بە دەستم دەگا، لەگەڵ ئەوەیشدا، هەموو لاپەڕەکانی بە چێژەوە دەخوێنمەوە.

لەگەڵ ئەو هەموو بێبەشییەشدا، پێم باوەڕ بکە ئەگەر بڵێم ئێرەم زۆر خۆش دەوێ... هەست دەکەم بە شێوەیەکی سەیر چارەنووسم بەم شارۆچکەیە بەسراوەتەوە. لە ئایندەدا ، کە لام روون نییە، کارێکی زۆر ئەنجام دەدەم. چیرۆکی قۆلبڕ دەبێ بە سەرگەرمییەکی باش بۆ رۆژانی دوورو درێژی بەر دەمم.

داوای سەرکەوتنت لە خوا دەخوازم. بەم زووانە دەنگو باسی گرنگت بۆ رەوانە دەکەم.

بە قوربانت بم.

# (8)

## (سێ جوانی یەك لە یەكی جوانتر..)

(رەزا بەگ)ی مـیرزای فەرمانـداریش كـە زانـی مـن حـەز لـە كارەكـانی (زەبـووك زادە) دەكەم، ئەم چیرۆكەی بۆ گێڕامەوە:

- جەنابی مامۆستا، شارۆچكەكەمانت چۆن دیوە؟ حەیف بۆ ئەو هەموو دیمەنـە جوان‌و ئاوو هەوا خۆشەی كەوتۆتە ئەم گۆشەیەی دونیا. ئەگەر شارۆچكەكەمان لـە وڵاتێكی بێگانە بوایە، ئەوسا بزانە چ سەرو سەدایەكیان بۆ دەنایـەوە!؟ چ ئـوتێلێكی لێ دروست دەكراو چ تەلارێكی دە نهۆمی لێ قیت دەكرایـەوە؟! بـاوەڕ ناكـەم دیمـەنی جوانی وەكوو شارۆچكەی ئێمە لە هیچ شوێنێ هەبێ. بەڵام لە بەر ئـەوەی شـارەكە هی ئێمەیە هەر وازی لێ بێنـە!! نـە كـەس تەماشـای دەكـا، نـە دینـارێكی لێ سـەرەف دەكەن. ئەوە هیچ كە پێش ناكەوێ، رۆژ بی رۆژ خراپتریش دەبێ!...

ئێ، لەگەل ئەوەشدا هەر بستێكی بۆ ئێمە یەك ملیـۆن دێنـێ. رۆح‌و لـەشمان بـە جۆرێ لەگەڵ ئەم ئاوو خاكە را هاتووە، ئەگەر یـەك حەفتـە بچینە سـەفەر، دڵمـان بۆ هەڵدە قرچێ‌و خۆمان پێ راناگیرێ. تەنیا جاروبار ئەو (زەبووك زادە) سـەگبابە دەبێ بە مایەی نارەحەتی خەڵكی ئەم شارە. ئەگەر بەڵای ئەو، لە كۆڵ خەڵكی ئـەم شارۆچكەیە ببێتەوەو گۆڕ بە گۆڕ بچێ، ئێمە ئیتر هیچ غەممان نییە...

هەڵبـەت باسـی كارەكانیـت بیسـتووە؟ سـەگبابی وا وا لێ كـراو نـاوی گەیشـتۆتە حەفت ئیقلیم. ئێمـە لـە بـەر ئـەوەی كارمەنـدی دەوڵـەتین، هـەر بـیرو باوەڕێكمـام هەبێ، ناچارین لە ترسان دەوری رەزا بوون لـە دەوڵـەت بگێـڕین‌و هـەواداری پـارتی

دەوڵەت بین. بەڵام ئەوانەی کاری ئازادیان هەیە، هەندێ کەسی وایان تێدا هەیە، وەکوو (غەدیر بەگ)، لەگەڵ خۆیشیان بەر هەڵستن. بەر هەڵست کردنی هەموو شتێ لە لایان بۆتە خووو خدە. ئەو (غەدیر بەگ)ە ساڵەهای ساڵ لە ناو پارتی بەرهەڵست خەباتی کرد. تووشی زۆر تەنگو چەلەمە بوو... زۆر رەنجی برد تا پارتەکەی ناوو دەنگێکی پەیدا کرد. بەڵام هەر هێندە پارتەکەی گەیشتە دەسەڵات، (غەدیر بەگ) یەکسەر ئیستیقالەی داو چووە ناو پاتی بەرهەڵست! کاتێ ئەو خەبەرەم بیست، پێم گوت:

- ئاخر کابرا، تۆ دەزانی چ دەڵێیو چ قسەی دروست دەکەی؟ ئەو هەموو زەحمەتەت کێشاو بە خەرج دا بۆ ئەوەی پارتەکەت بە دەسەڵات بگا، بەڵا نەما بە سەرت نەیێ، ئێستا بەرهەڵستکاران دێنە ناو پارتەکەی تۆ بۆ ئەوەی کیسەیان پڕ بکەن، ئەو ئیشە چ بوو تۆ کردت.؟

دەزانی چی گوت؟ وەڵامی دایەوە:

- سەگی زەرد برای چەقەلە.

بە کورتی: بەر هەڵستی بۆتە بەشێکی سروشتو خووی ئەو کابرایەو زەهری بەرهەڵستکاری چۆتە ناو پێستەو دەماری... ئەم (غەدیر بەگ)ە کوڕی نییە بەڵام بەرامبەر بەوە خودا یەك لە سەر یەك کچی پێ دەدا. ناوی کچی یەکەمی نا ( یەك دانە - تاقانە) بە خەیاڵی ئەوەی منداڵەکانی دوای ئەو کوڕ بن. کە منداڵی دووەمیشی هەر کچ بوو، ناوی نا (دوڕدانە).. دڵنیا بوو هەڵبەت منداڵی دوای ئەو کوڕە، بەڵام سێیەمیش کوڕ نەبوو. ناوی سێیەمی نا (گوڵدانە).

دوای ئەوە کارەکەی راگرت. چونکە دختۆرێکی خۆیی پشکنیو گوتی:

- تۆ میزاجت ساردە، منداڵەکانت هەموو کچ دەبن...

کچەکان رۆژ بە رۆژ گەورەترو جوانتر دەبوون...دڵبەری وا لە مولکی عەجەم پەیدا نەدەبوو...

جارێکیان دورمانکەرێکی ئەستەنبۆلی هاتە ئێرە. بە راستی ئەگەر رەوشتی لەگەڵ خەڵکی شارۆچکەکەمان رێك بوایە، ئیشو کاری باش دەبووو دەیتوانی سوودێکی باش وەر بگرێ. بیستبووی پارە لە شارۆچکەی ئێمە رژاوە، هاتبوو پارە خڕکاتەوە. بە راستیش ئەگەر بارو دۆخی لەگەڵ خەڵکی شارۆچکەکەمان بگونجایە، ئیشو کاری باش دەڕۆیشتو سوودێکی باشی وەردەگرت.

بەڵام هەر لەگەڵ یەکەم چاوپێکەوتنندا، لە زەوقی خەڵکەکەی دا. سیمای وەکوو سەماکەران وا بوو. کراسی چوار ئەنگوست لە سەرەوەی ئەژنۆی بوو. کە دەهاتە جادە، گەنجەکان دەکەوتنە دووی‌و بە ئەنقەس داوی تەسبیحی خۆیان دەپساند بۆ ئەوەی دانەکانی بە سەر زەوی وەر بىن. ئینجا دادەهاتنەوە و بە بیانووی کۆ کردنەوەی دانەکانی تەسبیحەکە تەماشای شلکەرانی خانمیان دەکرد. ئەگەر لە ترسی فەرماندەی جەندرمە نەبوایە، گەنجەکان هەر رۆژی یەکەم، خانمی دورمانکەریان لە ناوەندی کۆڵانێ دەرفاندو دەیانبردە چیا.

بەم بارو دۆخە، کەس ئامادە نەبوو ژن‌و کچی خۆی رەوانەی لای خانمی بەرگدروو بکا. ئەندەی نەمابو ژنەکە جل‌و جۆری خۆی کۆ کاتەوەو بڕوا کە (غەدیر بەگ) دیسان بەر هەڵستکارییەکەی بووژایەوە. هەستا هەر سێ کچەکەی رەوانەی لای خانم کرد بۆ ئەوەی فێری دورمان بىن.

کچەکان، بە ماوەی چوار مانگ، بوونە وەستای وا هەر مەپرسە! هەر دە پەنجەیان هونەری لێ دەڕژا. بووکی هونەرمەندی ئەستەنبۆلی لە چاو ئەوان هیچ نەبوو. دورمان‌و نتراندن‌و گوڵچنین‌و ئاوریشم دۆزیی... هەرچی بڵێی دەیانزانی...

ئەو جلانەی بۆ خۆیان دروو بوو خەڵکی شارۆچکەکەی سەراسیمە کردبوو... خەڵك بە پیرو گەنج‌و بە ژن‌و پیاوەوە دەستە دەستە دەچوونە تەماشای جلەکانی ئەو سێ خوشکە. هیچ کەس تا ئێستا جلی وای نەدیبوو. کت‌و مت ژنی ئەستەنبۆلی‌و بگرە لەوانیش باشترو جوانتر بوون.

ئێ، ئیتر ئاشکرایە کچی وا خشکۆك‌و هونەرمەند بە گەنجی شارۆچکەکە رازی نابن. هەر گەنجێ دەچووە داخوازییان، (غەدیر بەرهەڵست) دەیگوت:

- کچەکانی من مێردی نوێخوازیان دەوێ! ئینشاللا دەچنە ئەستەنبوڵ‌و بە مرازی خۆیان دەگەن.

جەنابی غەدیر هەر بە راستی حەزی دەکرد کچەکانی رەوانەی ئەستەنبوڵ بکا، بەڵام پارەی نەبوو.

بە کورتی درێژەی نادەینێ... کچەکان، تەنانەت نە هەرێمەکانی نزیش داخوازیکەری باشیان هات، بەڵام مامەڵەکە سەری نەگرت. کچەکان، تەمەنیان گەیشتە بیست‌و بیست‌و پێنج ساڵ‌و سی ساڵ... کچەکانی هاوزێ ئەوان بوونە خاوەن منداڵ، کەچی ئەوان هێشتا هەر لە چاوەڕوانی بەختی ئەستەنبوڵی، باوێشکیان دەهاتێ. وردە وردە کار گەیشتە بنبەست. (غەدیر بەگ) دەستی حەسرەتی لە ئەژنۆی وەردەهێنا.

(مێردم دەوێ)، ببوو بە ویردی سەر زمانی کچەکان. رۆژ بە رۆژ، وەکوو مۆم دەسووتان‌و دەتوانەوە...

کچەکان وردە وردە خەریك بوو لە پەیژەی فیزو بوغرایی دەهاتنە خوارێ. ئامادە بوون هەرکێ بێتە هەجبینییان، رازی بن. لەو کاتەدا سەرو سەکووتی (زەبووك زادە) لە ژیانیان پەیدا بوو.

(غەدیر بەرهەڵست)و (زەبووك زادە) وەکوو شیرو هەنگوینیان لێ هات... شەوو رۆژ، بە یەکەوە بوون‌و بە یەکتریان دەگوت: گیانم، جەرگم. ئەو رۆژگارە (زەبووك زادە) هێشتا ژنی نەهێنا بوو، ئەو هات‌و چوون‌و چاك‌و چۆنییە نیشانەی ئەوە بوو دەیەوێ یەکێ لە کچەکان بێنێ. هەموو عالەم (زەبووك زادە)یان دەناسی‌و دەیانزانی چ بێناموسێکە!! بەڵام ئێ، (غەدیر بەگ)ی داماو هیچ چارەی نەبوو. بە لانی کەمەوە یەکێ لە کچەکانی بە رێ دەکا.

(زەبـووك زادە) بـەینی لەگـەڵ (یـەك دانـە) لـە كچـەكانی دی خۆشـتر بـوو. بـە جۆرێ هەموو كەس وایدەزانی بەم زووانە ئەم دوانە زەماوەند دەكەن. كچەیش لـە هەموو لایەكەو خەیاڵی رەحەت بوو. خۆی لە بەر دەستو پێی (زەبووك زادە) شـل دەكرد.

ئێسـتا وەرە سـەیری چـەرخی چـەپگەرد بكـە! لـەو بگـرەو بەردەیـەدا، كـوڕی تاقانەی یەكێ لـە نـەجیبزادەكانی ئێـرە رەپو راسـت دڵـی كەوتـە سـەر (یەكدانـە). شەوو رۆژ، لە خەوو بێداریدا ئاهو ناڵەی ئاشقیی لێ هەڵدەستا: (ئـاخ یەكدانـەكەم! ئاخ یەكدانەكەم! ئەگەر ئەم كچەم بۆ نەهێنن، خۆم دەكوژم!)

باوكی كوڕەكە یەك دونیا پارەی هەبوو. لە دڵەوە بـەم زەماوەنـدە رازی نـەبوو، بەڵام بۆ نەجاتدانی كوڕەكەی هاتە رایێو خەبەری بۆ (غەدیر بەگ) نارد:

- كاكە، كوڕەكەی من خەریكە بە هیلاك دەچێ. (یەكدانە)ی بدەرێ...

(غەدیر بەگ) وەڵامی دایەوە:

- (یەكدانە) هی (زەبووك زادە)یە. ئەگەر ئەوانەی تری دەوێ ئامادەین!

كوڕە چاوی هەر لە دوو (یەكدانە) بووو ئەوانەی تری نەدەویست. بۆیە دەسـتی بە خەباتێكی سەخت كرد بۆ دەست خستنی (یەكدانە). كوڕە نەجیبزادەكە دەركـی كیسەی كردەوەو چەند هێندە مارەیی‌و زێڕو گەواهێری دیـاریی بـووكی زیـاد كـرد، بـەڵام ئـەو ئیشـانە سـوودیان نـەبوو، جـەنابی (غـەدیر)و كچـەكەی ئامـادە نـەبوون (زەبووك زادە) بـە هـەموو سامانی دونیـا بـدەن. جـەنابی (غـەدیر) لـە هـەر كـوێ دادەنیشت، بەرغەبابەی پڕ با دەكردو زۆر بە فیزەوە دەیگوت:

- لـە بیرتـان بـێ ئەگـەر (زەبـووك زادە) بـەم زووانـە نـەبوو بـە نوێنـەری ئەنجوومەن، هەرچی حەز دەكەن بە من بڵێن؟ ئەو دەبێ بە نوێنەری ئەنجوومەن‌و كچەكەی منیش دەبێ بە خانمی نوێنەری ئەنجوومەن...

دیـار نییـە لـەم بینـەو بەرەیـەدا چ رووی دا، بـەینی (غـەدیر بـەگ)و (زەبـووك زادە) تێك چوو.

ئەو دووانە، کە تا ئەو ڕۆژە وەکوو شیرو هەنگوین وا بوون، وەکوو چەقۆو پەنیریان لێ هات. لە دژی یەکتر کەوتنە کار. قسە ئەمما پاش ملە بە یەکتری نەڵێن، بوختان ئەما بە یەکتری هەڵئەبەستن.

کوڕە نەجیبزادەکە، کە لە دەرفەتێکدا دەگەڕا، کەوتە ناو شەڕەکەو لەبەر ئەوەی دەیزانی (یەکدانە) لە بەر دەستو پێی (زەبووك زادە) (دەستەمۆ) بووەو شایەنی ژیان نییە، بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکاتەوە، ناردییە خوازبینی (دوڕدانە).

حەریك بوو ئیشەکە پێت بێو ئەوەندەی نەما بوو (دوڕدانە) بچێتە مالی بەختی خۆیو بکەوێتەناو دەریای پارەو نیعمەت، کە (زەبووك زادە)و (غەدیر بەگ) ئاشت بوونەوە.

ئەم جارە (زەبووك زادە) ، کە تامی (یەکدانە)ی چەشتبووو شیرینی (یەکدانە) لە دڵی دا بوو، داوی لە بەر پێی (دوڕدانە) دانایەوە... ئەو کچە گێلە کە وەکوو زۆربەی هاوڕگەزەکانی خۆی کە بە ئیمەنو رووکار هەڵدەخەڵەتێن، پێلەقەی لە بەختی خۆی دا. ئەڵقەی نەجیبزادەکەی دایەوەو خەبەری بۆ نارد:

- ئەوەندەی سەرم هێناو برد، دیتم ژیانی منو تۆ لەگەڵ یەك ناگونجێ.!!

کوڕەی نەجیبزادە کە ئەم جارەیش سەری بە بەرد کەوت، ئەوەندە تێك چوو ویستی خۆی بکوژێ.

داماو باوکە!!.. بۆ نەجاتدانی کوڕە تاقانەکەی دەستەو دامێنی رەملچیو دوعانووسان بوو. بە ئەندازەی مەسرەفی دوو زەماوەند، پارەی لە تەلەسمو جادوو دا.

لە عاجباتی رۆژگار، (غەدیر بەگ)و (زەبووك زادە) دیسان بەینیان تێك چوو. ئەم جارە ناکۆکییان لە سەر پارت بوو. (زەبووك زادە) دەیگوت:

- بەرهەڵستیی ئێوە بەرامبەر پارتی زۆرینە بە بەر گوێی دەوڵەت کەوتووەو گومانیان لە هاتو چۆی من بۆ لای ئێوە پەیدا کردووە. یان دەبی بێیتە ناو پارتی ئێمە، یان واز لە دۆستایەتی یەکتر بێنین. چونکە من ئایندەو بەختەوەریم لە

مەترسیدایە. ئەگەر کچەکەی تۆ شاژنی جوانی دونیایش بێ، من ئامادە نیم بەو زەماوەندە، بیانوو بدەم بە دەست پارتو پارت دەرم بکا.

(غەدیر بەگ) هەرگیز بەم ئیشە رازی نەدەبوو. بەم جۆرە (زەبووك زادە) تووڕە بووو رۆیشت. (دوڕدانە)یش کە تووشی چارەنووسی خوشکی هات، سەری بە بێ کڵاو مایەوە.

لەگەڵ تووڕەبوونی (زەبووك زادە)، سەروسەکووتی کوڕە نەجیبزادەکە پەیدا بوو، هانە داحواری (گوڵدانە).

لەو رۆژانەی کە خەریك بوو کاروباری زەماوەندی نەجیبزادەو (گوڵدانە) رێك دەکەوتو خەڵك خۆیان بۆ زیافەتێکی گەورە ئامادە دەکرد، لە ناکاو (غەدیر بەگ) بە بێ پێشەکی لە پارتەکەی خۆی ئیستیقالەی داو چووە ناو پارتەکەی تر. هەموو دۆستو ئاشنایانی (غەدیر بەگ) لە جێی خۆیان وشك بوون. هەر کەسێ دەیگەیشتێ شتێکی دەگوت:

بەڵام (غەدیر بەگ) بە خوێن ساردیو رەزامەندی وەڵامی دەدایەوە:

- ئایندەی (زەبووك زادە) زۆر رۆشنە! حەیفە مرۆڤ زاوای وا لە دەست خۆی بدا! منیش کە خەریکە رۆژ بە رۆژ پیر دەبم، سەیرم کرد فایدەی نییە ئەوەندە بەرهەڵستکاری بکەم...

(زەبووك زادە) دوای ئاشتبوونەوەی دووەمی، یەکەو راست چووە لای (گوڵدانە)و ئەو زەماوەندەیشی تێك دا.

نەجیبزادە، کە بوو بە گورگی بریندار، بڕیاری دا بە هەر نرخێ بێ (زەبووك زادە) لە ناو ببا.

لە لایەکی تریشەوە (غەدیر بەگ) دەیزانی (زەبووك زادە) چ بەڵایەکی بە سەر کچەکانی هێناوەو چۆن لە خشتەی بردوون؟ دیتی ئەو لەکەی شوورەییە بە خوێن نەبێ پاك نابێتەوە، زوو پیاوی خۆی دۆزییەوە. هیچ کەس لە (حوسێنە رەش) باشتر نییە...(حوسێنە رەش) ئامادەیە بە پارە هەموو شتێ بکا.

(غەدیر بەگ) شەو چووە مالّی:

- (حوسێن ئاغا)، کوڕم، گورگ بە گورگایەتی خۆی دراوسێکەی ناخوا.

- بەڵێ، مامە (غەدیر) راستە.

- باشە، پێم بڵێ یەکێ کچی پاکیزەی خەڵك لە خشتە ببا، شەرەفی هەیە؟

- نەخێر، مام (غەدیر).

- بە لای تۆوە، ئەو کەسە دەبێ چی لێ بکرێ؟

- دەبێ کەلەشی بە راکێش راکێش بیبەنە سەر چیاو فڕێی دەنە بەر جانەوەری درندە.

- ئافەرین...بە راستی مرۆڤێکی بە شەرەفو بە نامووسی... ئێستا پێم بڵێ بزانم تۆ ئامادەی سزای یەکێ لەو بێناموسانە لە ناو دەستی خۆی بنێی؟!

- (حوسێنە رەش)، کە بە بن‌و بۆتکەی مەسەلەکە کەوت، زانی کلاوێکی چەند گەورەیان لە سەری (غەدیر بەگ) ناوە، بەلّام ویستی لە زمانی خۆی بیبیسێ.

(غەدیر بەگ)، بەر لەوەی مەسەلەکە بگێڕێتەوە، قورئانێك‌و حەفتخۆرێك‌و کیلۆ نانێکی لە پێش (حوسێنە رەش) داناو سوێندی دا ئەم مەسەلەیە بە هیچ کەس نەڵێ.

(حوسێنە رەش) بەڵێنی داو سوێندی خوارد. پاشان کە لە مەسەلەکە گەیشت، لەسەر شێوەی ئیش‌و ئەندازەی دەستهەقەکە چەنە لێدان دەستی پێ کرد.

(حوسێنە رەش) بۆ ئەو ئیشەی بە تەما بوو بیکا، پێشنیاری بەرتیلانەی خۆی کرد:

- بۆ برینێکی سووك داوای هەزار داری کردو بۆ برینێکی نیمچە قووڵ سێ هەزار دارو ئەگەر ورگ‌و ریخۆڵەی بە گۆڕێ وەر بکا پێنج هەزار دار.

(غەدیر بەگ) وەڵامی دایەوە:

- رۆڵە گیان، من ئەو (زەبووك زادە)یە بناسم بەو برینانە لە ناو ناچێ. دەبێ لە ناوەڕاستەوە بیکەیتە دوو لەتو هەر لەتێکی لە لایەکی شارۆچکەکەمان بنێژی بۆ ئەوەی خەڵکی ئێرە لە شەڕو بەڵای بحەسێنەوە.

(حوسێنە رەش) بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە داوای پارەیەکی زۆری کردو گوتی دەبێ هەموو پارەکە دەست بەجێ بدەی... (غەدیر بەگ) ، کە ئامادە بوو هەموو ژیانی خۆی بدا هەر بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی لەو بێ شەرەفو بێناموسە بکاتەوە، رازی بوو، حانووو باخەکەی بە هەرزان فرۆشت. بە چوار هەزار لیرەی داو دوو هەزار لیرەی پارەی جیازی کچەکەی خستە سەرو لە دەست (حوسێنە رەش)ی کرد. بۆ ئەوەی ئیشەکە تەواو بکا.(حوسێنە رەش) پارەکەی نایە گیرفانیو یەکەو راست چووە لای نەجیبزادەکە:

- دەزانی (غەدیر بەگ) بۆچی کچی خۆی نەدا بە تۆ؟

- هەڵبەت لە بەر ئەو (زەبووك زادە) بێ شەرەفە!

- راستە...ئەو کابرایە لەو رۆژەوە هاتۆتە دونیا بە قەدەر مووی سەری خۆی کچی لە خشتە بردوون.

نەجیبزادە لە رقان نەڕاندیو ددانی بە جیڕەوە برد:

- حەرامزادەی بێناموس!!!

(حوسێنە رەش)، کە کاتەکەی بە گونجاو زانی، بە دەنگێکی سادە گوتی:

- من ناتوانم ئەو بێناموسە وەکوو هاوشارییەکی خۆم قبووڵ بکەم.

نەجیبزادە قسەکەی پشت راست کردەوە:

- راست دەفەرمووی قبووڵ ناکرێ.

- باشە ئەدی غیرەتو پیاوەتی بۆ چ رۆژێکە؟! ئێمە پێویستە دەست لە ناو دەستی یەکتر بنێینو ئەو پیاوە پیسو بێناموسە لە ناو ببەین.

- بەڵێ، دەبێ تیکە بە تیکەی بکەم بۆ ئەوەی ببێ بە پەند بۆ ئەوانی دی.

- دەبێ چاوی دەربێنین بۆ ئەوەی دوای ئەو، کەس تەماشای نامووسی خەڵك نەکا.

- دەبێ دەستی ببڕم بۆ ئەوەی لەمەودا هیچ کەس زات نەکا دەستدرێژی بکاتە سەر نامووسی خەڵك.

بە کورتی لە بارەی سزاو چۆنیەتی کوشتنی (زەبووك زادە) باسێکی دوورو درێژیان کردو ئەو دوو کەسە سوێندیان خوارد بە خراپترین شێوە (زەبووك زادە) بکوژن...

ئەو (حوسێنە رەش) مەبەستێکی تری هەبوو. ئەو دەیەویست ئەو پارەی وەری گرتووە بیخواو کوشتنی (زەبووك زادە) بخاتە ئەستۆی نەجیبزادە. هەقیشی بەسەر ئەنجامی کارەکەوە نەبوو ، هەرچی دەبێ!!

راستی، ئەگەر ئەم ئیشە بکرایە، ئیشێکی کۆمەڵایەتیو بە سوود بوو. هەموو خەڵکی ئەو شارۆچکەیە لە شەڕی ئەو پیاوە قۆڵبڕو تەلەکەبازە دەحەسانەوەو تا مابوون دوعایان بۆ ئەو کەسە دەکرد کە ئەم ئیشەی کردووە.

حەیف کە بە هاتنی پارێزگاری تازە ئەم کارە بە نیوەچڵی مایەوە... ئاخ ئێوە نازانن ئەو زەبووکە چ جانەوەرێکە!! هیچ کەس لە حیکمەتی خوا ناگاو رازی خەلقبوونی زۆر شت لە بنیادەم شراوەیە. وا بزانم خوا بۆیە (زەبووك زادە)ی خەلق کردووە تا سەبری خەڵکی ئەم شارۆچکەیەی پێ تاقی بکاتەوە...

رۆڵە گیان، ئاگادار بە پێت بە تەلەیەوە نەبێ. ئەگەر بە تەلەیەوە ببی، مردنو لە ناوچوونت مسۆگەرە.

# (9)

## (پارێزگاری گەورە...)

پاشماوەی چیرۆکەکە لە جەنابی (مورتەزا)، خوا سەلامەتی کا، ببیسن.

- ئەمە یەکێکە لە شاکارەکانی (زەبووك زادە). ئەو کاتە من ئەندامی ئەنجوومەنی شار بووم. پێنج مانگ بوو ئێمە ناوی ئەو پارێزگارەمان بیستبوو. چیرۆکی سەیرو سەمەرەیان لە پارێزگاری تازە دەگێڕایەوە. دەیانگوت وەکوو بای سەرسەرِ وایە. رێی بکەوێتە هەر شوێنێ، هەموو شتێ دەسووتێنێو ئاگری تێ بەر دەدا.

هەر دەڵێی لە باتی پارێزگار بەڵایان رەوانەی ئەم ناوچەیە کردووە. لەو رۆژەوە کە هاتۆتە هەرێمەکەمان بوومەلەرزە دەستی پێ کردووە. فەرماندارەکان لە ترسان تووشی لەرزو تا هاتوون. کارمەندەکان لەوان خراپتر... باسی پیشەوەران هەر مەکە!! ئەستەغفیرەللا، بنیادەم ئەوەندە لە بنیادەم دەترسی؟! تەنانەت ژنان لە ماڵی خۆیان ناوێرن لە ترسی پارێزگار جیکە بکەن.

بەر لەوەی پارێزگار بێتە ئێرە، خەڵك، شەوو رۆژ، پێنج جار نوێژیان دەکرد بەڵام دوای هاتنی ئەو، بوو بە دە نوێژو دوای هەموو نوێژێك لە خوا دەپاڕێنەوە: (خودایە، زوو ئەو بەڵای ناگەهانەمان لە سەر لابەرە، ئەگەر ئەومان لە سەر لانابەی، رۆح لە ئێمە بستێنەو بمانحەسێنەوە. )

بە قوربانی خودا بم، نە رۆحی لە پارێزگار ستاندو نە رۆحی لە خەڵکی ئەم هەرێمە ستاند.

لە هەموو خەڵکی ئەم هەرێمە تەنیا (مەلا بەدری ئاقڵمەند) بە هاتنی پارێزگار رازی بوو. دەیگوت:

- بە قوربانی خوای بم کە چارەنووسی هەموو بنیادەمی بە دەستە. لە دێر زەمانەوە گوتوویانە: کە گەلێك بێ فەرمانی بکەن‌و لە دەریای گوناهدا نقووم ببن، خودا یەکێ لە پیاوە هەر ستەمکارەکانی خۆیان لە سەر دەکاتە کەڵەگا... خەڵکەکە پێیان لێ هەڵبڕی بوو ... ناماوس‌و غیرەت نەمابوو. رێزی گەورەو خۆشەویستی گچکە نەما بوو... بەدرەوشتیی لە رادە دەرچووبوو..خودایش بەوە ئێمەی سزا داوە.

هەمووی سووچی ئەو (زەبووك زادە) بێناموسەیە، یانی سووچی خۆمانە کە چاو لە کردارو رەفتاری (زەبووك زادە) دەپۆشین. ئەگەر لە رۆژانی هەوەڵەوە سەرمان بە بەرددا بدایە، کار بە ئێستا نەدەگەیشت. ئیتر خوا فەرمووی با بە جۆرێ سزایان بدەم کە تا دنیا دنیایە ببن بە پەند بۆ خەڵکی تر... ئافات‌و لافاوو بوومەلەرزەو ئاگرپژێن‌و وشکە ساڵی بە کەم زانی بۆ ئێمەو فەرمانی بە کارمەندەکانی کرد بەڵایەکی لەوانە خراپتر بنێرنە سەر ئێمە. ئەوانیش دوای ماوەیەکی زۆر لێکۆڵینەوە، ئەم پارێزگارەیان هەڵبژارد...

(ئیسماعیلی بەندەی خوا) لە وەڵامی (مەلا بەدری ئاقڵمەند)دا گوتی:

- ئاخر برا، دەتوانین بەرامبەر بە پارێزگار چ بکەین؟ هەر ئەوەندەمان پێ دەکرێ چی هەمانەو نیمانە هەمووی بفرۆشین‌و لەم وڵاتە رابکەین.

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) بە خەفەتەوە سەری بادا:

- فایدەی نییە. هیچ کەس ناتوانێ لەو چارەنووسە را بکا کە بۆی داندراوە. ئەمە سزای ئێمەیە، خوا بەسەریدا سەپاندووین. رەوشتمان تێك چووە. بچینە هەر شوێنێ خەڵکی ئەوێش خراپ دەکەین، دەبین با مایەی تووك‌و نەفرت بۆیان. خوا پێی خۆش نییە خەڵکی هەرێمی تر نارەحەت بکەین.

- مەلا گیان، چارەی ئەم ئیشە چییە؟

- تەنیا بە لە ناو بردنی (زەبووك زادە) ئەو بەدبەختییەمان لەسەر لادەكەوێ.

بە كۆمەڵ چووینە لای فەرماندار بۆ ئەوەی لە رێی ئەوەوە داوای چوونە خزمەت پارێزگار بكەین‌و بچین دەستی ماچ بكەین. دیمان ئەو داماوە بە جۆرێ پەشۆكاوە، مێشكی ئیش ناكاو نازانی چ بكا.. بچێتە لای پاریزگار؟ نەچێ؟ چونكە بیستبووی پارێزگار هەندێ فەرمانداری لە فەلاقە داوەو داركاری كردوون.

فەرماندار پیاوێكی ئازاو نەترس بوو. تەنیا لەوە دەترسا ئەگەر پارێزگار دەستی لێ هیت كانەوەو بیەوێ لیی بدا، ئەو هەڵویستی چ دەبێ؟ ئەوەت جلەوی لە دەست بەر بێ‌و لە بەر چاوان پارێزگار دابێژێ.

لەم بگردو بەردەیەدا، پارێزگار تەلەفۆنی بۆ فەرماندار كرد. لە تەلەفۆن گوتی:

- دەستەیەك لە ئەندامانی كابینە دەیانەوێ بۆ پشكنینی پارێزگاكەمان بێنە شارەكان. حەز دەكەم زۆر بە چاكی پێشوازییان لێ بكرێ. دەبێ ئاهەنگێكی وا بگێڕی تا ئێستا شتی وا نەكرابێ. من پێشتر دێم كارەكان دەپشكنم، وای بە حاڵتان ئەگەر كەم‌و كورتییەك هەبێ. ئاگادار بن بەرامبەر شاندی دەوڵەت ئابڕوومان نەبەن! ئەگەر كەم‌و كەسریتان هەبێ، چیتان بە سەر بێ لە ملی خۆتانە. زۆر وریا بن. فەرماندار بەم تەلەفۆنە ئەوەندە وڕو گێژ بوو دەتگوت بە چەكووش لە مێشكی سەریان داوە. لە ترسان بوورایەوەو كەوتە سەر كورسی و لە هۆش خۆی چوو. كە بە هۆش خۆی هاتەوە، بە جەنابی (رەزا)ی میرزای فەرمانداری گوت كە لە سەر سەری وەستا بوو:

- من وەكوو فەرمانبەرەكانی دی نیم... ئەگەر پارێزگار بیەوێ وەكوو كارمەندەكانی دی لەگەڵ من بجووڵێتەوە، رەگ‌و ریشەی دەردێنم. من لەوە دەترسم ئەگەر نا، هەر بە خەیاڵیشمدا نایێ. ئەگەر فلتە فلت بكا دەیكوژم. فەرماندار قسەی دەكردو وەكوو یەكێ تاو لەرزی لێ بێ چەنەگەو دەست‌و پێی دەلەرزی... بە زۆر جلەوی خۆی گرت‌و لە دوو سەرۆكی شارەوانی نارد.

كه سەرۆكی شارەوانی هات، فەرماندار هێشتا حاڵی تەواو نەهاتبووەوە سەر خۆی. فەرمانی پارێزگاری پێ ڕاگەیاندو گوتی:

- ئەم كارە لە بنەڕەتەوە پەیوەندی بە شارەوانییەوە هەیە. هەر كەمو كورتییەك لە كارەكەتاندا هەبێ، بە توندی لێپرسراون...

ئەو كاتە جەنابی (هەمزە جووت بەدزادە) سەرۆكی شارەوانی بوو. وەڵامی دایەوە:

- ئێمە تەواو ئامادەین. هەموو شتێكمان لە عەمباری شارەوانی هەیە . هەر كەسە دەیەوێ بێ، با بێ...

ئەو ئامادەییەی سەرۆك شارەوانی باسی دەكرد ئەوە بوو شارەوانی هەندێ پایەی تاقو بڕێ بەیداخو دروشمی هەبوو. هەر كاتێ جەژنێك یان ئاهەنگێك دەبوو، ئەو شتانەیان لە ناو عەنبار دەردەهێناو دەیانچەقاند. پاشانیش كە ئاهەنگەكە تەواو دەبوو، دووبارە دەیانبرد لە ناو عەنباریان دادەنایەوە.

خاوەن ئوتێل گوتی:

- هاوڕێیان، وەرن (زەبووك زادە)یش تێكەڵ ئەم ئیشە بكەین. یەكەم، ئەو زۆر شارەزای ئەو كارانەیە. دەتوانین سوود لە بیرو بۆچوونەكانی وەر بگرین. دووەم، ئەگەر ئەو بەشدار نەكەین، تووڕە دەبێو لە بەر ئەوەی بە مرۆڤمان حیساب نەكردووە، تووشی بەزمێكمان دەكا.

سەرۆكی شارەوانی بەینی لەگەڵ زەبووك زادە زۆر خراپ بوو. ئەگەر بكەوتایەتە بەر دەستی، بە مشار دەیبڕییەوە...

بۆیە كە گوێی لە پێشنیاری خاوەن ئوتێل بوو، تەواو ناڕەحەت بوو:

- زەبووك لە ئاست منو پارێزگار چییە تا پرسی پێ بكەین؟ ئەم ئیشانە پەیوەندییان بە هیچ كەسەوە نییە.

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) لە بەرهەڵستەكانی (زەبووك زادە)یە بەڵام لە قسەكانی سەرۆكی شارەوانی تووڕە بووو ڕەتی دایەوەو بە ناڕەزایی گوتی:

- ئەمە چ قسەیەکە جەنابی سەرۆکی شارەوانی؟ ئێوە لە خۆتان بەو لاوە کەس بە پیاو دانانێن. وڵات تەنیا فەرماندارو سەرۆکی شارەوانی تێدا نییە...ئەوانەی تریش خەڵکی ئێرەن... شاندی دەوڵەت بۆ پشکنینی ئەوان دێ، نەك بۆ خاتری جەنابی فەرماندارو سەرۆکی شارەوانی.

ئەگەر بێینە سەر بابەتی نەسلی بەندە، کە سەرپەرشتیاری پارتم، سەلاحییەتم لە هەموویان زیاترە...

سەرۆکی شارەوانی کە دیبی وەرغ ناڵەبارە، وەکوو یەکێ کە لەسەر هەق بێ، گوتی:

- خۆتان دەزانن بەڵام پەشیمان دەبنەوە!..

پایەکانی تاقی سەرکەوتنیان لە عەنبار هێنایە دەرێ‌و کرێکارانی شارەوانی سەرقاڵی چەقاندنی پایەکان بوون...

لەو کاتەدا، داواکارێکی تازە پەیدا بوو. ئەو داواکارە نوێیە سەرتیپ (محەمەد) بوو کە دوای چەند ساڵ خزمەت لە پایتەخت، پێش چەند مانگێ، کار کەنار بووو هاتەوە شارۆچکەکەمان بۆ ئەوەی سەر لە خزم‌و کەس‌و کاری بدا. کە چاوی بە پایەکانی تاقی سەرکەوتن کەوت، گوتی:

- تاقی سەرکەوتن یەك نابێ. بە لانی کەمەوە دەبێ دوو بێ.

- بابە، ئەو قسەیە چییە؟ هەر جێگایەك بە قەدەر خۆی تاقی سەرکەوتن ساز دەکا... ئێرە جێگایەکی بچووکە... ئەگەر راستت دەوێ یەك تاقیش بۆ ئێمە زۆرە!! ئەوەی هەمانە بۆ تەشریفات دروستی دەکەین...و خۆڕا پارە بە خەسار نادەین...

- تەشریفاتی چی؟ لە دێر زەمانەوە گوتوویانە: (سواری گەرێ عەیبەکە، هاتنە خوارێ سەد عەیبە!) مەگەر مەجبوورن چییە؟ ئەگەر ناتوانن ، ئەمە شتێکی ترە... بەڵام ئەگەر دەتانەوێ تاقی سەرکەوتن بچەقێنن، بە لایەنی کەمەوە دەبێ دوو دانە بێ. لەیەکێ بێنە ژوورەوەو لەوەی تر بچنە دەرەوە.

(ئەمین بازرگان)، کە گوێی لە قسانە بوو، گوتی:

- وای... چارە چییە؟ ئێمە لە یەك تاقی سەرکەوتن زیاترمان نییە. جا شاندی دەوڵەت لەو تاقە دێنە ژوورەوە، بە کوێدا بچنە دەرەوە. نەکا ڕێگای دەرچوون نەبێ و لە هەریمی ئێمەدا بمێننەوە؟ جەنابی سەرۆکی شارەوانی تکا دەکەم بە هەر جۆرێ بێ تاقێکی تریش بچەقێنن، نەوەك تووشی کێشە دەبین...ها...

(ئیحسان تەقاویت)، قسەکان (ئەمین بازرگان)ی پشت ڕاست کردەوە:

- ڕاست دەفەرموون... دەبێ دو تاق بچەقێنین: یەك بۆ هاتن، ئەوەی تر بۆ دەرچوون...

- ئەستەغفیرەللا! بابە، ئەوانەی ئێمە تا ئێستا دیومانن، لەو دەرگایەی دێنە ژوورەوە، هەر لەویش دەچنە دەرەوە.

سەرتیپ (محەمەد) پێکەنی:

- ئەوانەی ئێوە دیوتانە مرۆڤی ئاسایی بووین... گرە گرەکان وەکوو ئێمە مانان نین، کە لە شوێنێ دانیشتن، حەز ناکەن هەڵبسن. کە لە دەرگایەك هاتنە ژوورەوە، ئەگەر تیکە تیکەیشیان بکەی، لە هەمان دەرگا ناچنە دەرەوە. ئەوان ڕەوشتیان ئاوهایە!! چارەیشی نییە.

- ئاخر شاندی دەوڵەت لێرە ناوەستن، لێرە تێدەپەڕن...

باشە، من ساڵەهای ساڵ لە شاری گەورە ژیاوم. بە چاوی خۆم لە تایتەخت دیومە... خیلاف ناڵێم.

سەرۆکی شارەوانی هاتە ڕایێ:

- زۆر باشە. لاریمان نییە. دوو تاقی سەرکەوتن دوست دەکەین. تەنیا پەیدا کردنی دارەکەی زەحمەتە.

خۆشبەختانە پێش چەند ڕۆژێ تەویلەی (ئەمین بازرگان) خراپ کرا بوو. کاریتەکانی بانی لە بن دیوار کەوتبوون، هێنایانن... چەند عارەبانە گەسکی سەوزو هەندێ کولۆوكوچەند دەسکە قامیشێکیان هێناو بەو شتانە تاقێکی

سەرکەوتنی تریان دروست کرد بۆ ئەوەی کە میوانەکان هاتنە ناو شارۆچکەکەمان، ڕێگای دەرچوونیان هەبێ.

هەندێ بەیداخو دروشمی کاتی ئاهەنگ گێڕانی یادە دەیەمین ساڵی پارتی کۆماری لە عەنبازی شاردوانی هەبوو. ئەوانیشیان دەرهێنا. مشك چەند جێگایەکی دروشمەکانیان قرتاندبوو، بەڵام لە دوورەوە دیار نەبوو. پەتو داری دوو لای دروشمەکانیان ڕێك خستو هەڵیاندان. بەیداخیشیان لە دەوراندەوری گۆڕەپانەکە چەقاند. کورسی گوتاردانیشیان لە ناوەندی گۆڕەپانەکە دانا.

ئەو ڕۆژگارە، عەردی گۆڕەپانەکە تەخت نەبوو. هەرچی دەیانکرد کورسی ڕاست ڕانەدەوەستا. لایەکی نزم دەبووو لایەکی بەرز دەبوو.

ئاخیری سەرتیپ (محەمەد) بە هەر جۆرێ بوو، چاکی کرد.ڕووپۆشێکی سەوزیان بە سەر کورسییەکە داداو دۆڵکەیەكو پەرداخێکیشیان لە سەر دانا.

بەڕێوەبەری قوتابخانە منداڵەکانی ڕیز کرد بۆ ئەوەی فێری ڕێو ڕەسمی ئیکلام کێشانو چەپڵە لێدانیان بکا...

لە شارۆچکەکە (تۆپ)ێکمان هەبوو. یادگاری سەردەمی سولتان ڕەشاد بوو. هەموو ساڵێ کە مانگی ڕەمەزان دادەهات سەرتیپ (محەمەد) تۆپەکەی چەور دەکردو بە هەندێ باڕووتو کەمێ فتیلە خەڵکی لە پارشێوو فتار ئاگادار دەکردەوە. نازانم کام شێر حەلاڵ بوو پێشنیاری کرد: (دەبێ لە کاتی گەیشتنی میوانەکان تۆپ بتەقێنین!) سەرۆکی شارەوانی بیرەکەی پەسند کردو دەمودەست سەرتیپ (محەمەد)ی نارد تۆپەکە ئامادە بکا. تاقمە سازندەیەکیشیان ئاگادار کردەوە. بە چاو هیچ کەمو کەسرییەك نەبوو بەڵام لە پڕ (حەقی بەربەر) گوتی:

- بابە دەبێ قوربانییەك لە بەر پێی میوانەکان سەر ببڕین.

ئێمە هیچێکمان هەستمان بەمە نە کردبوو... (عوسمان قەساب)، کە دەتگوت خۆی بە (حەقی بەربەر)ی گوتبوو ئەم قسەیە بکا... یەکسەر ملی بابەتەکەی گرت:

- لەبەر ئەوەی ئەمن قەسابم شتێ هەیە دروست نییە من بیڵێم بەڵام سەر بڕینی قوربانی لەم هەموو شتانە گرنگترە.

جەنابی سەرۆك شارەوانی قسەکەی پشت ڕاست کردەوە:

- بە ڕاستی، قوربانیش پێویستە...

(عوسمان قەساب) ڕووی گەش بووەوە:

- مەسەلەکە ئەوەیە ئەوان

-جاری یەکەمە دێنە شارۆچکەکەمان... دەترسم ئەگەر مەڕیان بۆ سەر بڕین سووکایەتی بێ بۆ ئەوان.. دەزانن سووکایەتی کردن بە کارمەندانی دەوڵەت لە کاتی جێ بە جێ کردنی ئەرکی خۆیدا، سزای چەند گرانە؟!

جەنابی سەرۆکی شارەوانی بۆچوونی (عوسمان)ی پشت ڕاست کردەوە:

- زۆر باشە. سێ بەران سەر دەبڕین...

- ئەمە پەیوەندی بە منەوە نییە... لەبەر ئەوەی من خۆم قەسابم دروست نییە قسە بکەم. بەڵام ئەوە دەزانم کاتێ پیاوی گەورە دەچنە شوێنێ، دەبێ حەیوانی گەورەیان بۆ بکەنە قوربانی.

- مەبەستت چییە؟ ڕەشەوڵاخ سەر ببڕین؟!!

- بەڵێ. لانی کەم سێ چوار ڕەشەوڵاخ لەبەر پێیان بکەینە قوربانی.

سەرۆکی شارەوانی بنا گوێی خۆی خوراند.

- ئاخر پارەکەی زۆر دەکا!!

- لە سەر من گوتنە... ئیتر خۆتان دەزانن... شاندی دەوڵەت دێنە ئێرە، ڕەشەوڵاخ هەر هیچ نییە، ئەگەر وشتریش بکەینە قوربانی هێشا هەر کەمە. پێتان وایە شانازییەکی کەمە شاندی دەوڵەت بێن دەست بخەنە ناو دەستتانەوە؟! بەرامبەر بەوە پارەیەکی کەمی شارەوانی خەرج دەکەن. ئابڕوویەك بۆ خۆتانو بۆ شارۆچکەکەمان بە دەست دێنن. ئەو پارەیە بۆ شارەوانی شتێکی وا نییە...

- زۆر باشە. ڕەشەوڵاخ سەر ببڕە. ئیشاللا چاویان دەنووسێنێ.

- هەڵبەت کەیفیان پێ دێ...خۆ کوێر نین!! کە دیتیان رەشەوڵاخمان لە بەر پێیان کوشتەوە، غیرەتیان دەبزوێ. ئەو کاتە هەرچی حەز دەکەی داویان لێ بکە: داوای رێگا بکە... داوای کارخانە بکە... داوای راکێشانی ئاو بکە...داوای بووجەی زیادە بکە بۆ شارەوانی...ئێوە پیاوەتی خۆتان بکەن، پێشوازیو میوانداری خۆتان پێشان بدەن، ئەوەی تر دەمێنێتەوە سەر هیممەتو غیرەتی ئەوان. ئەگەر گەورە بن، گەورەیی خۆیان نیشان دەدەن. لە کۆنەوە گوتوویانە: (مروەت ئەندازەی نییە..)

- زۆر باشە. چوار گامێش سەر ببڕە. پارەکەی هەر چەند بوو لە سندووقی شارەوانی دەیدەین.

ئەو رۆژە بۆ عەسرەکەی، جەنابی فەرماندار بۆ لێکۆڵینەوەی کارەکان هات. دەیەویست بزانێ هەموو شتێ ئامادەیە؟ یان نا؟ بەدبەختی داماو وەکوو یەکێ تووشی مەلاریا هاتبێ، ئێسکی چەناگەی پێك دەکەوت. بۆ ئەوەی بەلگەیەك بۆ ترسی خۆی دابتاشێ، گوتی:

- دەترسم ئەو پارێزگارە سەگبابە وەکوو ئەوانی دی قسەی پروپووچم پێ بڵێو ناچار بم بە دەستی خۆم بیخنکێنم.!!

فەرماندار کارەکانی پەسند کرد. دەمو دەست تەلەفۆنی بۆ پارێزگار کردو گوتی: قوربان هەموو شتێ ئامادەیە.

پارێزگار وەڵامی دایەوە:

- بەیانی دێم تەماشایەکی دەکەم...

هەموو شتێ ئامادە بوو. تەنیا لە یەك شت نارەحەت بوون: (زەبووك زادە) لە کوێیە؟ چ دەکا؟ بۆچی بە جارەکی بزر بووە؟ لەو کاتە ناسکەدا کە بڕیارە پارێزگار بێتە شارۆچکەکەمان بزربوونی (زەبووك زادە) شتێکی نائاساییە. بێ شك ئەو ماستە موویەکی تێدایە. ئەو سەگبابە بێناموسە خەریکی لێنانی چێشتێکە یەك بستە رۆونی لە سەر بێ. خاوەن ئوتێل گوتی:

- هاوڕێینە، بڕۆنە دووی بیهێنن، ئیشێکی لە مل راکەن. من لە هەوەڵیشەوە پێم گوتن، گوێتان نەدامێ. ئێستایش درەنگ دا هاتووە.

زوو بڕۆن بیدۆزنەوەو بیهێنن. نەوەك تووشی شتێکمان دەکا.

چوون، گەڕان بەڵام (زەبووك زادە)یان نەدۆزییەوە...

رۆژی پاشی، سبەینەکەی، هەموو گرەگرەو ریش سپییەکانی شارۆچکەکەمانو سەرۆکی دایەرەکان لە گۆڕەپانەکە کۆبوونەوە. (حوسێن زوڕناژەن) لەگەڵ (فەیسەڵ)ە قەڵەوی دوڵەنگیو بەرنامەیەکی تاقی کرنەوەیان پێشکەش کرد. یەکەم جار مارشی (ئەزمیر)یان لێدا پاشان مارشی (سیاستول)و دوای ئەوەیش یەك لە دوای یەك ئاوازی هەرێمایەتییان لێدا.

جەنابی بەڕێوەبەری قوتابخانەیش منداڵەکانی لە رۆخ جادە ریز کردبووو یەکەو بەیداخی کاغەزی دابووە دەستیان. تەماشایەکی فەرماندارم کرد، دیتم زرانی دەلەرزێو هەر جرتو فرتییەتی بۆ ئەوەی زوو ماشینی پارێزگار ببینێ.

گامێشەکانی قوربانییان لە ژێر تاقی سەرکەوتن راگرتبوو، پەتی بەستنی قاچو دەسماڵی بەستنەوەی چاویانیان ئامادە کردبوو.

(عوسمان قەساب) خەریك بوو کێردەکەی تیژ دەکردو (مەلا بەدری ئاقڵمەند) لە ژێر لێوەوە دوعای دەکردو مەشقی لە سەر تەکبیر لێدانی کاتی قوربانی دەکرد.

لەو تێکەڵلایە دا، کە هەموویان سەریان هەڵدەکێشاو دەیانەویست پێش هەموویان پارێزگار ببینن، لە پڕ (شوکری بێ پاژنە) وەکوو جانەوەرێ زنجیری پساندبێ بە هێنکە بڕی، لە ناوەڕاستی مەیدان خۆی گەیاندە بەردەم (مەلا بەدری ئاقڵمەند)و بە کورتی گوتی:

- مە..ل..لا..مەلا... مامە مەلا... سەرتیپ (محەمەد) دەڵێ چەند گوللە تۆپ باوێم.

توخوا تەماشای ئەو سەرتیپ (محەمەد)ە بکەن!! ئێستا وەختی ئەو قسانەیە؟ بڵێ تۆ چ ئیشت بەو ئیشانەیە!! دەتوانی چەند گوللە باوێی، باوێ. چ مەعلووم هەر

دەنگی لێوە دێ!! کێ گوێ بەم قسانە دەدا. تەنیا نەختێ باروود بۆ ڕۆژانی جەژنی دادێ بگێڕەوە، ئەوەی مایەوە خۆتو ویژدانت...

ئاخر ئەوەیش بوو بە ئیش لەو کێشمەو دۆخەیەدا بنێری بپرسی چەند گوللە تۆپ باوێم؟!و فکرمان تێك بدەی؟...

کاتێ (شوکری بێ پاژنە) پەیامی سەرتیپ (محەمەد)ی هێنا، هەموو سەیری دەمو چاوی یەکتریان کردو گوتیان بێ شك (مەلا بەدر) وەڵامی دەداتەوە... بەڵام مەلا تەماشای دەمو چاوی فەرمانداری کردو فەرماندار سەیری سەرۆك سارەوانی کردو سەرۆك شارەوانی چاوی بڕییە دەمو چاوی (ئەمین بازرگان)...

لەو کاتەدا (حوسێن زورناژەن)، کە ئاگای لەم مەسەلەیە نەبوو، دەستی بە لێدانی ئاوازێکی بیانی کرد.

فەرماندار زۆر تووڕە بوو، هاواری لە سەر کرد:

- دەنگت بڕە، سەگباب، ئیتر بەسسە! هەناسەت دەگیرێ، کە جەنابی پارێزگار هات، ناتوانی زۆڕنا بژەنی.

ئینجا ئاوڕی لە لای سەرۆك دایەرەو بڕواپێکراوەکان دایەوە:

- ئێوە کامەتان دەزانێ دەبێ چەند تۆپ بتەقێنن؟

نازانم ئەمە لە کوێ لە مێشکی مندا مابوو کە 41 گوللە تۆپ دەتەقێنن:

- قوربان، دەبێ 41 گوللە تۆپ بتەقێنن.

جەنابی (هەمزە)ی سەرۆکی شارەوانی قسەکەی پشت ڕاست کردمەوە:

- ڕاستە، منیش بە بیرم هاتەوە، ئێستا 41 گوللە تۆپ بتەقێنن تا بزانین پاشان چ دەبێ!!1

(مەلا بەدر) کە ڕەوشتی وا بوو سنگی لە بەر قسەی هەموو کەس ڕا دەکرد، گوتی:

- حاشا... هەرگیز... هیچ شتی وا نییە. 41 گوللە تۆپ بۆ پاشاو سەرۆك کۆمارانە...

توخوا تۆ وەرە تەماشای ئەم مەلا ریش بزنە بکە!! بەم قسەیەی هەموووەزعەکەی تێك دا. ئەم هەموو دەردەسەرییەمان لە سەر کۆبۆتەوە، ئەویش قوڕەکەی خەستتر کرد. لەعنەتی خوا لە سەرتیپ (محەمەد) دا. ئیشی نەبوو ئەم قسەیەی خستە ناوەوە. هەر چەند گوللە تۆپت دەوێ بتەقێنی، بتەقینە، ئیتر پرسیاری ناوێ. سەرۆکی شارەوانی گوتی:

- ئێستا مادەم وایە بیست گوللە بتەقێنن!!

(مەلا بەدری ناقلّمەند) دیسان نارەزایی دەربڕی:

- نابێ...

سەرۆکی شارەوانی پێی داگرت:

- بۆچی نابێ؟

فەرماندار رەنگی وەکوو گەچ سپی ببوو، بە بێ عاجزی گوتی:

- بابە، شەڕو هەرا بنێنە لاوە... ئێستا جەنابی پارێزگار دەگا. بڵێ چەند گوللە تۆپ دەتەقێنێ با بتەقێنێ!

سەرتیپ (محەمەد) لە سەر تەپۆلکەکە چاوەڕێی وەڵامی دەکرد. کە بینی (شوکری بێ پاژنە) هیچ خەبەری نییەو لە بەر ئەوەی خۆیشی نەیدەتوانی کارەکەی جێ بێڵێ‌و بە دوای وەڵامەکەدا بێ، وای بۆ چوو بە هاویشتنی گوللە تۆپێك تێمان بگەیەنێ یەکسەر وەڵامەکەی بۆ رەوانە بکەینەوە.

ئەو بێ ویژدانە تۆپێکی وای تەقاند، پەنجەرەی هەموو ژوورەکانی لەگەڵ هەژایەوە: گرم!!!

فەرماندار ئەوەندە ترسا هەندەی نەمابوو خۆی پیس بکا.

(ئیحسان تەقاویت) نەیتوانی ئیتر لە سەر پێ بوەستێ و بە بیانووی دەرمان خواردن چووەوە ماڵێ.

فەرماندار بازووی (شوکری بێ پاژنە)ی گرت‌و پاڵی پێوە نا:

- برۆ بەو سەگبابە بڵێ بارووت خۆڕ خەسار نەکا.

(شوکری بێ پاژنە) کاتی خۆی بە تاوانی دزی پاژنەکانی براپبوون و نەیدەتوانی بە راست و دروستی بڕوا، بەر بووەوە، کە بە زەحمەت لە سەر زەوی قیتمان کردەوەو بەڕێمان کرد بڕوا، کار لە کار ترازا بوو.

تۆزو خۆڵی ماشینی پارێزگار لە دوورەوە دەرکەوت. هەناسەمان لە سنگ راوەستاو لە جێی خۆمانەوە هەوڵمان دا خۆمان بچووك بکەینەوە تا نەکەوینە بەر چاوی پارێزگار.

لەگەڵ ئەوەی دونیایش سارد نەبوو، لەرزێکم گرت هیچ ئاو لەرزێت وا نەبووە.

ماشینی پارێزگار گەیشتە جێ. لیخوڕەکە خۆی فڕێ دایە خوارێ و دەرگای کردەوە. کابرایەکی قوتەو لەڕو لاواز لە ناو ماشینەکە هاتە دەرێ وەکوو قامیشی قلیان وا بوو، دەم و چاوی رەش و سووتاو بوو...

- پەح!! ئەمەیە ئەو پرێزگارەی ناوەکەی، حەفت ئیقلیمی خستۆتە لەرزە؟!

تف!! سەیر کە کابرا بیچمی بە بیچمی بنیادەمان ناچێ.. رەق و وشك و رەش، بەژنی لە گۆپاڵی شوانیش کورتترە.!!

- هەر لەگەڵ لە ماشینەکە دابەزی، سەرنجێکی لە تاقی سەرکەوتن و دروشمەکان داو هاواری کرد

- ئەمە چ گاڵتەبازییەکە؟! ئەم شتە پیسانە چین؟!

هەرچەندە کورتە بالاْ بوو، بەلاّم دەنگی گەورە بوو وەکوو هەورەتریشقەی ئاسمان وا بوو، پیاو سەری سوڕدەما ئەم دەنگە لە کوێی ئەو کابرایە دێتە دەرەوە؟! ئەگەر هەموو گیانی ببوایە دەنگ هێشتا دەنگی ئەوەندە گەورە نەدەبوو. رق و تووڕەییەکی تایبەتی لە دەنگیدا بوو، شکۆیەکی تایبەتی پێ دەبەخشی...

هەموومان دەرپەڕین بۆ ئەوەی دەستی ماچ بکەین. لە ناسازیی کار دۆخەکە خراپتر بوو. یەك دوو نەفەر پێیان لە پێی نا. یەکێ لە ترسان، لە باتی ئەوەی دەستی پارێزگار ماچ بکا گەززەی لێدا.

پارێزگار دەستی بە هات و هاوار کرد:

- ئەمە چ رەزالەتێکە؟! ئەمە چ ئابڕووچوونێکە؟!

کەس نەیدەزانی مەبەستی چییە؟و لە چ شتێ تووڕە بووە. پارێزگار تەماشای ناو پەلە هەورانی دەکرد...

نەماندەزانی ئاسمان دەڵێ؟! باڵندەکان دەڵێ؟!

بەدبەختیی یەخەگیری سەرۆکی شارەوانی بوو. پارێزگار بە ئاماژەی دەست یەکێ لە دروشمەکانی نیشان داو پێی گوت:

- ئەمە بخوێنەوە، برانم.

سەرۆکی شارەوانی خوێندەوارییەکی باشی نەبوو. بە زەحمەت دەیزانی ناوی خۆی بنووسێو واژۆ بکا. خوێندنەوەی دروشمەکە خوێندەواریی دەویست... سەرۆکی شارەوانی نەیدەتوانی مەسەلەکە بە پارێزگار بڵێ. ئەگەر پێی بگوتایە لای دەدا... وەك یەکێ کە بیەوێ لە دوورەوە شتێ بخوێنێتەوە، سەری بڵند کردو ماوەیەك چاوی بڕییە دروشمەکە. ئینجا بزەیەکی تایبەتی هاتێو گوتی:

- جەنابی پارێزگار، من چاوم لە دوور نابینێ... جەنابت بیخوێنەوەو ئێمەیش گوێ دەگرین...

پارێزگار پاڵی پێوە ناو هاوار کرد:

- هەڵەی تێدایە!

هەموومان سەرمان لە فەرموودەی پارێزگار سوڕما. ئاخیر ئەو دروشمانە بۆ یادی دەیەمی کۆمار نووسراون، چۆن دەبێ هەڵەیان تێدا بێ؟ ئەگەر هەڵەیەکیان تێدا بوایە، تا ئێستا سەد جار رەگو کۆکیان دەرهێنابووین! ئەو هەڵەیە چۆن پاش دە ساڵ پەیدا بوو؟!

پارێزگار لە هەموو کاتێ تووڕەتر بوو. نەڕاندی:

- فەرماندار، کوا؟

فەرماندار، کە تا ئێستا خۆی لێرەو لەوێ دەشاردەوە، هەر رایکرد بۆ بەر دەمی. داهاتەوەو هەردوو دەستی بۆ پێشەوە بردو دەستی جەنابی پارێزگاری گرت، بەلاَم نەیدەزانی چ بکا، دەستی بگوشێ؟ دەستی ماچ بکا؟ یان خۆی باوێتە سەر پێی؟

پارێزگار بە ناڕەحەتی دەستی خۆی کێشایەوەو نووسینەکەی نیشان دا:

- ئەمە بخوێنەوە.

فەرمانـدار سـەرنجێکی لـە دروشمەکـە دا، کـە زانـی ناوەرۆکەکـەی چـی تێدایـە، ئەوەنـدە سـەرمەزار بـوو هـەر مەپرسـە!! دەرکـەوت ـەو دروشـمەی ـە ـاو عـەنبار هێناویانـــە پەیوەنـــدی بـــە یـــەکێ لـــە ئاهەنگـــەکانی کرێکارانـــەوە هەیـــە... ئەستەغفیرەللا.. تۆبە.. ئەمە چ هەلەیەکی گەورەیەو ئێمـە کـەسمان هەستمان پـێ نـەکردووە.. مشکیش هەنـدێ پیتیـان قرتانـدبوو، رسـتەیەك مـابووەوە قسـەیەکی سەیروخراپی لێ دەرچووبوو. پارێزگار بە تووڕەیی بە فەرمانداری گوت:

- بۆچی لاڵ بووی؟ بیخوێنەوە.

کاتێ فەرمانـدار رسـتەکەی خوێنـدەوە، مرقـەی پێکـەنین لـە ئامـادەبووان بـەرز بووەوە.

پارێزگـار، سیمای ئەوەنـدە گـرژ بـوو، مـرۆڤ زاتـی نـەدەکرد بـە دڵـی خـۆی لـە بەردەمی پێ بکەنێ. بە زەحمەت خۆمان بەرزەفت کرد.

پارێزگار لە پڕ هاواری کرد:

- ئەی کوا چەپکە گوڵ؟

- گوڵ بۆچییە؟ ئێمە ڕێو ڕەسمی وامان نییە. ئێستا چ بووە؟ ئەگەر گوڵ نەبێ، نابێ؟

پارێزگار سەری بادا:

- قەت ئاهەنگ بە بێ گوڵ دەبێ؟ هەر باش بوو هاتم‌و ئامادەکاریی ئێوەم بینی. ئەگەر متمانەم بـە ئێـوە بکردایـە، تـەگبیر چ دەبـوو؟ دەبـێ گـوڵ ئامـادە بکـەن. کـە

پیاوێکی گەورە دێتە هەرێمەکەتان دەبێ کچی بچکۆڵە چەپکە گوڵی پێشکەش بکەن...

- پارێزگار دەستی بە پشکنینی شتەکانی تر کرد. (حوسێن زوڕناژەن) لە سەرۆکی شارەوانی پرسی:

- مۆسیقا لێ بدەین؟

- ئا.. وا..تف.. هەستمان ئەوەندە بڵاوە، لە بیرمان چوو مارش لێ بدەین. بڕیار بوو کە پارێزگار لە ماشین دابەزی، موسیقای مارشی سەلامی رەسمی لێ بدا.

سەرۆکی شارەوانی بەو خەیاڵەوە، بە سەر، ئاماژەی دایە (زوڕناژەن) کە دەست پێ بکا.بەڵام (زوڕناژەن) لە باتی مارش دەستی بە ئاوازێکی گۆرانی کۆڵانان کرد:

- باشە، برا، ئەم پارێزگارە ئەقڵی دروستو تەواوی لای کەس نەهێشتووە. زوڕناژەنیش وەکوو ئێمە دەستەپاچە ببوو، خۆیشی نەیدەزانی چ دەکا.

سەرۆك شارەوانی داماو وەکوو مریشکی سەربڕاو هەر دەستی بڵند دەکردو دەیهێنایە خوارێو لە پشت پارێزگارەوە ئاماژەی بە زوڕناژەن دەدا ئاوازەکە بگۆڕێ. ئەم جارە، زوڕناژەن وایزانی سەرۆکی شارەوانی مەبەستی ئەوەیە ئاوازی سەما لێ بدا. لە پڕ ئاوازی گۆرانی بڕیو دەستی بە ئاوازی ئاوداری سەمای ( پشتم وشك بووە) کرد.

دە کخوا زەلیلت کا، (حوسێن زوڕناژەن)! سەگباب، ئەوەندە بە هونەرەکەتت هەڵدەگوت، ئەمە بوو هەنەرەکەت؟!

پارێزگار سەرنجێکی ئەوەندە تووڕەی لە فەرماندار دا، ئەوەندەی نەما بوو ئەو داماوە دڵی لە کار بکەوێ. فەرمانداریش چاوی لە سەرۆکی شارەوانی زەق کردەوە.. سەرۆکی شارەوانی رایکرد بۆ لای زوڕناژەنو هاواری کرد:

دەنگت ببڕە، گەلحۆ!

جەناب، بە خوا گێژ بوویم، نازانم چ غەلەتێکم کرد...

پارێزگار وای زانی بە قەستی ئەو ئیشانە دەکەن، لە پڕ وەکوو ئاگرپڕژێن دەربوو...لە کاتێکا کە ئەو هاواری دەکردو جوێنی دەدا، تۆپی سەرتیپی (محەمەد) لە سەر تەپۆلکەگە کەوتە کار... لە ناسازیی کار، ئەو تۆپەی لە رۆژانی رەمەزان دەنگی دەرنەدەهاتو خەڵك لەسەر تەقان و نەتەقانی گرەویان دەکرد، ئێستا رمبەیەکی وای لێوە هات، هەموو دەرگەو پەنجەرەکانی شارۆچکەکەی هەژاندەوە.

پارێزگار لەگەڵ بیستنی دەنگی تۆپەکە لە پڕ راچڵەکی و هەتا هات بپرسی: ئەوە چ بوو؟ تۆپەکە بۆ جار دووەم تەقی و دوای ئەوە بۆ جاری سێیەم و... چوارەم و...پێنجەم...زەمین و زەمان بە دەنگی تۆپەکە دەلەرزی، دەتگوت شەڕە لە هەوراز شارۆچکەکەو شەستیرو تۆپی تەیارەشکێنیان خستۆتە کار...

بێجگە لە ئێمە پارێزگاریش وڕ بوو:

- ئەم دەنگو هەرایە چییە؟! زوو کپی کەنەوە.

(شوکری بێ پاژنە)مان دۆزییەوە:

- کورە، زوو غاردە، برۆ بە سەرتیپ (محەمەد) بڵێ: بابە، بەسسە، ئەو تۆپە کپ کەرەوە.

(شوکری) گوتی:

- من ناتوانم بچم!

- بۆچی؟

- مام (محەمەد) قەدەغەی کردووە، دەڵێ: هیچ کەس هەقی نییە لە حەوشەی قوتابخانەوە وێرەوتر بێ. خەتەرە!!

تۆپ یەك لە دوای یەك دەتەقین.

ئێستا وەرە تەماشای پارێزگار بکە، لە رکان رەنگی رەش ببوو... سەرۆکی شارەوانی کە بارو دۆخەکەی بەم جۆرە بینی، گوتی:

- بابە، هەرچی دەبێ با ببێ...

جـەنابی پارێزگـار چـووە لای کورسـی گوتـاردان. ویسـتی تـاقی بکاتـەوە.. تـۆ تەماشـای ناسـازیی کـار بکـە، ئـەو بـەردەی لـە بـن پێچکەی کورسـییەکەیان نـابوو دەرپەڕیو کورسییەکە لار بووەوەو ئەو دۆلکە ئاوەی لە سـەریان دانـا بـوو بـە سـەر جلی جەنابی والیدا رژا!! پارێزگار وەکوو پارچە بـارووتێکی لێ هـات. یـەك لـە سـەر یەك هاواری دەکردو جوێنی دەدا. دیار نەبوو ئاخۆ جوێن بە فەرماندرای بـە زاتو بە جەرگی ئێمە دەدا، یان بەوانەی تر؟

لەو کاتەدا، (مەلا بەدری ئاقڵمەنـد) دەسـتی بـە تـەکبیر ئێـدان کـردو (عوسمـان قەساب)یش گامێشی لە عەردی دا و کێردی بە گەرووی داهێنا.

خوێن وەکوو فیچقە پەلامیزەی هاویشتو جلی پارێزگار هەموو بە خـوێن بـوو. جلەوی گار لە دەست هەموو لایەك بەر ببوو. دەتگوت هەموو شێت بووین...

خودایە ئەو بەڵایانە چین لە هەموو لایەکەوە بـە سـەرماندا دەبـارن. نـازانم لـە بەر دەنگی تۆپەکان بـوو، یـان لـە بـەر دۆڵو زورنـا بـوو هـەموو خوێنیـان هـاتبووە جۆش. دۆخەکە زۆر تێکەڵلایی بوو. سەیرم کرد دیم جـەنابی سـەرۆکی شـارەوانی بە پەلە دەڕوا. رام کرد بە دوایەوەو پرسیم:

- جەنابی سەرۆکی شارەوانی، دەچیتە کوێ؟

- ئیتر ناگرێ لەم شارۆچکەیە بمێنینەوە. ئەم پارێزگارە فەرمان دەدا لـە دارمـان بدەن... ئەوە من رۆیشتم!! لـە هـەمان کاتـدا، دیمـان (زەبـووك زادە) لـەولاوە هـات. ئەویش چ هاتنێك. واتدەزانی لـە دەسـت رێگـران رادەکـا. دەمو چـاوی رەشو سـوور هەڵگـەڕا بـوو. قـژی ئاڵۆزکـا بـووو بـەو سـەکوتییەوە وا دیـار بـوو بـارو دوخـی نائاسـاییە. ئێمـە بـە بینینـی زۆر شـادو شـەنگوڵ بـووین . گوتمـان دێو گرفتـاری دەسـتی پارێزگـار دەبـێو پارێزگـار هـەموو رقـی دڵـی خـۆی بـە سـەر سـەری ئـەودا دەڕێژێ.

(مەلا بەدر) لە هەمووان بە کەیفتر بوو، گوتی:

- هاوڕێینە، بەزمەکەمان خەریکە خۆش دەبێ! کاتێ نێچیر بە پێی خۆی بۆ تەلە بچێ، تامی خۆی هەیە! (زەبووك زادە) لە کاتێکی باش هات ... دەبێ کەم‌و کورتییەکان لە ملی ئەو را بکەین.

ئەوەی بە زوڕناژەنی گوتبوو ئاوازی سەما لێ بدا، (زەبووك زادە) بوو، بەردەکە (زەبووك زادە) لە بن پێچکەی کورسییەکەی دانا بوو، ئەو بوو دەستووری دابوو گوللە تۆپ بتەقێنن... ئەو گوتبووی گامێش بکەنە قوربانی. ئەو گوتبووی دروشمەکان بچەقێنن . ئەو گوتبووی پیویست بە گوێ ناکا. ئێمە هەموومان شایەتین.

ئێستا باشترین کاتە بۆ ئەوەی تۆڵە لەو قۆڵبڕە بکەینەوەو لە دەستی بحەسێینەوە. کوڕینە، لە بیرتان نەچێ بچن قسەی تر بکەن، ها!

هەموو وەڵاممان دایەوە: نانا. لە بیر ناکەین.

(زەبووك زادە) وەکوو بای باحوڕە دەهات. کە نزیك کەوتەوە دیمان سێ کەس دوو بە دووی دەهاتن. ئەو سێ کەسە (حوسێنە رەش)و نەجیبزادەو نۆکەری نەجیبزادە بوون. مەعلووم بوو ئەو سێ کەسە نیازیان وا بوو (زەبووك زادە) بکوژن.

ئەوجا وەرە پێکی بێنە...پیس‌و پلۆخی کەم بوو، ئەمە قوڕەکەی خەستتر کرد. ئێستا ئەگەر لە بەر دەم جەنابی پارێزگار تاوانێك بکەن!؟

(زەبووك زادە) کە هاتە ناو گۆڕەپانەکە، دەستی کردەوەو رووی کردە لای پارێزگار.-

- بەه بەه! پارێزگاری گەورە بە خێر بێی بۆ شارۆچکەکەمان!

وەکوو برادەرێ کە دوای ساڵەهای ساڵ بە سەردانی هاوڕێیەکی ئازیزی سەرفراز بووبێ، دەستی لە ملی پارێزگار کرد. ئەوەندی نەما بوو دوو ماچیشی لە لێوەکان بکا...

پارێزگار واقی وڕما بوو نەیدەزانی ئەمە کێیە مۆڵەت ناداو هەژدەر هەژدەر قسە دەکا.

- بە خێر هاتی پارێزگاری گەورە...چاومان روون. زۆر چاوەڕێی دیداری تۆمان کرد. جەنابی (هادی) خەبەری دامێ کە ئێوە تەشریف دێنن. پیاوێکە باشە، لە ئێوە باشتر نەبێ... لەگەڵ من زۆر بە لوتفە. یەکێکە لە برادەرە نزیکەکانی من. لە نامەکەیدا بۆی نووسیبووم: دەستوورم داوە پارێزگارێکی باش بۆ هەرێمەکەتان دابنرێ. دەبێ قەدری بگرن.

بە راستی دەبێ سوپاسی بکەین کە ئێوەی بۆ ناردووین.

پارێزگار نەیدەزانی چ وەڵامێکی ئەم کابرایە بداتەوە... مات ببوو. ئەمە کێیە ئەوەندە خۆی بە نزیك پێشان دەدا؟ سەرۆکی شارەوانی لە تەنیشتم وەستا بوو. لیم پرسی:

- ئەو جەنابی (هادی)یە کێیە، (زەمبووك زادە) باسی دەکا؟

نوێنەری ئەنجوومەنە. نوێنەرێکی گەورەیە. کەسێکە بە یەك هەستان‌و دانیشتن دەوڵەت دەڕووخێنێ.

- راستە (زەمبووك زادە) برادەرایەتی لەگەڵ هەیە؟!

سەرۆکی شارەوانی تووڕە بوو:

- تۆ لە کوێ نووستووی؟ هێشتا ئەو (زەمبووك زادە)یە ناناسی؟ قسەی وا دەکەی؟

- هەڵبەت ئەو کابرایە وێنەی (هادی) لە رۆژنامەدا دیوەو ناوی بیستووە، ئێستا خۆی پێوە نووساندووە. پارێزگار ئەو کابرایە دەناسێ بەڵام ئاگاداری فێڵ‌و کەڵەکی ئەمە نییە...

تۆ سەیری سەرو سیمای بکە، باوەڕی کردووە، (زەمبووك زادە) ئەگەر لەگەڵ جەنابی (هادی) یەك ماڵیش نەبێ، دۆستێکی گیانی بە گیانیە... ناشتوانێ بچێ لە جەنابی (هادی) بپرسێ: ئەرێ (زەمبووك زادە) دۆستی ئێوەیە؟ یان نا؟ قسەیەکی

نەستەق هەیە دەڵێ: (سەگ لە بەر سێبەری دیوار وەردەکەوێو بە خەیاڵ وا تێ دەگا پیاوێکی هونەرمەندە.)

ئەم زەبووکەی ئێمەیش چۆتە ژێر سایەی نوێنەری گەورەو پارێزگاری باش هەڵخەڵتاندووە...

(زەبووك زادە) قۆڵی لە قۆڵی پارێزگار هەڵکێشاو دەستی بە تەڵەکەبازی کرد.

- پێش جەنابت پارێزگارێکی خراپ لێرە بوو. خەڵکی لە زەواق نا بوو. نامەیەکم بۆ جەنابی (هادی) نووسی، گوتم: (هادی) گیان، برای ئازیزم، ئەوە چڵ ساڵە یەك جار ئیشمان بە تۆ کەوتووە. پارێزگارێکی باشمان بۆ بنێرە. ئەویش یەکسەر وەڵامی دامەوە: حەفتەیەکی تری پێ ناچێ پارێزگار دەگۆڕم.

پارێزگار بە تەواوی باوەڕی کرد. داماوە، سووچیشی نەبوو. (زەبووك زادە)ی بێ شەرەف بە جۆرێ قسەی دەکرد، هەر کەسێکی تریش لە جێی ئەو بوایە بڕوای دەکرد.دەستیان لە ناو دەستی یەك نا...ئەو پارێزگارەی کە تا پێش چەند دەقیقەیەك، ئەوەندە تووڕەو تەوسن بوو، ئێستا نەرم ببووو لەگەڵ (زەبووك زادە) سوحبەتو قسەی خۆییان دەکرد.

فەرماندارو سەرۆکی شارەوانیو سەرپەرشتیاری پارت لە لای گۆڕەپانەکە وەستابوونو تەماشای ئەم دیمەنەیان دەکرد. لە پڕ (زەبووك زادە) هاواری کرد:

هەی وا وا لێ کراوینە! بۆچی ئەو دروشمە مشك خواردووانەتان هەڵواسیوە؟ بۆچی بەردتان لە بن پێچکەی کورسی داناوە، تا بەربێتەوە؟ ئاخر هەی بێ ئاقڵینە، ئێوە کە سەرەدەری لە هیچ دەرناکەن، لانی کەم بپرسن؟

ئێمە زاتمان نەدەکرد وەڵامی بدەینەوە. هەروا بە بێ دەنگی وەستابووینو گوێمان راگرتبوو. (زەبووك زادە)، کە باش قسەکانی کردو ئێمەی نائومێد کرد، چاوی بڕییە ئەو سەری گۆڕەپانەکە...

فەرماندار دەست لە سەر سینگ وەستا بوو، پرسی:

جەنابی (زەبووك زادە)، چاو لە کێ دەگێڕی؟

(زەبووك زادە) بە دەست ئاماژەی كرد:

- ئەو كابرا نەجیبزادەیەم بۆ بێنن....

(زەبووك زادە) بە ئاشنابوونی لەگەڵ پارێزگار هێزێكی وای بەبەردا چووبوو، هەر مەپرسە! فەرماندار ئاماژەی بۆ سەرۆكی جەندرمە كرد:

-برۆ ئەو نەجیبزادەیە بدۆزەوەو بیهێنە حزوور جەنابی (زەبووك زادە).

نەجیبزادەو (حوسێنە رەش)، كە دیتیان (زەبووك زادە) لەگەڵ پارێزگار بە ئاشنا دەرچوو. یەكسەر مافنگیان لێداو چوون خۆیان لە پشت دوكانی (نەسرەتە كەچەڵی بەقاڵ) شاردەوە...

سەرۆكی جەندرمە هەرسێكیانی دۆزییەوەو هێنانی. هەرسێكیان وەكوو سەگێكی كەوتبێتە ناو ئاو چرك‌و هۆڕ دەلەرزین.

(زەبووك زادە) خەندەی سەركەوتنی كەوتبووە سەر لێو. بە نەجیبزادەی گوت:

- كورە، ئەو كورسییە هەڵگرە، بیبە لە جێیەكی باشی دانێ:

ئاماژەیشی بۆ (حوسێنە رەش) كرد گوتی:

- تۆیش، تا سبەی بەیانی لە هەر كوێ بێ، دەبێ چەپكە گوڵێك پەیدا بكەی...

هەردووكیان بێ دەستی خۆیان ئیكلامیان كێشا.

- بە چاوان، قوربان.

- برۆن. ئەگەر كەمتەرخەمی لە فەرمان بكەن، هەرچیتان بە سەر بێ لە ملە خۆتانە...

ئینجا (زەبووك زادە) دەستی پارێزگاری گرت‌و یەكەو راست بردی بۆ ماڵی خۆی.

ئامادەبووان وەكوو پارچە سەهۆڵێ كە لە بەر گەرمای هاوینی دابنێن توانەوە... دوای ئەوە كێ دەتوانێ بەرامبەر (زەبووك زادە) بوەستێ؟

دوای ئەوەی پارێزگارو (زەبووك زادە) رۆیشتن، دیمان سەرتیپ (محەمەد) خەریكە لە چیا دێتە خوارەوە. فەرماندار گوتی:

- کورە، تۆ دەتگوت باررووتم نییە تۆپ بتەقێنم، ئەدی ئەم هەموو ترە ترە چ بوو دەتکرد...

- لوولەی تۆپەکە گیرا بوو نەمدەتوانی تۆپ بتەقێنم...برە بارووتێکم هەبوو، ئاگرم تێدا بەردا، حیسابەکەم لە دەست چووە دەرەوە!!

بەڵێ برا، (زەبووک زادە)ی ئێمە زۆر ئاین‌و ئۆین شارەزایە بۆیە هیچ کەس ناتوانێ لەگەڵی دەر ببا. کابرا یەکسەر سەرەداوی پارێزگاری بە دەستەوە گرت و وەکوو سەرۆك وەزیرانێك جلەوی گرد.

ئەو کابرایە ئیشی سەیرو سەمەرە دەکا. لە دونیادا کەس شتی وای نەدیوەو نەبیستووە. لێرە کەس نییە فریوی ئەوی نەخواردبێ... تۆیش لە بەر ئەوەی غەریبی‌و کەست نییە، دەبێ زۆر ئاگاداری خۆت بیت، تەکا تۆیش بکەویتە داوییەوە.

# (10)

## (شاندی دەوڵەت میوانی (زەمبووك زادە)یە)

غەدیربەرهەڵستکاریش لە (زەمبووك زادە) پڕ ببوو. ڕۆژێ، گوێم دایە قسەکانی بە دەنگێکی پڕ ڤین گوتی:

- برا، هیچو پووچی ئەو پیاوە بە قسە بەرجەستە ناکرێ. مرۆڤ باسی مردوێتی بکا لەوە باشترە باسی زیندوێتی بکا.

ئەو کابرایە قەت هیچ کەڵکی لەگەڵ هەستانو دانیشتنی نییە. حەیف بۆ ئەو زمانەی بە قسە کردن لەگەڵ ئەو دەگەڕێ. نامەردێکی وایە هەر کەسێ تەماشای رووی بێ نووری بکا، دڵی رەش دەبێ. ئەو حەرامزادەیە منی وەکوو ژن گریاند... هەرچەندە شتەکە سووچی خۆمانە. لە یەکەم ڕۆژەوە هەرچی کردی، هیچمان پێ نەگوت. هەر هیچو پووچییەکی کرد بەسەر خۆمان نەهێنا تا کار بێرە گەیشت. ئێستا ئیتر کار لە کار ترازاوە. هەرچەندە بسووتێین، فایدەی نییە...

بێناموس ئێمەی سووتاندو خۆڵەمێشەکەمانی بە با کرد. ئێوەو خودا، سەیری ئەم حوکوومەتە بکەن. فەرمانبەری گەورە دێ لە ماڵێ چ کەسێ میوان دەبێ

قەت لە بیرم ناچێ دەڵێی دوێنێ بوو.. ڕۆژی هەینی، لە نوێژی جەمات هاتینە دەرەوە. لەگەڵ چەند برادەرێك لە حەوشەی مزگەوت خەریکی قسە بووین، جەنابی (رەزا)ی میرزای فەرماندار گوتی:

بە ڕاست، بیستووتانە دەڵێن میوانەکانی (زەمبووك زادە) ئەم شەو دێن؟

جەنابی (مورتەزا)، خوا سەلامەتی کا، وەڵامی دایەوە:

بەلێ، بیستوومانە دوای ئەم هەموو ئەمرۆ نا سبەی کردنە، ئاخیری خەریکن دێن.

- زۆر باشە، لانی کەم دێن شارۆچکەکەمان دەبینن کە خاکی مردووانی بە سەر دا کراوە.

- راست دەفەرموون هاتنی شاندی دەولەت بۆ ئێرە شتێکی زۆر چاکە. هەر بژی (زەبووك زادە). لە سای سەری ئەوەوە شارۆچکەکەمان ئاوەدان دەبێتەوە. خوا لە چاوی حەسوودانی بپارێزێ!!

- بە بیستنی ئەم قسانە مێشکم لە سەردا نەما. ئاخر بابە گیان، خەلکی هەرێمی ئێمە ئەقلیان نییە. هەموو دەزانن ئەم (زەبووك زادە)یە چ بێناموویسێکە، لەگەل ئەوەشدا، پێی هەلدەلێن... وێنەی لە مێژووی ئێمەدا پەیدا نابێ. ئەو نامەردە لە سەر یەك پێ حەفتا جۆرە درۆ هەلدەبەستێ. ئەگەر شەیتانیش بچێتە خەونی، شەیتان تەفرە دەداو بە چاوی بە فرمێسكو قوونی بێ شەلوار رەوانەی دەکاتەوە.

کەس نییە ئەو تەفرەی نەدابێ. لەگەلّ ئەوەشدا،خەلکی شارۆچکەکەمان هەر دوعای بۆ دەکەن کە مایەی خێرو بەرەکەتی ئێمەیە.

ئەم کۆڕەی دوعاو پیاهەلدانە دەوری دوو سەعاتی خایاند، هەروا لە حەوشەی قوتابخانە بە پێوە وەستابووینو قسەمان لە چاکەو زرنگی (زەبووك زادە) دەکرد.

خودایە! خودێیۆ!! ئێمە بۆچی میللەتێکی ئاوهاین؟!و وەکوو قسە نەستەقەکە دەلێ: (لە هەر لایەکەوە بای بێ، لەولاوە شەنەبا دەکەین!)

ئاخری کۆڕەکە تێك چوو. لە مزگەت هاتمە دەرەوەو رووم کردە مالەوە. ئەوەندەم گوێ دابووە درۆی ئەوانی ترو وەلامم نەدابوونەوە، لە بەر خەفەتو ناڕەحەتی گەرووم گیرا بوو، خەریك بوو دیق بکەم... لە دلی خۆمدا گوتم: ئای چەند چاك بوو ئێستا لە ناحەزێکی (زەبووك زادە) راست هاتبامو نەختێ دەردەدلی خۆم لا کردبا.

قوربانی خودا بم... یەکسەر دوعام قەبووڵ بووو (هەمزە جووت بەدزادە) لە سەر ڕێم پەیدا بوو. ئەمە ئەو کەسەیە ئەگەر خوێنی (زەبووك زادە) فڕ بکا، گڕی دەروونی دانامرکێتەوە.!

هۆکەیشی ئەوەیە (زەبووك زادە) دەیەوێ سەرۆکایەتی شارەوانی لە دەست دەربێنێ..

ئەگەر هەر کاتێکی تر بوایە، لە بەر ئەوەی (جووت بەدزادە) نەهاتبووە مزگەوتو بەشداری نوێژی هەینی نەکردبوو، چەند تانەو تەشەرێکم لێ دەدا، بەڵام لە بەر ئەوەی بە دوای یەکێ دا دەگەڕام گڕێی دڵی خۆمی بۆ بکەمەوە، هیچم نەگوت، بگرە یەك دونیا کەیفخۆشیش بووم. بە ڕوویەکی خۆش سەلامی لێ وەرگرتمەوەو چاكو چونی لەگەڵ کردم.

(جووت بەدزادە) لێ نەگەڕا ئەحواڵپرسی من تەواو ببێ، لە پاش ملە کەوتە زەمی (زەبووك زادە).

- ئەو بێناموسو هیچو پووچە وا دەزانێ ئێمە زۆر گەوجین. لە هەموو شوێنێ بلاوی کردۆتەوە ئەم شەو شاندی دەوڵەت دەبن بە میوانی. من نازانم ئەو بۆرە پیاوە مەبەستی لە بلاو کردنەوەی ئەو شتە پڕوپووچانە چییە؟ ئێمە ئەگەر چاو لە حەپە حەپی ئەم سەگە بپۆشین، بەیانی دەڵێ: (شاژنی ئینگلتەرە یەکێکە لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی خۆمو دەیەوێ بێتە سەردانم، بەڵام لەبەر ئەوەی من دڵم لێ ڕەنجاوە وەڵامی نامەکەیم نەدایەوە.) خەڵك، کە هەر نەوەندە ئەقڵیان دەبڕێ، باوەڕ بە قسەی ئەو بێناموسە دەکەن. دەمەوێ یەکێکمان لێ هەڵبکەوێ بەرامبەر بەو نامەردە بوەستێو لە بن پێڵەقە پانی بکاتەوە... بە خوا هەر کەسێ ئەو کابرایە بکوژێ، یەکسەر جێگای ناو بەهەشتە.

- من کەیفم بە قسەکانی سەرۆکی شارەوانی دەهاتو چێژم لێ وەردەگرت، نازانم چۆن لە پڕ ڕووم گرژ کردو گوتم:

- ئەم قسانە چییە؟ جەنابی (هەمزە)، ئێوە ئاگاتان لە هاتنی شاندی دەوڵەت نییە بۆ ماڵی (زەبووك زادە)؟ تف!!!... بە راستی سەرۆك شارەوانییەكی سەیری! بەڵێ، جەناب، راستەو شاندی دەوڵەت بۆ خاتری (زەبووك زادە) دێتە شارۆچكەكەمان‌و لە نزیكەوە بارو دۆخی ئێمە دەبینن. بە راستی ئێمە مرۆڤی نمەك بە حەرامین! لە باتی ئەوەی (زەبووك زادە) لە سەر چاوی خۆمان دابنێین‌و مەمنوونی بین كە شاندی دەوڵەتی هێناوەتە شارۆچكەكەمان، لە حەسوودییان لەزگە بتەقین‌و پاش ملە قسەی خراپی دەرهەق دەكەین...

(جووت بەدزادە) لە قسەكانی من زۆر حەپەسا. رەنگی رەش هەڵگەڕا. وەكوو مرۆڤی جادوو لێكراو چاوی بڕییە دەمی من... دەتگوت ئێستایش گومانی هەیە كە ئەم قسانە لە دەمی من بێنە دەرەوە..

بارو دۆخی من خۆیشم ئەوەندە لە هی ئەو باشتر نەبوو...نەمدەزانی ئەم قسانە چین دەیانكەم.! تا پێش چەند دەقیقەیەك، ئارەزووم دەكرد یەكێ پەیدا ببێ دەردەدڵی خۆمی لا بكەم، كەچی لە پڕ بیرو رام گۆڕا؟!

دوای چەند دەقیقەیەك، (جووت بەدزادە) خۆی كۆكردەوەو بە پێكەنینێكی تایبەتی گوتی:

- كورە، بە گاڵتەم بوو!... كێ هەیە نكوولی لە ئیشە باشەكانی (زەبووك زادە) بكا؟ من دەمەویست بزانم تۆ چ دەڵێی؟ ئەگەر نا پیاوێكی پیاو تەواو بێ، قەت پاش ملە بە خراپە باسی (زەبووك زادە) دەكا؟!

بەدەم سەربادان‌و ئەستەغفیرەڵلا كردن ملی رێـر گرت‌و رۆیشت. من هاتمەوە ماڵێ. ئەوەندە تووڕەو نارەحەت بووم ئەگەر خەنجەرت لێ دابام خوێنم لێ نەدەهات. دەستم بە سەرمەوە گرت‌و لە بیركردنەوەیەكی قووڵدا نقووم بووم.

ئاخر ئێمە بۆچی بەو جۆرەین؟ ئەو (زەبووك زادە)یە، كە كەس نازانێ كوڕی كێیە، دەردێكی پێ كردووین هەموومان لە سەر یەك پەنجە دەسووڕێنێ. هەر چەندە كڵاوی لە سەری هەمووومان ناوەو هەر یەكێكی بە جۆرێ ئازار داوە، لەگەڵ

ئەوەشدا، خۆمان بە قوربانی دەکەین‌و باوەڕ بە هەموو درۆکانی دەکەین. ئەگەر دڵی بنیادەم کێو بێ، خۆی لە بەر ئەو هەموو درۆیە راناگرێ بەڵام ئێمە خورتی لە دڵی خۆمان دەکەین تا باوەڕ بەو درۆیانە بکا...

ئێمە حاڵمان وەکو حاڵی قوماربـاز وایـە...قوماریاز هەرچـەندە دەبینـێ بـەخت پشـتی تـێ کـردووەو باشـی بـۆ نایـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا حـەز دەکـا دووبـارە تـێ هەڵچێتەوە. دەڵێ بەڵکو ئەم جارە دەبەمەوە . ئێمەیش خاتر جەمین کە (زەبـووك زادە) درۆ دەکا بەڵام دەڵێین بەڵکو ئەم جارە راست بکا!... ئـەو فێـڵ‌و تەڵەکەی لـە ئێمەی دەکا سـەرێکی لـە تـاقی ئاسمانـەو سـەرەکەی تـری لـە بـن حـەفت تەبەقـەی زەوییە... ئێستایش ئێمە بۆ ئەوەی سەر لە فێڵ‌و تەڵەکانی دەر بکەین، بـەو پـەڕی ئارەزووە درۆکانی هەرس دەکەین.

هەروا کە لەم بیرکردنەوەیەدا، نقووم ببووم، (یەك دانە)ی کچم هاتـە ژوورەوەو گوتی:

- باوکە گیان، مام (هەمزە) هاتووە ئیشی پێتە.

- پێی بڵێ بفەرموێ.

دوای ئەحواڵپرسی (هەمزە جووت بەدزادە) گوتی:

- ئێستا کە هاتنی شاندی دەوڵەت بە راست گەڕاوە، من دەبێ بە ناوی میللەتەوە گوتارێکی بە خێرهێنان ئامادە بکەم. گاڵتە نییە شـاندی دەوڵـەت بێتـە شارۆچکەی ئێمە. دەبێ بە چاکی پێشوازییان بکەین. دۆڵ‌و زوڕنایـان لـە پـێش بگێـڕین...و بـە سەلام‌و سەلەوات بیانهێنینە ناو شارۆچکەکەمان.

وەڵامم دایەوە:

- ئێوە راست دەفەرموون بەڵام حەیف درەنگ داهاتووە.

- نا... زۆریش درەنگ دا نەهاتووە...هەستە جلت لە بەر کە بـا برۆینـە دەرەوە. ئێستا کاتی دانیشتن نییە...

لەگەڵ جەنابی هەمزە یەکەم جار چووینە شارەوانیو لەوێوەیش چووینە بارەگای پارت. ئەو کاتە (مەلا بەدری ئاقڵمەند) سکرتێری گشتی پارت بوو. (مەلا بەدر) گوتی:

- راست دەفەرموون بەڵام ئەوانە میوانی (زەبووك زادە)ن. پێویستە پرس بەو بکەینو هەرچی ئەو گوتی وا بکەین.

هەرسێکمان چووینە ماڵی (زەبووك زادە). چمان دیبێ باشە!؟ ماڵی (زەبووك زادە) دەتگوت ماڵی بووکە. جەنابی (سەبری)و (موختار ئالوو) مەڕیان سەر بڕیبووو بە درەختیان هەڵواسیبووو خەریکی کەوڵ کردنیان بوون. (نووری سەفار) بەم لاو بەولادا رایدەکرد. (حەقی سلێمان) دەتگوت لە زەماوەندی کوڕەکەی خزمەت دەکا. وەکوو مەلەوان ئارەقەی لە سەرو چاوی دەهاتە خوارێ.! دایکی (زەبووك زادە) گوتی:

- فەرموون، وەرنە ژوورەوە...

هەرسێکمان ئیکلامان بۆ دایکی (زەبووك زادە) کێشا.

- ماندوو نەبی، باجی...

ئەو ژنە شێوەیەکی بە خۆیەوە گرت، چ بڵێم!!! بەو تەمەنە پشتەچاوی نەخشاند بووو پێکەنینێکی تایبەتی دەکرد.

- مێرسی... مرۆڤ ئەگەر گیانیشی لە پێناوی میللەت بکاتە قوربانی هێشتا کەمە...

چووووینە ژوورەوە. هەر جۆرە خواردنو شیرینییەکی بتەوێ ئامادەیان کردبوو: مریشکی برژاوو شلەی زەردەچێوو قەیماغو... مرۆڤ کە تەماشای دەکرد دەمی ئاوی دەکرد.

(ئەمین بازرگان) سەری هێنایە بن گوێمو بە هێواشی گوتی:

تا پێش چەند دەقیقەیەك باوەڕم نەدەکرد، شتەکە راست بێو شاندی دەوڵەت بێنە شارۆچکەکەمان بەڵام ئێستا بە تەواوی باوەڕم هات دێن.ئەویش چ دۆرە

هاتنێك؟ بێ شك بە دارو دەستەوە دێن..ئەو خواردنانەی ئەو ژنە دروستی کردوون، بایی یەك مانگ ورگ لەوەڕاندنی ئەژدەهای سەر کەل دەکا.

دوای (ئەمین بازرگان)، (ئیحسان تەقاویت) لە بن گوێم گوتی:

- ئەو (زەبووك زادە) بێ شەرەفە شاندی دەوڵەتیش تەفرە نەدا؟

نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە چونکە ئەو (کلکبڕاوە) هەر چی بڵێ، لێی دێ.

ئاخیری جەنابی (هەمزە) بە دایکی (زەبووك زادە)ی گوت:

- باجی گیان، بە کوڕەکەت بڵێ ئەگەر روخسەت بفەرموون دەمانەوێ هەندێ قسەی لەگەڵ بکەین.

پیرەژن رۆیشتو دوای چەند دەقیقەیەك لە سەر پلیکانەوە بانگی کرد:

- فەرموون، وەرنە سەرەوە....

توخوا تەماشا کەن ئەو (زەبووك زادە)یە چەند بێ شەرەفە!! پیاوی هەرە گەورەی شارۆچکەکە هاتوونەتە ماڵت، دە لە جێی خۆت هەستە، وەرە پێشوازییان... خۆت لە ژووری مات کردووەو فەرمان دەر دەکەی...گەلحۆ، ئەوانە هەر یەکە لە تەمەنی باوکی تۆن. هەستە، وەرە دەرەوە.

هەمووومان لەو کارە ناجۆرەی (زەبووك زادە) ناڕەحەت بووین...(مەلا بەدری ئاقڵمەند) لە تووڕەییان سەری لووتی سوور هەڵگەڕا بوو. بە بۆڵە بۆڵ گوتی:

- ئەم (زەبووك زادە) بێ شەرەفە سووچی نییە.. سووچ سووچی جەنابی پارێزگارە ئاوڕ لە ماڵی فەرماندارو سەرۆکی شارەوانیو ماڵی پارت ناداتەوە، دەچێتە ماڵە کاول بووەکەی ئەم.

لە خوارەوەی پلیکانە پێڵاومان داکەندو چووینە سەلال. (مەلا بەدر) پێش دەقیقەیەك جوێنی دەدا، ئێستا دەتگوت دەچێتەسەردانی پیاوێکی گەورەی دینی... پێش هەموومانو بە رێزەوە چووە ژوورێ... ئەوەندەی نەمابوو لەگەڵ بینینی (زەبووك زادە)دا، سەلاوات لێ بدا...

(زەبـووك زادە)ی هـیچو پـووچ تەنانــەت لــە بەریشـمان هەڵنەسـتا. لـە گـوێ دانیشتبوو، هەر لەوێ گوتی:

- فەرموون، بەخێر بێن!

دانیشتین... چاكو چۆنیمان كرد. (زەبـووك زادە) هـەر بـە خەیاڵیشی دانـەهات بپرسێ چ ئیشمان هەبە؟و بۆچی هاتووین؟

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) سەری قسانی كردەوە:

- هەر خوا دەزانێ خـەڵكی ئـەم شارۆچكەیە چـەند مـەمنوونی ئێـوەن!!! ئێمـە قەت ناتوانین چاكەی ئێوە پڕ بكەینەوە. ئەگەر بـە كێشی ئێـوەیش زێـڕ بـە گـۆڕێ وەربكەین، بـوونی ئێـوە بـۆ خـەڵكی ئێـرە هێشتا زیـاتر دێنێ...لـە سایەی ئێـوەوە، شارۆچـكەكەمان ناوبـانگ دەردەكا. هاتووینـە خزمـەتت بپرسـین: شـاندی دەوڵـەت كـەی تەشـریف دێنـێ؟ ئـابڕووی ئێـوە ئـابڕووی ئێمەیە...بـە هـەر حـاڵ ئێمـەیش مرۆڤین، لێ ناگەڕێین ئێوە شەرمەزاری میوانەكان بن. دەمانەوێ پێشوازییەكی زۆر چاكیان بكـەین. تۆپمـان ئامـادە كـردووە. بـۆ ئـەوەی كـە میوانـەكان گەیشتن، تـۆپ بتەقێنین... هەڵبەت بە رای ئێوە بەسراوەتەوە. ئێوە چی بە پەرژەوەنـدی دەزانـن، بفـەرموون ئێمـە جێ بـە جێـی دەكـەین. یەكـەم خـودا، دووەم لـە سـایەی ئێـوەوە دەمانەوێ زۆر بە چاكی پێشوازی میوانەكان بكەین. تەنیا ئێوە بڵێن بـەڵێ، ئـەوەی تر لە سەر ئێمە... خەریك بوو لە چاپلووسیو مـەرایی (مـەلا بـەدر) وە زالـە بـێم. سەیر كە ئەو بۆرە پیـاوە بـە خـۆو بـە یـەك هۆقـە ریش چـۆن چـۆنی قسـە دەكـا؟ ئەوەندی نەماوە لە بەردەم (زەبووك زادە)دا ریشی وەكوو كلكە سەگ بلەقێنێ.

(زەبووك زادە)یش وەك ئەوەی فەتحێكی گـەورەی كردبێ، وەكوو بـت لـە جێـی خۆی دانیشتبوو، چـركە بـە چـركە لەگـەڵ قسـەكانی ئـەو پـیرە سـەگە هەڵـدەدەفاو بڕوای دەكرد كە وابێ. پاشدان بە شـێوەیەكی تایبـەتی دەنگـی لـە تەسـبیحەكەیەوە هێناو گوتی:

- زۆر سوپاسی هەستو سۆزتان دەکەم... ئەوەیش بزانن من هەر کارێکی کە دەیکەم بۆ پێشکەوتنی ئێوەو هاوشارییە ئازیزەکانم دەیکەم. هاتنی شاندی دەوڵەت بۆ شارۆچکەکەمان سوودی زۆری هەیە. ئەوە خۆی لە خۆیەوە سەرکەوتنێکی گرنگە کە حیسابیان بۆ ئێمە کردووەو دێنە ئێرە. بێ گومان ئەوەیش بزانن کە ئەمە سەردانێکی رەسمی نییە. شاندی دەوڵەت هەموو دۆستو برادەری منن، بۆ سەردانێکی تایبەتیو گفتوگۆی نهێنی دێنە ئێرە. بەڵێ، نامەیەکیان بۆ ناردووم، نووسیویانە بۆ گفتوگۆیەکی گرنگ دێین.!

ئێمە هەموو لە سەرسامییان دەممان بەش بووەوە. حاڵەتی دڕدۆنگیو دوودڵی لە سەرو سیمامان شەپۆلی دەدا. (زەبووک زادە) لە مەسەلەکە گەیشتو زۆر بە ئارامیو خوێن ساردی دەستی بۆ سەر مێزی تەنیشت دیوار درێژ کردو نامەیەکی هەلگرتو بۆ (مەلا بەدری ئاقڵمەند)ی راداشت:

- فەرموون... ئەمە نامەکە... ئەمەیش مارکەی دەوڵەتو مۆری تایبەتی. دەتوانی بخوێنیتەوە چۆن سەرۆکی وەزیران بە (برای ئازیزم...) قسەی لەگەڵ کردووم.

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) بۆ رێز لێنان سەری تا سەر ئەژنۆی دانەواند.

-پێی ناوێ... ئەم قسەیە چییە؟ پێویست بە تەماشا کردن ناکا... مۆری دەوڵەت بەو گەورەییە بەسسە!!

زەبووکزادە زیاتر پێی داگرت:

-نەخێر، جەناب، لاریمان نییە...جەنابی سەرۆکی شارەوانی، ئێوە وەریگرن بیخوێننەوە... بیستوومە هەندێ کەس ئێستایش باوەڕ ناکەن.

جەنابی (جووت بەدزادە) پێکەنینێکی تایبەتی کرد:

- ئەوانە مرۆڤی حەسوودو ناتەواون. ئەوەتا مۆرەکەی لە یەك قۆناغ دوورەوە دیارە!!

(زەبووك زادە) نامەکەی فڕێ دایە سەر مێزو گوتی:

- نازانم لە چ شتێ کاریان گرفتی تێکەوتووەو دەیانەوێ بێن پرس بە من بکەن‌و لە بەر ئەوەی نایانەوێ ئیشەکە دەنگی دەربێ، بۆیە بە نهێنی دێن... ئیتر پێویست بە دەهۆڵ‌و زورناو پێشوازی ناکا.

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) دیسان ئیکلامی کێشا:

- هەرچی دەفەرموون بە سەر چاو! ئێمە ویستمان خزمەتێك بگرینە ئەستۆ.

(زەبووك زادە) بەرغەبابەی پڕ با کرد:

- هەموو کارەکە بە ڕێك‌و پێکی دەڕوا... ئێوە بڕۆن، خەیاڵتان ئاسوودە بێ.

هەستاین روخسەتمان خواست...بە جۆرێ کەوتبووینە ژێر کاریگەرییەوە دەتگوت لە حزوور پاشایەگداین. بە تایبەتی (مەلا بەدر) کە بە خۆی دەڵێ ئینسان، ئەوەندەی نەما بوو دەست‌و پێی (زەبووك زادە) ماچ بکا.

پاشەو پاش لە دەرگا هاتینە دەرەوە. (زەبووك زادە) تا بەر دەرگای ژوورەکە بە ڕێی کردین. ئێمە لەوێوە یەکسەر چووینە یانەی مامۆستایان. (مەلا بەدری ئاقڵمەند) گوتی:

- ئێستا زانیتان ئەو بێناموسە هەموو قسەکانی درۆیە.

ئەوەندەی نەما بوو دوو شاخم لە سەر بڕوێ. نەمدەزانی ئەو مەلا گەلۆرە بۆچی ئەوەندە زوو زوو ڕەنگی خۆی دەگۆڕێ.

پرسیم:

- مەلا مەبەستت چییە؟

- ئەگەر شاندی دەوڵەت بە راستی دێتە ماڵی ئەو، بۆچی نەچۆتە پێشوازییان؟ چ هیچ‌و پووچێکە... چ بێ قیمەتێکە...بۆرە پیاو دانارزێ دەڵێ شاندی دەوڵەت بۆ گفت‌و گۆی نهێنی دێنە ماڵمان. ئێوەو خودا، تەماشا کەن ئەو بێناموسە دەیەوێ بەم قسانە دەستخەڕۆمان بدا. لەم وڵاتەدا، بەو هەموو گەورەییە، جێگا قات بووە بۆ کۆنفراس‌و گفت‌و گۆ تا شاندی دەوڵەت بێتە ئەم شارۆچکە دوورەو گفت‌و گۆ

لەگەڵ کابرایەکی قۆڵبڕو تەڵەکەباز بکا. دیارە پیاو لە وڵاتەکەماندا نەماوە! بەخوا درۆ دەکا!... بە پێغەمبەر درۆ دەکا!..

وەڵامم دایەوە:

- بابە گیان، وا دەزانی ئێمە باوەڕمان کردووە؟

جەنابی (هەمزە)ی سەرۆکی شارەوانی زۆر بە سەنگینی گوتی:

- ئەدی ئەو قسانە چ بوو بەرەو رووی دەتکرد؟ ئەو بەدگۆییە چییە؟

(مەلا بەدر) خراپ تێ کەوتبوو نەیدەزانی چ وەڵام بداتەوە. ئاخیری هەر بۆ ئەوەی قسەیەك بکا گوتی:

- بەخوا چوزانم... ئەو بێ شەرمە جادوو لە پیاو دەکا. وەللا وە بیللا من لەوێ دەمزانی درۆ دەکا بەڵام چ بکەم بە دەست خۆم نەبوو. نەمدەتوانی جلەوی خۆم بگرم... ئەگەر دوو تفم لە چاوی بکردایە ئاوها دووری نەدەهاژوا. بەخوا ئیکلامیشی دەکێشاو خۆی بە قوربانو بە سەدەقەمان دەکرد بۆ ئەوەی ئابڕووی نەبەین.

منیش کە بە دڵ قسەکانی (مەلا بەدر)م قەبووڵ بوو گوتم:

- بەخوا راست دەکەی، منیش وام لێ هاتبوو قسەم پێ نەدەکرا. بەڵام ئەگەر تۆ تفێکت لە دوڕ چاوی (زەبووك زادە) بکردایە، منیش زللەیەکی وام لە بنا گوێی دەدا ئاگری لە چاو دەرپەڕیبایەو شیری دایکی لە لووتی بهاتایەوە.

(مەلا بەدر) بە رادەستبوونەوە گوتی:

- وا دیارە هەموو سووچەکە لە ملی منە...!

- بەڵێ، تۆ بڕوات بە درۆیەکانی کرد. ئێمەیش نەمانتوانی هیچ قسە بکەین. نەتدی چۆن لێمان دەپاڕایەوە: (ئێوەو خودا وا مەکەن کەس بە هاتنی شاندی دەوڵەت بزانێ.) نەتزانی بۆچی وا دەڵێ؟ لە ترسی خۆی ئەو قسەیەی دەکرد . دەترسێ ئەو درۆیە شاخدارە لە ناو خەڵك بڵاو ببێتەوەو فەرمانبەران بە دزی

مەسەلەکە بە عەرزی جەنابی پارێزگار بگەیەنن‌و کارێکی وای پێ بکەن بچێ چەند ساڵ نان‌و قەسپ بخوا.

ئەوانی تریش قسەی منیان پشت راست کردەوەو هەر یەکە وەکوو ئەوەی ئیلهامێکی تازەی بۆ هاتبێ‌و نهێنییەکی شاراوەی دۆزیبێتەوە، باسی هەندێ مەسەلەی گرنگی ئەم رووداوەی کرد.

قسەکانمان بە جۆرێ لق‌و پۆپیان هاویشت‌و بە جۆرێ سەرگەرمی گفت‌و گۆ بووین، حیسابی کاتمان لە دەست دەرچوو بوو، نەماندەزانی چ کاتێکە... وردە وردە دونیا تاریك داهات‌و ئێمە هەر لە یانەی مامۆستایان دانیشتبووین‌و بە دەم قسە کردنەوە هەر چاوێکمان کردبوو بە چوار چاوو تەماشای جادەمان دەکرد بزانین کەس دێ؟ یان نا.؟..

هەر ئوتومۆبێلێکی دەهاتە شارۆچکەکەمان دەبوایە بە پێش یانەی مامۆستایاندا بڕوا. هەر چرکەساتێك ترومبێلێك بە لای پەنجەرەدا تێدەپەڕی، بەڵام هیچیان نەدەچوونە لای ماڵی (زەبووك زادە)...

شەوەکانی دی، ئەو کاتە، هیچ کەس لە یانەدا نەبوو. پیاو ماقووڵ‌و گرەگرەکانی شارۆچکەکەمان رەوشتیان وایە شەو زوو دەچنەوە ماڵێ، بەڵام ئەو شەوە، کەس حەزی نەدەکرد بچێتەوە ماڵێ. هەموومان چاوەڕێی شاندی دەولەتمان دەکرد.

(شوکری بێ پاژنە) کە لە هەموومان زیاتر گڕی گرتبوو، بۆ دڵنیایی، کوڕەکەی لە سەری کۆڵانێ کردبوو بە دیدەوان تا ئەگەر ماشینێك لە بەردەم ماڵی (زەبووك زادە) وەستا، یەکسەر بی خەبەرمان بداتێ.

مەلای شێوان بانگی داو (مەلا بەدر) چوو نوێژ بکا... لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەم کرد، عەلبەغەلبێکی سەیر بوو.. سەراپای خەڵکی شارۆچکەکەمان لە تاخەکانی خوارەوە بۆ تەماشا کردنی شاندی دەوڵەت هاتبوونە ئەو ناوە. زەلام لە قاوەخانەکانی سەر رێگا کۆ ببوونەوەو ژن لە پشت پەنجەرەو لە سەر بانان تۆپ ببوون. هەموو چاویان بڕیبووە لای جادە. هەر هێندە دەنگی هۆڕنی ماشینێك

دەهات، یان شەوقی لایتی ترومبێلێك بە جادە دەكەوت، یەكسەر هەموو تا پشدێن خۆیان بۆ لای كۆڵانێ دەچەماندەوەو دەیانگوت: (حكوومەت هات... ) تا ئێستا شتی وا لە شارۆچكەكەمان رووی نەدابوو.

(مەلا بەدر) زوو لە نوێژ هاتەوە. ئاشكرابوو هەموو بیرو زەینی لای شاندی دەوڵەت بوو، ترسا بوو دیداری شاندەكەی لە دەست بچێ، نوێژەكەی لە كورتی بڕیبووەوە. چاوەڕێمان زۆر درێژەی نەكێشا. وردە وردە خەوی قورس هیلاكی كردین.. جەنابی (مورتەزا)، خوا سەلامەتی كا، سەری خسبووە سەر مێزو پرخ‌و هۆڕی بوو. ئەوانەی تریش وێژینگی كورت‌و درێژیان دەدا. لە نكاو ڕا، كوڕی (شوكری بێ پاژنە) بە تەنگاوی بە ژوورێ كەوت، بە زەوق‌و كەیفخۆشی هاواری كرد:

- هاتن...

ئایا دەزانن یەكەم كەس كە لە خەو راپەڕی كێ بوو؟ ئەوە بوو كە پرخ‌و هۆڕی دەگەیشتە ئەو سەری شارۆچكەكەمان.

جەنابی (مورتەزا) گوتی:

- باشە، رۆڵە گیان، باس بكە بزانین چیت دی؟ چەند نەفەرن؟

- دوو ماشین پڕ خەڵك بوون. چوونە لای ماڵی (ئیبراهیم بەگ)... كە گەیشتنە بەر دەرگا، هەردوو لاشیپی دەرگا كرایەوەو ماشینەكان چوونە حەوشەو یەكسەر دەرگا داخرایەوە. منیش یەكسەر بە غارە غار هاتم خەبەرتان بدەمێ...

كوڕەكە ئەم قسانەی دەكردو سەراپای گیانی دەلەرزی. چەقەنەیەكی لێداو گوتی: (دەوڵەت هاتووە... دەوڵەت هاتووە...) هەموو تەماشای دەم‌و چاوی یەكترمان كرد. كەس دەنگی لێوە نەهات. ئینجا بە ئارامی‌و بە بێ دەنگی لە یانە هاتینە دەرەوەو بە چاو وا دیار بوو ملی رێی ماڵەوەمان گرتۆتە بەر، بەڵام من پێم لە دوو نەدەهات. هەرچی دەمكرد نەمدەتوانی بچمەوە ماڵێ. پێم بەرەو ماڵی (زەبووك

زادە)ی دەبردم. لە لایەکی تریشەوە دەترسام یەکێ بمبینێو قسەم بۆ هەڵببەستن بڵێن بۆ زماندزیی چۆتە ماڵی (زەبووك زادە).

هەروا کە هێدی هێدی، بن دیوارو بن دیوار، دەڕۆیشتم، دەنگێکم هاتە بەر گوێ:

- سەلام، (غەدیر بەگ)، ماندوو نەبی... بۆ کوێ؟، کووە هاتوویتە ئەو ناوە؟..

زۆر بە توندی راچڵەکیم. ئەمە چییە؟ کە ئاوڕم لە لای دەنگەکە دایەوە، دیتم جەنابی بەڕێوەبەری ئوتێلە. بزەیەکم بۆ کردو وەڵامم دایەوە:

- مێرسی، خەریکم وەکوو ئێوە بای باڵی خۆم دەدەمو پیاسەیەك دەکەم...

بە یەکەوە چووینە بەر دەمی ماڵی (زەبووك زادە). چەند هاوڕێیەکی تریش هاتبوون. لە کونی دەرگاوە تەماشای ناو باخچەمان کرد. دوو ترومبێل لە ناو باخچە وەستا بوون. بەڵام کەس لە ناو باخچە نەبوو. هەموو پەنجەرەکانی بە سەر جادەدا، دەیانڕوانی پەردەیان دادرابووەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رووناکی چرا لە درزی پەردەکانەوە دەهاتە دەرێ.

لە بەر ئەوەی پەنجەرەکان بڵندبوونو خانوویان لە بەرامبەر نەبوو، بۆیە ناو ژوورەوە نەدەبینرا...

کەواتە هاتنی شاندی دەوڵەت راستەو ئاشکرایە خانووەکەیان بۆ گفتو گۆی نهێنی چۆل کردووە.

(ئیحسان تەقاویت) گوتی:

- باشە، کەواتە ئێمە مانان لیرە کۆبووینەتەوە...

چوو پەرتەی بە منداڵەکانی بەر دەرگا کرد. منیش کە دیم باش نییە لەوە زیاتر لەوێ بوەستم، گەڕامەوە ماڵێ. تازە چووبوومە ناو نوێن بۆ ئەوەی بخەوم، دیتم لە دەرگایان دا. لە دڵی خۆمدا گوتم: (بەم نیوە شەوە، کێیە لە دەرگا دەدا؟)

بە شۆرتو فانیلە چووم دەرگا بکەمەوە. لە پشت دەرگا پرسیم:

- کێیە؟

- بکەوە، مام (غەدیر).

پرسیم:

- خێرە بەو نیوە شەوە؟!

- تۆ دەرگا بکەوە تا پێت بڵێم!!

کە دەرگام کردەوە، ناسیم. کوڕی (شوکری بێ پاژنە) بوو. بە هێنکە هێنک گوتی:

- جەنابی سەرۆکی شارەوانی سەلامی لێ دەکردی. گوتی تەشریف بێنێتە شارەوانی، ئیشمان هەیە.

لە سەرسامییان دەمم بەش بووەوە! ئەمە چ ئیشێکی ئەوەندە گرنگە بەو نیوە شەوە پێویست بکا من بچم؟ پرسیم:

- چ ئیشی هەیە؟

- نازانم. مام (ئەمین)و بەڕێوەبەری ئوتێلو (مەلا بەدر)و جەنابی سەرۆکی شارەوانی... هەموو لە شارەوانی کۆبوونەتەوەو چاوەڕێی ئێوە دەکەن.

هەستام جلم لەبەر کردو بە ڕێ کەوتم. لە شارۆچکەکەماندا، دوای نیوەشەو گلۆپ دەکوژێتەوە. کە گەیشتمە شارەوانی دیم دوو لۆکسییان داگیرساندووەو هاوڕێیان لە دەوری دانیشتوون. (مەلا بەدر)، کە چاوی بە من کەوت، گوتی:

- فەرموو، (غەدیر بەگ). ئیشمان شلۆقە، وەرە دانیشە بزانین تۆ ڕات چییە؟

نەمدەزانی مەسەلە چییە؟ پرسیم:

- چ رووی داوە.

- مەسەلەکە زۆر گرنگە! پەیوەندی بە نامووسو شەرەفی وڵاتەوە هەیە! هەرچەندە دەزانین تۆ ڕات لەگەڵ ئێمەدا نییەو تا ئێستا خۆت لە کاروباری شارەوانیو پارتایەتی نەداوە، بەڵام داهێنان شتێکی ترە! پەیوەندی بە کارو باری تایبەتیو پارتایەتیمانەوە نییە. پێویستە بەرهەڵستکارو نابەرهەڵستکار.. چەپو

ڕاست... دەست لە ناو دەستی یەك بنێین و بڕیارێکی ڕاست و دروست بۆ نەهێشتنی ئەو گیرو گرفتە بدەین.

- بێ گومان ئەوان هێشتا باسی بابەتی سەرەکیان نەکردبوو، من لە قسەکانەوە زانیم هەڵبەت باتەکە پەیوەندی بە (زەبووك زادە)وە هەیە. چونکە لە شارۆچکەکەماندا، جگە لەو، هیچ کێشەی تر نییە...بۆیە زۆر بە ئاشکرایی و سەنگینی وەڵامم دایەوە:

- بەرهەڵستی من بەرامبەر کاری چەوت مەسەلەیەکی نرە. من جیاوازیم نەگەڵ ئێوەدا نییە. هەر ئەمرێکی بفەرموون بەو پەڕی ئارەزوو ئامادەم هاوکاری بکەم. گە بابەتەکە ڕاست و دروست بێ، دەست لە ناو دەستی یەك دەنێین و بە تەمای خوای بەرەو پێش دەچین.

- ڕەحمەت لە بابت!! مەسەلەکە پەیوەندی بە (زەبووك زادە)وە هەیە. جەنابی (غەدیر)، باش گوێ بگرە. بە هەر حاڵ تۆ لە ئێمە زیاتر سەرت لە سیاسەت دەزدەچێ. دەبێ ڕابردوو بنێینە لاوەو بیرێك لەو بێناموسە بکەینەوە.

- بۆچی؟ چ بووە؟

- ئەی ئەو بۆرە پیاوە قۆڵبڕە بە ئێمەی نەگوت: (شاندی دەوڵەت دێتە ماڵم بۆ ئەوەی لە بارەی کاروباری دەوڵەتەوە پرسم پێ بکەن..) خۆت گوێت لێ نەبوو؟

- با. گوێم لێ بوو.

- برا، ئەو بێناموسە سەگبابە هەموو خەڵکی شارۆچکەکەمانی کردۆتە دەییووس.

- یانی چی؟ مەبەستت چییە؟

- ماڵی (زەبووك زادە) ڕێك وەکوو جندەخانەی لێ هاتووە. دە پازدە زەلامی ملەستوورو ژنی جحێڵ کەوتوونەتە باوەشی یەکتر! هەڵدەپەڕن و دەخۆنەوەو شتی وا دەکەن لە رووم نایێ باسی بکەم.

لەگەڵ بیستنی ئەم قسانە تا بنا گوێم بوو بە ئارەقە. (تف!!خۆ پیاو لە شارۆچکەکەمان قات نەبووە، ئیش ئاوهای لێ هاتووە!)

لەو کاتەدا، (بیلالە رەش)ی کوڕی (مەلا بەدر) گوتی:

- ئێوە روخسەت بدەن، من بە ماوەی چەند دەقیقەیەك رەگو ریشەی دەردێنم... بە چەند گوللەیەك ئەم لەکەی شوورەییە لە سەر شارۆچکەکەمان دەشۆمەوە.

ئەو گەنجانەی لە بەر دەرگا بوون هەموو قیتبوونەوە... ئەوەندە وڕووڕابوون تەنیا یەك ئاماژە بەس بوو بۆ ئەوەی خاكو خۆڵی ماڵی (زەبووك زادە) لە توورەگە بکەن. (مەلا بەدری ئاقڵمەند) گوتی:

- یاللا گەنجینە، هەستن بزانم چ دەکەن؟ بەڵام وریا بن بە پێی یاسا بجووڵێنەوە... (زەبووك زادە) خراپ بە تەڵەوە بووە، با کارێکی وا نەکەین بارو دۆخەکە خراپتر ببێ. دانەیەکی کۆنووسەکە ئامادە بکەنو بیبەنە لای فەرماندار.. ئەگەر هیچی نەکردو شەڕی ئەو بێناموسەی لە کۆڵ ئێمە نەکردەوە، ئەو حەلە خۆتان چیتان پێ باشە ئەوە بکەن. ئەمشەو دەبێ شەبەیخوون بکەینە سەر ماڵی (زەبووك زادە)و ئەو ژنە سەماکەرو منداڵە لووسکانەی بە ناوی شاندی دەوڵەتەوە داوەتی کردوون، هەموویان دەستگیر بکەین. نابێ بە دەرپێی خۆیان را بگەن. یەکسەر دەستیان لە پشتەوە ببەستنو بەراو پشت سواری کەریان بکەنو بە ناو شارۆچکەدا بیانگێڕن. مادام یاسا هەبێ بۆچی بەربەیار لێ بدەین.

مەلا رووی کردە منو بەردەوام بوو:

- (غەدیر بەگ)، ئەم تەگبیرەت پێ باشە؟

من واقم وڕماو لە دڵی خۆمدا گوتم: (ئەمانە نەشیانەوێ فێڵ لە من بکەنو دەستو باڵم ببەستن!! ) هەر هێندە دیتت (زەبووك زادە) دیسان بە جۆرێ تەفرەی دان. مەچەکی دەستی گرتنو هەموو سووچەکە کەوتە ملی من. ئەو حەلە رەگو کۆکی من دەردێنن! وەڵامم دایەوە:

- پەردەی پەنجەرەکان دادراونەتەوە، ئێوە لە کوێ بینیتان؟ چۆنتان زانی لە ژوورەوە چ هەیە؟ با یەکەم جار بچین بزانین داخۆ شتەکە راستە؟ یان نا؟ ئەوسا بڕیار بدەین.

- باشە، با بچین ببینین.

بە کۆمەڵ چووینە لای ماڵی (زەبووك زادە)... پێشتر کەرەستەی نیشەکەیان ئامادە کردبوو. (بیلالە رەش) بەسەر کاریتەی تەلەفۆنی پێش ماڵی (زەبووك زادە) کەوت. تەماشای ناو ژوورەوەی کرد. بەڵام هەرچەندە ئامازەمان دا نەهاتە خواریو نەهاتە خوارێ. هەندێك لە خوارەوە گوتیان:

- کورە، وەرە خوارێ!

- ئەوە تەماشای چ دەکەی؟

- هەی شووەو بەدیووم چییە لەسەر ئەو کاریتەیە خەوت لێ کەوتووە...

بەڵام هیچ وەڵامی نەدایەوە. هەولەکە بێ هوودە بوو. ئاخیری چوار پێنج کەس بنی کاریتەکەیان گرتو رایانهەژاند. کاریتەی تەلەفۆن قرچە قرچی لێوە هات، ئەوەندەی نەما بوو لە ناوەڕاستەوە بشکێ بەڵام (بیلالە رەش) توند باوەشی لە کاریتەکە وەرهێناو وەك قیر خۆی بە کاریتەکەوە چەسپاند. ئەگەر کاریتەی تەلەفۆنیان بشکاندایە، لێی جیا نەدەبووەوە.

یەکێ هاواری کرد:

- بە بەرد لە سەری دەن بۆ ئەوەی بێتە خوارەوە.

کە گەنجەکان بۆ بەرد چوون، (بیلالە رەش) زانی قەوما، یەکسەر هاتە خواردوەو لە سەر زەوی درێژ بوو.

جەنابی (مورتەزا)، خوا سەلامەتی کا، پرسی:

- کورە، چت لەوێ دی؟

- مامە (مورتەزا)، ناتوانم باس بکەم.

- بۆچی؟ مەگەر چ بووە؟

- شەرم لە خۆم دەکەمەوە.

گەنجەکان رایان کرد بۆ لای کاریتەی تەلەفۆن، بەلام کەس نەیتوانی سەر کەوێ. (نوورییە کوێری سەفار) یەکسەر چووە دوکانی خۆی. گرگرمیەك‌و هەندێ پەتی هێناو بە (بیلالە رەش)ی گوت:

- برۆ سەر کاریتەکەو سەری ئەم پەتە لەوێ ببەستە.

(بیلالە رەش) بە زەحمەت‌و ماندووبوون لە جێی خۆی هەستایەوەو بە نقە نق چووە سەر کاریتەکە.. بە رستی (نوورییە کوێر) داهێنانێکی گەورەی کردبوو. سەبەتەیەکی لەو سەرەی پەتەکە بەست کە لە سەر زەوی بوو. یەکێ لە ناو سەبەتەکە دانیشت. ئەوانەی تر پەتەکەیان راکێشاو بلّندیان کرد بۆ سەرەوە. ئێستا ئیتر ئەوەی دەچووە سەرەوە هاتنەخوارەوەی بە دەست خۆی نەبوو. کە چەند دەقیقەیەك تەماشای دەکرد، پەتەکەیان شل دەکردەوەو یەکسەر سەبەتەکە دەهاتە خوارێ‌و نەفەری دوای ئەو لە ناو سەبەتەکە دادەنیشت، پێنج قروشی دەداو کورگەل پەتەکەیان رادەکێشاو بلّندیان دەکرد.

هەر کەسێ دەهاتەخوارێ، ئەوانی دی لێیان دەپرسی: ( لە ژوورەوە، چ هەیە؟) ئەویش تەنیا جوێنی دەداو تووك‌و نەفرەتی دەکرد: ( تف... بێ شەرەف!! ئابرووی شارۆچکەکەمانی بردووە.) ( بەرەکەت لەم شارۆچکەیە هەلگیراوە.)

زۆربەی ئەوانەی لە سەرەو دەهاتنە خوارێ رایان دەکرد بۆ مالەوەو دوای نیو سەعات دەگەرانەوە بەر دەرگای مالی (زەمبووك زادە).

منیش، هەر چەندە مەیلەو دەمزانی مەسەلە چییەو شەرمم لە گەنجەکان دەکرد، بەروەست خۆم نەهاتم ئەو دیمەنە بالکێشە نەبینم. چوومە پێش، پێنج قروشییەکم لە ناو دەستی (نوورییە کوێر) نا. بلّندیان کردم بۆ سەرەوە. لە درزی پەردەوە چ ببینم باشە!؟ تف!! هیچ‌و پووچی‌و سەگبابییان لە رادە چووبووە دەرێ. ژن‌و پیاوی گەنج بە رووت‌و قووتی لە ژوورەوە تێك ئالابوون‌و لە بەر چاوی یەکتریش!!1!

(مەلا بەدر) لە خوارەوە هاواری کرد:

- جەنابی (غەدیر)، هیچ شتێ دەبینی؟

هەر وەڵامیشم نەدایەوە. بە جۆرێ سەرگەرمی تەماشا بووم، پێم حەیف بوو وەختی خۆم لەو شتانە خەسار بکەم.

(نووری سەفار) گوتی:

- کاتت تەواو بوو.. وەرە خوارەوە.

بە پاڕانەوە وەڵامم دایەوە:

دەستم بە دامانت (نووری)، هێشتا بە باشی تەماشام نەکردووە. چاوم باش نابینێ.. نەختێ سەبر بگرە...

بەڵام ئەوان سەبەتەکەیان راکێشایە خوارێ. دوای من (عوسمان قەساب؟ خۆی هەلکوتا بۆ پێشەوەوە و گوتی:

- نۆرەی منە.

کابرا پێنجەمین جار بوو دەچووە سەرەوەو هەمیشە دەیگوت: (هیچم نەدی)

گەڕاینەوە شارەوانی تا کۆنووسی ئەنجوومەن ئامادە بکەین. (مەلا بەدر) دەستی دایە قەڵەمو کاغەز بۆ ئەوەی بنووسێ بەڵام ئەوەندە وڕووژا بوو دەستو پێی وەکوو بی ناو ئاو دەلەرزی. ئاخیری بە هەر زەحمەتییەك بوو کۆنووسی ئەنجوومەن ئامادە بووو لە ژێرەوە مۆرمان کردو یەکەو راست چووینە ماڵی فەرماندار. بەرەبەری بەیانی بوو. ئەوەندەی نەما بوو دونیا رووناك دا بێ. جەنابی فەرماندار ئەوەندە مەست بوو، خۆی پێ بەرزەفت نەدەکرا. بە زەحمەت چاوی دەکردەوە. بەڵام کە ئێمە ناوی زەبووکمان لە دەم هاتە دەرەوە، لە پڕ فەرماندار بارو دۆخی گۆڕاو هاواری کرد:

- دیسان ناوی (زەبووك)تان هێنا؟! خەڵکی ئەم شارۆچکەیە لە ناوی (زەبووك) زیاتر هیچ نازانن؟ خودایە، من تووشی چ خەڵکێك هاتووم! وای.. وای.. دوای یەك عومر خزمەت تووشی چ بەڵایەك هاتم!؟ دەك مردووشۆر (زەبووك زادە)و

لایەنگرەکانی ببا کە منیان شێت کردووە... گەنجیو هەموو تەمەنم لەم شارۆچکەیە بە کۆتا هات.

فەرماندار بەو کەلەشە گەوەیەوە، لە سەر زەوی دانیشتو وەکوو ژنی منداڵ مردوو دەستی بە هۆرەهۆڕی گریان کرد. هەرایەکی وای کرد، (زەمبووك زادە)مان هەر لە بیر کردو دەستمان کرد بە لاواندنەوەو ئارام کردنەوەی فەرماندار. خوایە چ بکەین؟! هەموو دەستو پێمان لێ بزر ببوو...

نۆکەری فەرماندار هات. کە حاڵی ئیمەی بینی، گوتی:

- خۆتان نارەحەت مەکەن! جەنابی فەرماندار ئەومیە رەوشتی... هەر کاتێ کە مەست دەبێ، ئەو قسە هەلەق و بەلەقانە دەکا: (گەنجێتیم رۆیشت!! پیر بووم!!و فلأن شتو فیسار شت.) چەند دەقیقەیەك بەر لەوەی ئێوە بێن، گریانی برییەوەو چوو خەوت..

نۆکەری فەرماندار بن هەنگڵی گرتو بە راکێش راکێش بردییە ناو جێو خەواندی.

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) گوتی:

- ئێستا مادەم وای لێ هات، با بچینە لای سەرۆکی جەندرمە...

- مەلا گیان، سەرۆکی جەندرمە وەکوو فەرماندار ناگری. ئەو دەست دەداتە دارو پەلامارمان دەدا.

- هەر چی دەبێ با ببێ. ئێمە ناتوانین ئیشی بێناموسیی لەو بۆرە پیاوە ببینین و بێ دەنگ بین! ئێمە ژنمان هەیە.. کچمان هەیە..دوای ئەوە گەنجەکانمان لەم شارۆچکەیە دەژین.

بە دەم قسە کردنەوە گەیشتینە ناو دایەرەی جەندرمە. سەرتیپمان لە خەو هەستاند. کە خەوی رەوییەوە، کۆنووسی ئەنجوومەنی خوێندەوەو گوتی:

- هەقی ئێوەیە. ئەمە ئەرکێکی کۆمەڵایەتییە. دەبێ هەر ئێستا ئەفسەر بێدار بکەمەوەو شتەکەی پێ رابگەیەنم. لە قسەکانی سەرتیپ تێگەیشتین کە ئەویش دڵی لە (زەبووك زادە) پڕە.

بە کۆمەڵ چووینە بەر دەم ماڵی فەرماندەی جەندرمە. سەرتیپ بە تەنیا چووە ژوورەوە. ماوەی جگەرەخۆرێکی پێ نەچوو، هاتە دەرەوەو بە دەنگێکی تایبەتی گوتی:

- جەنابی ئەفسەر ماوەیەکە ناقیبی شیتی وا دەکا. کە کۆنووسی ئەنجوومەنی بینی، ئەوەندە تووڕە بوو، ئەگەر (زەبووك زادە)ی لە بەر دەست بوایە، بە ساغی قووتی دەدا. وەکوو با لە ناو جێ هاتە دەرێ. خەریکە جلی لە بەر دەکا. هەر ئێستا دێ.

ئەوەندەی پێ نەچوو، فەرماندەی جەندرمە لە ماڵەوە هاتە دەرێ دەستی بە کەمەرییەوە بوو. لە تووڕەییان قەپی لە لێوی خۆی دەدا. بە سەرتیپی گوت:

- هەر ئێستا دەچیتە ماڵی (زەبووك زادە)و ئەو بۆرە پیاوە قۆڵبڕە دەستگیر دەکەی کە خەڵکی دەستخەڕۆ کردووەو کۆمەڵە سەماکەرو (...)ی بە ناوی شاندی دەوڵەت هێناوەتە ماڵی خۆی، بەڵام وریا بە دەبێ هەموو یاسای جەندرمە جێ بە جێ بکرێ. یەکەم جار لێکۆڵینەوە دەکەی ! پاشان راپۆرت بە من دەدەی.

سەرتیپ سەلامی سەربازیی کردو گوتی:

- ئەمر دەکەی قوربان.

دوو سێ جەندرمەیشمان برد و رووممان کردە ماڵی (زەبووك زادە). لە بەر دەمی ماڵی (زەبووك زادە)دا، ئەفسەر دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد. بە دەنگێکی بەرز پرسی:

- کێ ئەو شتانەی دیوە کە لە کۆنووسی ئەنجوومەندا نووسیوتانە؟

من وەڵامم دایەوە:

- قوربـان، تەماشـای ئـەم سـەبەتەو گرگرەیـە بکـە! هـەموومان لـە نـاو ئـەم سـەبەتەیە دانیشـتین‌و چـووینە سـەرەوەو شـتەکانمان بینـی. نێـوەیش دەتـوانن تەشریف ببەن.

چاوی ئەفسەر بە شێوەیەکی تایبەتی بریسکایەوەو چووە لای گرگرەکە.

- بەڵێ، وا چاکە بچمە سەرەوەو ببینم. ئەفسەرمان لە ناو سەبەتە ناو بـەرزمان کردەوە. یەك دەقیقە... دوو دەقیقە... پێنج دەقیقەی پـێ چوو دەتگوت ئەفسـەر نایـەوێ بێتـە خـوارەوە. دەترسـاین دونیـا روونـاك دابـێ‌و ئـەوان واز لـە ئێشـە پیسەکەیان بێنن. ئـەو حەلـە نـاتوانین بەڵگە بـە دەسـت بێـنین. دوو سـێ جار بـە هێدی بانگی ئەفسەرمان کرد بەڵام وەڵامی نەدایەوە.

مەلا نەختێ بە قامتر بانگی کرد:

- ئەفسەر داتگرینە خوارێ؟

ئەفسەر توورە بووو گوتی:

- سەگبابینە، هاوار مەکەن نەوەك گوێیان لێ دەبێ. دامگرنە خوارەوە.

سـەبەتەکەمان هێنایـە خـوارەوە... ئەفسـەر ئامـاژەی کـرد بـێ دەنـگ بـین‌و بـە هێدی گوتی:

- وەرن برۆین.

هـەمووان واقمـان ورمـا. نەمانـدەزانی مەبەستی چییە. ئەفسـەر پێشـکەوت‌و ئێمـەیش کەوتینـە شـوێنییەوە. کـە ماوەیـەکی زۆر لـە مـاڵی (زەبـووك زادە) دوور کەوتینەوە، ئەفسەر بە ترس‌و لەرز گوتی:

- جەنابینە، وەرن ئەو سکاڵایە بکێشـنەوە! شـەبەیخوون کردنـە سـەر ئـەو ماڵـە، یانی بەدبـەختی هـەموو خـەڵکی شارۆچکە!! سوێندم بـە خـوا نایـەڵن یـەکمان بـە زیندوویی بمێنین.

ئەفسەر بە جۆرێ قسەی دەکرد هـەمووومان ترسمـان لێ نیشت. (مـەلا بـەدری ئلقلمەند)، لە ئێمە ئازاتر بوو، گوتی:

- ئاخر یانی چی؟ لە شاری موسلمانان... لە ژێر یاسای موسلمانان، ئەم ئیشە پیسانە بکرێن‌و ئێمە نەوێرین قسە بکەین!!؟

ئەفسەر وەکوو یەکێ گومانی لە دەرو دیوار هەبێ، باش تەماشای دەورو بەری خۆی کردو وەلامی دایەوە:

- ئیشە پیسەکان من دیم... بەلام (زەبووك) راست دەکا میوانەکانی شاندی دەولەتن! ئاخر براینە، ئێوە ئەقلتان لە کوێیە؟ ئێوە قەت بە بیرتان دا نەهات ئەگەر فەرمانبەری بەرزی دەولەت نەبێ، کێ زات دەکا ئەو جۆرە ئیشانە بکا؟! حەز ناشکرێ نارەزایی بەرامبەر فەرمانبەرانی دەولەت دەرببڕین، بە تایبەتی لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکی خۆیان. ئەوانە بۆ راوێژی کارو باری گرنگی دەولەت هاتوونەتە ئێرە! بڕۆن مەمنوونی خوا بن کە من خۆم هاتم‌و ناسیمن، نەوەك خۆتان تووشی بەلایەك دەکرد. تکاتان لێ دەکەم وا بزانن هەر هیچ نەبووە. نە ئێوە شکاتتان کردووە، نە ئێمەیش هاتووینەتە ناوەوە. هەر هیچ کەس ئاگای لەو مەسەلەیە نییە.

پاشان کۆنووسی ئەنجوومەنی جیڕ بە جیڕ کردو فڕێی دا، بەلام لە پڕ شتێکی بیر کەوتەوەو بە توندی لە نیوچەوانی خۆی دا: .

- هەی هاوار! زوو پارچەکانی کۆنووسی ئەنجوومەن کۆ کەنەوە بۆ ئەوەی بچووکترین شت لە دژی دەولەت نەمێنێ.

خۆیشی چوارچەمکی لە سەر زەوی دانیشت‌و دەستی بە کۆ کردنەوەی پارچەکانی کۆنووسی ئەنجوومەن کرد:

- دەبێ ئەمانە بسووتێنین‌و خۆلەمێشەکەی فڕێ بدەینە ناو رووبار، ئاو بیبا.

ئێمە هەروا بە کڕو بێ دەنگی وەستابووین‌و تەماشای کارەکانی ئەفسەرمان دەکرد. کە ویستیشی بڕوا، گوتی:

- من دەڕۆم بە خواتان دەسپێرم. ئێستا دەچمە لای فەرماندە، راپۆرتی دەدەمێ... ئەگەر بە چاکی زانی، با خۆی بێ. دەیەوێ چ بکا، با بکا. هیچ پەیوەندی

به منەوە نییە. من خاوەن ژنو مندالّم، نامەویّ لە ئاخیری عومرم بکەومە دەرۆزە کردن!

ئەفسەر رۆیشتو ئێمەیش بە بیّ دەنگی وەکوو پەیکەری قورمیشکراو بەرەو مالّی خۆمان بووینەوە. من کە گەیشتمەوە مالّێ، دونیا تەواو رووناك ببوو. دەنگی بانگی کەلّەشێر دەگەیشتە کەشکەشانی فەلەك.

چەند سالّ بە سەر ئەو مێژووەدا تێپەڕیوەو ئێمە هێشتا نەمانزانیوە ئاخۆ ئەو شەوە میوانەکانی (رەبووت رادە) بە راستی شاندی دەولەتو فەرمانبەرانی پایە بەرز بوون، یان چەند کەسێکی هەرچیو پەرچی بوون... بەلێ، قوربان، ئەو (زەبووك)ە بێناموسە مرۆڤێکی ئاوایە، بەلاّ نەماوە بە سەر خەلّکی ئێرەی نەهێنیّ. خوا بزانیّ لەمەودوایش چ بەدبەختییەکمان بە سەر دێنیّ!... ئێمەیش هیچمان لە دەست نایێ، دەبیّ جەفا بکێشینو بەرگە بگرین، بزانین خوا چ دەکا!!

# (11)

## (بەڵگەی گەلۆریی!..)

(مەلا بەدری ئاقلمەند)یش بیرەوەرییەکی سەرنجکێشی بۆ گێڕامەوە:

- رۆڵە گیان، ئێمە لە دەست ئەم بۆرە پیاوە قۆڵبڕە جەرگمان بۆتە کەباب! کابرا وەکوو کەر سوارمان دەبێ. ئەگەرچی سووچێ خۆمانە کە بە ئەشق و ئارەزوو داوای لێ دەکەین سوارمان ببێ. کەر بە کەرایەتی خۆی، کە دەیانەوێ سواری بن، دەکشێتەوەو لووشکە داوێ، بەڵام ئێمە کە مرۆڤین، تەنانەت ئەوەندەیش ناکەین. باسی چیت بۆ بکەم.. درد هەر یەك و دوو نییە..

کاتی هەڵبژاردنی شارەوانی بوو. بەرهەڵستکاران وەکوو ئاوی کوڵاو کەوتبوونە بڵقە بلق. هیچ کەس بەرامبەر ناحەزەکەی قسەی نەدەکرد بەڵام لە بنەوە هەوڵیان دەدا کڵاو لە سەری یەکتر بنێن. هاوڕێیان پێشنیاریان کرد کۆ بوونەوەیەك بکەین و بیرو رامان لە بارەی پاڵێوراوەکان ئاڵ و گۆڕ بکەین. یەکەم جار، ویستمان لە بارەگای پارت کۆ ببینەوە. بەڵام (رەزا) بەگی میرزای فەرماندە گوتی:

- من بابایەکی کارمەندی دەوڵەتم، بۆ پاراستنی بێ لایەنی خۆم، ناتوانم بێمە بارەگای پارت.

لە بەر ئەوە ناچار بووین کۆبوونەوەکە لە شارەوانی بکەین. (ئەمین بازرگان) نەبێ، هاوڕێیانی دی هەموو هاتن. ماوەیەکی زۆر چاوەڕێمان کرد. ئاخر ئەو ریش سپی ئێمەیەو سەلامەتی ئەو شتێکی گەورەیە. ئەو خۆی ئێمەی هان دا بۆ خەبات لە دژی بەرهەڵستکاران، رێ پێوان بکەین.

یەکێکمان نارده ماڵی.. لە ماڵەوەیش نەبوو... هەر جێگایەکی گومانمان کرد لەوێ بێ، چوونە دوای، نەیاندۆزییەوە.

(ئیحسان تەقاویت) گوتی:

لەوانەیە فیلەکەی غەریبی هیندستانی کردبێ‌و چووبیتە دوای عیشقبازی. وەرن با ئێمە قسەی خۆمان بکەین....

لە بەر ئەوەی (ئیحسان تەقاویت) سەرپەرشتیاری پارتە، ناچار بووین فەرمانەکەی جێ بە جێ بکەین. تەماشای دەم‌و چاوی (هەمرە جووت بەدزادە)مان کرد، داماوە، ئەوەی خوێن بێ لە روویدا نەما بوو. ئەگەر پارتیمان لەم هەڵبژاردنە بدۆڕێنێ، لە شارەوانی لا دەدرێ. کە یەکێکیش لە سەرۆکایەتی کەوت، کەس نرخی بۆ دانانێ. ئەگەر (جووت بەدزادە) لە شارەوانی لا بکەوێ، زەبر بە هەموومان دەکەوێ چونکە هەموومان بە یەکەوە بەسراوینەتەوە. بۆیە من هاتمە دەنگ‌و گوتم: هاوڕێیان، حیساب‌و کیتابی کۆن قەپات کەن، ناخۆشیی بخەنە لاوە. ئەسپ بە ئەسپاتی خۆی کاتێ تووشی هێرشی گورگ دەبێ، هەموو پاڵ دەدەنە یەک‌و بە لووشکە گورگی دەغەڵ لە ناو دەبەن. ئێستا ئێمە وەکوو ئەو ئەسپانە واین. ئەگەر یەك نەگرین، بەرهەڵستکاران‌و دوژمنانی دین‌و نیشتمان‌و میللەت قازانج لە دووبەرەگیمان وەردەگرن.

ئەگەر ئێمە لە هەڵبژاردن شکست بخۆین، رەگی هەمووومان دەردێنن. ئێمە پێویستە یەکەم جار، پلان بۆ بەستنی دەست‌و پێی بەرهەڵستکاران دابڕێژین، پاشان بەرنامەی پێشکەوتنی خۆمان رێك بخەین.

(ئیحسان تەقاویت) دەیەویست سەرۆکایەتی شارەوانی لە دەست (جووت بەدزادە) دەربێنێ چونکە دەیزانی ئێمە زۆر لە بەرهەڵستکاران دەترسین لە بەر ئەوە ئومێدی هەبوو یەك گرتنی ئێمە وا بکا هەندێ شتێ پێ بدەین. بۆیە کە (جووت بەدزادە) بە مەسەلەکەی زانی، گوتی:

- هاوڕێیانی ئازیز، ئێمە هەموومان برای یەکترین... ئیشی پارتی گاڵتە نییەو ناکرێ ئەو ئیشە بە سەرەڕۆیی وەربگرین. دەشێ جوامێریی مرۆڤ لە سێ کات تاقی بکرێتەوە: لە کاتی سەفەرو لە سەر مێزی قوماروو لە کۆبوونەوەی پارت. هاوڕێیان، وا چاکە بە شێوەیەکی ئاشکراتر قسە بکەین، منو (ئیحسان بەگ)ی برادەری هێژام هێچ ناخۆشیمان لە بەیندا نییە. من دان پێدا دەنێم، ئەو لە من زیاتر توانای بەڕێوەبردنی شارەوانی هەیە. کە ئەو لەوێ بێ، غەڵەت دەکەم.

ئەگەر بە پێش بکەوم. بە بۆچوونی هاوڕێیانیش وا چاکە (ئیحسان بەگ) ببێ بە سەرۆك شارەوانی. ئەو دەتوانێ باشتر خزمەت بکا.

خەریك بوو لە قسەکانی شەق ببەم.. توخوا تەماشا کە سەگبابە لە بەرامبەری چتۆ درۆی شاخدار دەکا!

ئەگەر سەرۆکایەتی شارەوانی لێ وەربگرنەوە، رێك وەکوو ماسی، کە لە ئاو بێتە دەرەوە دەمرێ ، ئەویش ئاوها وە زگ دەدا. بەڵام ئێستا بۆ رۆیشتنی کاری خۆی زمانلووسیی دەکا. ئێستا دەیەوێ کەری خۆی لە ئاوێ بباتە دەرەوە. کە گەیشتە ئەوبەری رووبارەکە، دەزانێ چۆن جلیتبازی دەکا.

من لە وەرگرتنی کارەکە زۆر ترسام. چونکە کاری کە بە دوو دەست دەست پێ بکا، ئەنجامەکەی خراپ دەبێ.

بەڵام ئەو (جووت بەدزادە)یە لە ترسی ئەوەی سەرۆکایەتی شارەوانی لێ وەربگرنەوە، بە تەواوی ئەقڵی لە دەست داوە. لە کۆبوونەوەیەکی رەسمی پارتی، لە پێش هەموو کەس دان پێدا دەنێ کە فلانە کەس بۆ بەڕێوەبەری شارەوانی لە من لێوەشاوەترە. بەسەزمان ئاگای لێ نییە ئەگەر (ئیحسان تەقاویت) ببێ بە سەرۆکی شارەوانی، تا سەر داری قەنارەی دەباو دوای ئەوەیش دەمێنێتەوە سەر ویژدانی خۆی.

(ئیحسان تەقاویت)، کە ئەم گورگانەی بیابانی دیوە، کە گوێی لە قسەکانی سەرۆکی شارەوانی بوو، وەکوو سەگورگ گوێی شۆڕ کرد. فیزێکی کردو گوتی:

-برا، ئەم قسانە چییە؟ تا تۆ هەبێ من چیم ببم بە سەرۆك شارەوانی. ئەستەغفیرەللا!! مەسەلە مەسەلەی کاری تۆ نییە...

من یەکسەر لە مەسەلەکە گەیشتم. ئەمانە خەریکە یاری بووکۆکە دەکەن. هێشتا نازانین داخۆ پارتەکەمان دەباتەوە؟ یان نا؟ ئەمانە لە سەر سەرۆکایەتی شارەوانی چەنەبازی دەکەن.

ببورن، من هەرگیز نایکەم. تا ئێوە هەبن، بە من ناگا.

بەخوا من ئەو غەلەتانە بەرامبەر بە ئێوە ناکەم... ئەمە چ قسەیەکە؟ دوای ئەم هەموو خزمەتە...

(لااله الا الله). ئاخر گیانە، من چیم بەرامبەر بە ئێوە قیت ببمەوە.

توخوا واز لەم پیاهەڵدانە بێنە. من بمرم باشترە، نەك جێگای ئێوە بگرمەوە.

لە پڕ جەنابی (رەزا) میرزای فەرماندار خوێنی پەڕییە مێشكو هاواری کرد:

- دەبیووسینە، وەك ئەوەی لە هەڵبژاردن بردبیانەوە، سەرۆکایەتی شارەوانی پێشکەش یەکتر دەکەن. ئاخر هەی بێ مێشکینە، ئێوە چیتان هەیە تا پێشکەش یەکتری بکەن.

من توند جڵەوی خۆمم گرت بۆ ئەوەی قسە نەکەم چونکە کارمەندی دەوڵەتمو نامەوێ دەست لە کاری ئێوە وەر بدەم. بەڵام کە ئێوە شەرم لە خۆتان ناکەنەوە، من حەوسەڵەم نامێنێ...

تەقینەوەی جەنابی (رەزا) کارێکی زۆری کرد. هەردووکیان وازیان لە پیاهەڵدانی یەکترو خۆشکاندن هێنا.

جەنابی (هەمزە) گوتی:

- راستە. دەبێ یەکەم جار مەسەلەی هەڵبژاردن یەك لا بکەینەوە.

ئەوەی تر گرنگ نییە. هەر کامەمان ببینە سەرۆکی شارەوانی جیاوازی نییە...(ئیحسان بەگ)، ئێوە راتان دەربارەی هەڵبژاردن چییە؟

(ئیحسان بەگ) پێی لە سەر پێی داناو وەڵامی دایەوە:

- ئەگەر پرسیار لە من دەکەی،....

بەڵام ئەوەی تری نەگوتو بێدەنگ بوو. (هەمزە بەگ) دووبارە پرسی:

- بەڵێ. ئێوە راتان چییە؟

(ئیحسان بەگ) سەیری دەورو بەری خۆی کردو بە دڕدۆنگی گوتی:

- دەبێ بەڵێن بدەین قسەکە لە بەینی خۆمان بێ.

- هەڵبەت...

یەکەم جار دەبێ پاکسازی لە ناو پارتەکەمان بکەین. پارتەکەمان میکرۆبی تێدایە... ئەگەر ئەو میکرۆبە لە ناو نەبەین‌و ریشەی گەندەڵی دەرنەهێنین، کەس دەنگمان پێ نادا... قسەکەم راستە؟ یان نا؟

سەری بۆ لای من وەرسووڕاندو چاوەڕێی کرد وەڵامی بدەمەوە.

رقم ئەوەندە هەستا بوو، بە من بوایە بیخنکێنم: ئاخر هەی وا وا لێ کراو، ئێستا کاتی ئەوەیە تۆ پرسیار لە من بکەی؟!

-خودایە، چی وەڵام بدەمەوە؟

دیارە، ئەو میکرۆبەی لە ناو پارتیمانە کێیە؟ بەڵام من چۆن دەتوانم لە ناو ئەو هەموو خەڵکە ناوی بێنم؟ ئەگەر بە (زەبووك زادە) بگاتەوە، رێ‌و رەچەڵەکی هەموومان دەردێنێ. مەسەکەم کرد بە سیاسەت‌و گوتم:

راست دەفەرمووی. پێویستە چاکسازی قوول لە ناو پارت ئەنجام بدرێ.و کەسانی خاین‌و نالەبار لە پارت دەربکرێن. لە کۆنەوە گوتوویانە: ( بزنێکی گوری یەك بزنەگەڵ گوری دەکا). ئینجا منیش سەرم بۆ لای خاوەنی ئوتێل وەرسووڕاندو گوتم:

- وا نییە؟ ئێوە راتان لەم بارەیەوە چییە؟

بەم (فێڵە) بەڵاکەم لە کۆڵ خۆم کردەوە.

خاوەن ئوتێل وەکوو گایەکی لێ هات سەرهەوراز رایکردبێ‌و فڕەفڕی لووتی بێ:

- قسەکەتان دروستە. گومانی تێدا نییە مرۆڤی خراپ لە ناو پارتەکەمان هەیە. ئەگەر لە پارت دەریان نەکەین، لە هەڵبژاردن شکست دەخۆین.

ئەویش بە دەم ئەم قسەیەوە سەری بۆ لای ئەوەی تەنیشتی وەرسووڕاندو گوتی:

- جەنابی (مورتەزا)، ئێوە لەم بارەیەوە چ رایەکتان هەیە؟

جەنابی (مورتەزا)، خوا سەلامەتی کا، مەسەلەکەی حەواڵەی (ئیسماعیلی بەندەی خوا) کردو ئەویش حەوالەی ئەوەی تەنیشت خۆی کرد.

هەمووومان بە دڵو گیان ئارەزوومانی دەکرد ئەو بۆرە پیاوە هیچو پووچە لە پارت دەر بکەین. بەڵام کەس زاتی نەدەکرد ناوی بە زمان بێنێ. برادەرانی ئێمە مرۆی ترسنۆکو قەلەزراون. ئاخر کورە لە چ دەترسی؟ بۆچی ناوی ئەو بێناموسە ناهێنی؟ تف! ترسنۆکینە!! هەر کەسە لەوەی دی دەپرسێ تۆ رات چییە؟ مەسەلەکە سووڕا سووڕا دووبارە کەوتەوە سەر ملی من. منیش حەوسەڵەم چووبوو، رووم کردە (مەلا بەدری ئاقڵمەند)و زۆر بە سەنگینی گوتم:

- ئاخر تۆ بە ئاخێری گیانی سەرپەرشتیکاری پارتی، رێگا چارەیەك بۆ ئەم کارە...

پاشماوەی قسەکەم لە دەم وشك بوو. لاشیپی دەرگا ئەوەندە بە توندی بە دیوار کەوت، وەك تۆپ دەنگی دایەوە. (جەلیلە شێت) خۆی بە ژووریدا کردو بە تووڕەیی گوتی:

- مەگەر ئەو وڵاتە بێ ساحیبە!؟ لێرە کەس نییە فریای مرۆڤ بکەوێ. ئەگەر کەس بە کەس نییە، با ئێمەیش دەست بدەینە چەكو بچین کاروان رووت بکەین. کوا حکوومەتی ئەم شارۆچکەیە؟ کوا ئەو سەرۆك شارەوانییە بێ کەلکە؟ (...) بە ریشت سەرپەرشتیکاری پارت. هەستن جلو جۆڕتان کۆ کەنەوە. ئەو پارتەتان کردووە بە گاڵتەجاڕ.

(جەلیلە شێت) کاتی خۆی شێت بوو. ئێستا بە راستی ببوو بە شێتی زنجیر لە مل. شەمەر نەیدەتوتانی بێتە بەرامبەری. چاوی لە قەپێلك دەرهاتبوو کەفی لە دەم دەهات. هەر کەسێ جێکەی لێوە هاتبایە خوێنی بە هەدەر دەچوو. دوای ئەوەی هەمووی تێر جوێن کردن‌و نەختێ ئارام بووەوە، (رەزا)ی میرزای فەرماندار، کە هەرچی هەبێ پیاوی دەولەتە، بە رووگرژی گوتی:

- (جەلیل بەگ)، ئەوە چ خێرتە؟ ئەوە چ جۆرە قسەیەکە دەیکەی؟ بۆچی سووکایەتی بە دەوڵەت دەکەی؟ پێم بڵێ دەردت چییە؟

لە شارۆچکەکەمان هەموو عالەم رێزی جەنابی (رەزا) دەگرن. (جەلیلە شێت) تەواو حەپەسا. گوتی:

- مامە (رەزا)، من مەبەستم دەوڵەتی خۆمان نییە.

کابرا بەو زلییە لە پرمەی گریانی داو وەکوو منداڵ هۆڕ هۆڕ دەستی بە گریەو زاری کرد.

جەنابی (رەزا) پرسی:

- ئاخر چ بووە؟ بۆچی دەگری؟

(جەلیلە شێت) هەم دەگریاو هەم مەسەلەکەی باس دەکرد:

- ژنەکەم دەیەویست نان بکا، پێی گوتم دارمان نییە تەنوور دابگیرسێنم. برۆ چیا بارە دارێك بێنە. کەرم لە تەویلە راکێشایە دەرێ، چووم دار لە جەنگەلی پشت ئیمام زادە بکەم‌و بیهێنم. کە لە داوێنی چیا هەوراز هەڵکشام، لە پڕ دێوێکی بێ کلك‌و شاخم لە بەر دەم پەیدا بوو. دەق وەکوو ئەو دێوانەی نیگاریان لە سەر دەرگای حەمام دەکێشن. پانتۆڵێکی سواری لە پێ بووو بەڵەکپێچی لە سەر بەستبوو. کراسێکی کۆنی سەربازی لە بەر بووو کڵاوێکی لبادی لە سەر بوو. رەختەو فیشەکی لە سینگ‌و بەرۆکی دابووو تفەنگێکی بە ملیەوە کردبوو. (ئەستەغفیرەللا...)! کە ئەم جۆرە شتەم بینی یەکەم جار نەختێ سەرسام بووم، ئەگەر بڵێم جەندرمەیە، شکڵی لە جەندرمە ناکا، ئەگەر بڵێم رێگرە، لە رێگریش

ناکا، خودایە، ئەدی ئەوە چییە؟ لەو بیرانەدا بووم، کابرا تفەنگی لێ راگرتم‌و هاواری لە سەر کردم:

- بوەستە. لە جێی خۆت نەبزووی، میشکت دەپژێنم.

دەتگوت بەندی دڵم پسا. هێزم لە ئەژنۆدا نەما. وەکوو بزمار لە شوێنی خۆم لە زەوی چەقیم. بەڵام کەرەکەم رانەوەستا. بە دەنگێکی لەرزان‌و نووساو هاوارم کرد: ( ووش! ووش!) کابرا لە پڕ خوێنی پەڕییە کەللەو هاواری کرد:

- نە کانی ئەندامەدانی نەرت بە فەرمانبەری دەوڵەت دەڵێی (ووش)؟ دەبێ دەردێکت پێ بکەم، ئەو سەری دیار نەبێ.

- قوربان، ببوورە. من کەی (...)ی گووی وام خواردووە؟ بە کەرەکەمم گوت (ووش). نەك بە تۆ.

سەری لەقاندو ددانی رەش‌و کرمی خۆی گڕ کردەوە:

- هم.. بە کەرەکەتت گوت؟! زۆر باشە. ئێستا بە کەریشمان دادەنێی؟

کاتێ کابرا دەمی کردەوەو پێکەنی، ناسیم، (نوورییە کوێر)ی خۆمان بوو. ترسم نەماو چوومە پێش.

- رۆژ باش، سەگباب، زۆرت ترساندم. ئەو ئیشانە چییە تۆ دەکەی؟!

زۆر بە رەسمی‌و سەنگینی وەڵامی دایەوە:

- رۆژ باش... رۆژ باش نا... یەللا بزانم پەنجا لیرە بدە.

وامزانی گاڵتە دەکا گوتم :

- برۆ بزر بە. پارەی چی بدەم.

دیم هەر بە راستی لوولەی تفەنگی لە سەر دڵم دانا:

- دەی. تاخیر نەبێ!!

کورە، (نووری) گیان، چییە؟ ئەوە شێت بووی؟

- قسەی زیاد نەکەی. پەنجا لیرە دەربێنە.

- ئەی من مامە (جەلیل) نیم؟

دەزانی چی گوت؟ وەڵامی دایەوە:

کارمەندی دەوڵەت نابێ جیاوازی لە نێوان ئاشناو بێگانە بکا.

لەم قسەیە زیاتر سەرسام بووم. کارمەندی چی؟و ئەرکی چی؟ کابرا ماوەیەك پێش ئێستا لە شارۆچکەکەمان دوکانی سەفاری هەبوو... دوکانەکەی بە بەر جادە کەوتو بێ ئیش مایەوە. نەچووبێ بووبێ بە کارمەندی دەوڵەت؟ پرسیم:

تۆ سەر بە کام دایەرەی کە هەق‌و حیساب لە سەر چیا کۆ دەکەیتەوە؟

- من پارێرەری پەرژەوەندی دەولەتم...

تازە زانیم شێتی بە راستی (نووری سەفار)ە، خۆڕا ناوی شێتیان بە دوو من خستووە! بەڵام هیچ چارەم نەبوو. کابرا چەکی بە دەستەوە بوو. زۆرم قسە کردبا، ئیشی دەدیتم. بە نەرمی گوتم:

- ئەوە زانیم تۆ کارمەندی دەوڵەتی، بەڵام هی کام بەشی؟

بەر غەبابەی هەڵدەفاندو وەڵامی دایەوە:

- من لە هێزی پارێزگاریی دارستانم.

پێکەنینم دەهات بەڵام لە ترسی لوولەی تفەنگەکەی، کە لێی راگرتبووم، پێنەکەنیم. گوتم:

- پیرۆزە ئیشاللا! بەڵام دارستان ئەوە هەر هیچ، یەك درەختی لێ نییە. پارێزگاریی چ دەکەی؟

لە قسەکەم زۆر تووڕە بوو. ئەوەندی نەمابوو پەلاپیتکە دابگرێ‌و گوللەکانم لە ناو سنگی بە تاڵ بکا.

وەڵامی دایەوە:

- لە دەست ئێوە، ئەم ناوە دارستانی لێ ناڕوێ.

- ئێمە چیمان کردووە؟ لەوەتی دونیا دونیایە، یەك درەختیان لێرە نەچاندووە.

گفتوگۆیەکی زۆرمان کرد. دوا جار (نوورییە کوێر) گوتی:

- پەنجا لیرە بدە. تاخیرم مەکە.

- پارەی چییە؟

- پەنجا لیرە جەریمەم کردووی.

- جەریمەی چی؟

زیاتر قسە بکەی، دەیکەم بە سەد لیرە؟ یاللا بزنم زوو دەربێنە.

- ئاخر جەناب من سووچم چییە؟

- سووچت بڕینی داری دارستانە.

نەمدەزانی چ بکەم؟! چ وەڵامی ئەو شێتە تینەگەیشتووە بدەمەوە؟ بەرگری کردن فایدەی نەبوو.تفەنگی لە ناو دەست بوو. هاکا زانیت ئاگری داو پارچە پارچەی کردم. گوتم:

- جەناب کوا دارستان، تا من داری لێ ببڕمەوە؟

- ئەی هاتوویتە ئێرە چ بکەی؟

- هاتووم هەندێ گوێن و رێو پیکی گیای کیوی ببەم بیسووتێنم.

- ها...! ئەوە خراپتریش! هەڵکەندنی رێو پیکی گیای کیوی حەفتاو پێنج لیرە جەریمەی لە سەرە؟

- هێشتا هیچم هەڵنەکەندووە؟

بەڵام کابرا گوێی بە قسەکانم نەدا. تفەنگی لە سەر سنگم دانا:

- یاللا، زوو بە!

پێنج لیرە زیاترم لە گیرفان نەبوو. پارەکەی بردو گوتی:

- ئەگەر جارێکی تر لەو ناوە بتبینم، کەرەکەیشت لێ دەسەنم. ئەم جارە لێت خۆش بووم، زوو برۆ. لە بەر چاوم بزر بە!

(جەلیلە شێت) وەکوو هەوری بەهاری فرمێسکی دەڕشت. ئێمە قسەکانمان زۆر بە لاوە سەیر بوو. جەنابی (رەزا) گوتی:

- قەیدی نییە. ئێستا دەچین پارەی تۆی لێ وەردەگرینەوە.

(جەلیلە شێت) وەڵامی دایەوە:

- (نووری) لە چیا هاتۆتەوە. ئێستا وا لە چایخانە دانیشتووە.

یەکێکمان نارده دوو (نووری). کە هات دیتمان (جەلیلە شێت) راست دەکا. (نوورییە کوێر) بە شێوەیەکی سەیر خۆی گۆڕی بوو. دەتگوت سەربازی کۆنی رۆمە. جەنابی میرزا (رەزا) گوتی:

- کورە، ئەوە چ شکڵو سیمایەکە؟

(نوورییە کوێر) زۆر بە سەنگینی وەڵامی دایەوە:

- لە سای سەری ئێوە، بوویم بە پارێزگاری دارستان.

قسە کردنی زۆر سادەو ئاسایی بوو، بەڵام شکڵو سیمای وای پێشان دەدا شێتێکی زنجیر لە ملە. جەنابی رەزا بە زۆر پێکەنینی خۆی گێڕایەوەو گوتی:

- بڵێ ئاوها؟! بووی بە کارمەندی پاراستنی دارستان؟

- بەڵێ، قوربان.

- باشە، پێم بڵێ کێ لەو دایەرە دایمەزراندی؟

- خوا عەمردرێژی بکاو لە شەڕی شەیتان بیپارێزی، جەنابی (زەبووك زادە) ئەو کارەی بۆ رێك خستم.

مەسەلەکە روون بووەوە. زانیمان (زەبووك زادە) دەسکە گوڵی خۆی وەشاندووە... هەڵبەت پارەو پوولێکی باشی لە (نووری) بەسەزمان وەرگرتووەو ئەو کڵاوە گەورەیەی لە سەری ناوە. داوامان لێ کرد بۆمان باس بکا مەسەلەکە چۆن بوو. یەکەم جار، ملی نەدا بەڵام کە جەختمان لە سەر کردەوە، باسی هەموو شتێکی کرد:

بڕیار بوو جەنابی (زەبووك زادە) بە سەرۆکی شارەوانی بڵێ دوکانی من خراپ نەکەن. بێ گومان کەم شتێکم دابووێ. سەرۆکی شارەوانی رازی نەبوو جادە خوار بکاتەوە. کە دوکانەکەم بە بەر جادە کەوتو لە ناو چوو، گوتم بە لانی کەمەوە پارەکەمم بدەوە. هەر ئەمڕۆ سبەی پێ کردم. شەوێ، چوومە ماڵی، بە روو قایمی

گوتم: یان پارەکەم بدەوە، یان بەو دەستانەی خۆم دەتخنکێنم. پێکەنیو وەڵامی دایەوە:

- ئەوەتە چاکەتەکەم بە جلاوێزەوە کراوە. بیست هەزار لیرەی تێدایە، برۆ هەزار لیرە ببە. بەڵام ئەو هەزار لیرەیە دەخۆیو تەواو دەبێ. من کارێکم بۆ داناوی هەموو مانگێ هەزار لیرەت دەدەنێ.

لە گەورەیی ئەو پیاوە شەرمەزار بوومو کەوتمە سەر دەستو پێی. (زەبووک زادە) گوتی زۆر باشە. ئێستا مادەم وای لێ هات، تا حەفتەیەکی دی دامەزرانەکەت بۆ پێك دێنم.

خۆی داواکەی بۆ نووسیمو رەوانەی ئەنقەرەی کرد. منیش چی کەلو پەلم هەبوو هەمووم فرۆشتو هەزار لیرەی ترم بۆ مەسرەفی ئیشەکە دا.رێك کەوتین تا ئەمرەکە لە وەزارەتی کشتو کاڵ دێ، من لە پشت ئیمام زادە خەریکی ئیش بمو هەر کەسێ درەختێکی بڕیبەوە، یان رێو پیکی گیایەکی کێوی هەڵکەند جەریمەی دەکەم.

جەنابی میرزا (رەزا) سەری باداو گوتی:

- بڵێ ئاوها!! ئێستا تۆ شەوو رۆژ خەریکی کاری؟

- بەڵێ، ئەمڕۆ سبەی ئەمرەکەم دەگا.

جەنابی (رەزا) پرسی:

- مووچەت چەندە؟

- ئێستا لە سەدا دەی جەریمەکان بۆ منە تا ئەمرەکەم دێو مووچەم دیار دەکرێ.؟

- ئەی پارەکەی تر چ لێ دەکەی؟

- دەیدەم بە (زەبووک زادە).

هەر وەخت بوو لە سەرسامییان دوو شاخم لە سەری بڕوێ. سەیر کە ئەو بۆرە پیاوە قۆلبڕە چۆن ئەو پیاوەی کردووە بە داردەستی خۆی. هەم پارەی لێ خواردووەو هەم رۆژانە پارەیەکی باشی هەیە.

(نوورییە کوێر)و (جەلیلە شێت)مان لە کۆبوونەکە کردە دەرەوەو دەستمان بە گفتو گۆ کرد. (ئیحسان تەقاویت) گوتی:

- مەسەلەکە روون بووەوە. ئەو میکرۆبە ترسناکەمان ناسی لە ناو پارتەکەماندایە.

هەموو گەرم بوونو کەوتنە جمو جوولو کردیانە دەنگە دەنگ:

- جەنابینە، تا ئەو (زەمبووك زادە) لە ناو پارتەکەمان بێ، ناتوانین یەك دەنگ بێنین.

- بەڵێ، من کە خۆم پارتیم، تف لە رووم، ئەگەر تا ئەو لە پارتەکەمان بێ ، دەنگی پێ بدەم.

- بە هۆی ئەو بێناموسەوە هەموومان بەدناو بووین.

- پێویستە هەر ئێستا سکاڵایەك بنووسینو بۆ بارەگای پارتەکەمانی بنێرین بۆ ئەوەی ئیشەکە یەك لا بکەنەوە.

ئێمە ئاوها خەریك بووین بە گەرمی قسەمان دەکرد، سەیرم کرد دیتم (ئیحسان تەقاویت) بزر بووە. ئەوەندە هەڵچووبووین کەس ئاگای لێ نەبوو کەی رۆیشتبوو. زانیم فێڵێك لە گۆڕێیە. چونکە (ئەمین بازرگان)یش هەر لە هەوەڵەوە نەهاتبوو. جەنابی (مورتەزا) خوا سەلامەتی کا گوتی:

- هاورێکان، با دەرفەت لە دەست نەدەین. زوو بڕیار بدەن، چونکە ئەگەر (زەمبووك زادە) بێ، هەموو نەخشەکانمان هەڵدەوەشێنەوە.

(هەمزە جووت بەدزادە) پرسی:

- چ بکەین؟

جەنابی میرزا (رەزا) وەڵامی دایەوە:

- جەنابینە، هەستن بچینە لای فەرماندار، مەسەلەی دارستان‌و دامەزراندنی (نووری) پێ بڵێین. یەکسەر فەرمانی دەستگیر کردنی دەردەکا.

هەموو هاورێکان رازی بوون.

- باشە. رازین.

تا زووە با بچینە لای فەرماندار.

خاوەنی ئوتێل‌و (ئیسماعیلی بەندەی خودا)مان بە نوێنەر هەڵبژارد بۆ ئەوەی بچنە لای فەرماندارو مەسەلەکەی پێ بڵێن. ئەوانەی تریش خەریکی گفت‌و گۆو گۆڕینەوەی بیرو را بووین. رۆژ ئاوا بووو دونیا تاریک داهات‌و ئێمە هەر خەریکی ئامادە کردنی راپۆرت بووین بۆ کۆمیتەی پارتەکەمان لە ئەنقەرە بۆ ئەوەی، لە پایتەخت، یان (زەبووک زادە) لە پارت دەر بکەن، یان خۆکێشانەوەی ئێمە قەبووڵ بکەن. بوونی ئێمە لە یەك پارتدا لەگەڵ (زەبووك زادە) دەبێ بە مایەی لەکەداربوونی شەرەفمان.

کاتێ کە خەریکی گفت‌و گۆ بووین‌و وشەو رستەکانی راپۆرتەکەمان دەگۆڕی، (ئیسماعیلی بەندەی خودا)و خاوەنی ئوتێل لە لای فەرماندار هاتنەوە. جەنابی (رەزا) بە سەرسامی پرسی:

- چ زوو هاتنەوە!

- برام، هەر مەپرسە. هەر هێندە تاریك دابێ، فەرماندار ئەقڵی لە سەردا نامێنێ. کاتی گەیشتینە خزمەتی، هێشتا وشەی (زەبووك زادە)مان لە دەم دەرنەهاتبوو، شێت بوو. ویستمان بڵێین (زە...) قسەکەی لە دەممان خنکاند. چەنگی لە قژی خۆی گیر کردو دەستی بە هات‌و هاوار کرد:

- ئای ماڵم کاوڵ بوو. دیسان (زەبووك)؟ ئاخر باوکم ئێوە هیچ قسەی تر نازانن؟

چوار چمکی لە سەر زەوی دانیشت‌و زار زار گریا. هەم دەگریاو هەم جوێنی بە ئێمە دەدا.

-لە دەست ئێوە، وە زالە کەوتووم. گەنجێتیم ڕۆیشت. لەو چیایانە ماڵم کاول بوو...

- دیتمان تاخیر بوون فایدەی نییە. وازمان لێ هێناو هاتینەوە.

غەدیر هەڵستکار گوتی:

- زۆر باشە. دانیشن با بەلگە لە سەر (زەبووك زادە) کۆکەینەوە.

بەلگەکان تەواو نەدەبوون. لاپەڕە دوای لاپەڕە پڕ دەبووەوە. لەو کاتەدا (ئەمین بازرگان) هاتە ژوورەوە.

- جەنابی (ئەمین)، ئەوە تۆ لە کوێی؟ نەتدەزانی ئەمڕۆ کۆبوونەوەمان هەیە؟ ئەی تۆ رابەرمان نی؟

(ئەمین بازرگان) وەکوو کەرێ کە دەگاتە شوێنی مەبەستو بارەکەی دادەنێ، بە شەکەتی خۆی فڕێدایە سەر کورسیو وەڵامی دایەوە:

- ئێوە ئاگاتان لە هیچ نییە. نازانن لە دەردوە چ هەیە! لێرە دانیشتوون قسەی بێ سوود دەکەن. هیچێکتان ناپرسن من لە کوێ بوومو چیم بە سەر هات؟

- بە راست... لە کوێ بووی؟

- لە کوێ بووبم باشە؟ ئێوە لێرە کۆبوونەوەی پارت دەکەن، بیر ناکەنەوە (زەبووك زادە) لە کوێیە؟ ئایا تا ئێستا قەت بووە کۆبوونەوەی پارت بە بێ ئامادەبوونی (زەبووك زادە) بکرێ؟

هەموو تەماشای یەکترمان کرد. راست دەکا. تا ئێستا شتی وا نەبووە. ئەگەر لە دەرگا دەرمان کردبا، لە پەنجەرە دەهاتەوە ژوورێ. (ئەمین بازرگان) گوتی:

- چۆن بیرتان لە شتی وا نەکردۆتەوە؟

هەموومان حەوسەلەمان چووبوو:

- توخوا زوو بڵێ بزانم چ بووە؟

- (زەبووك زادە) دەیەوێ ئیستیقالە لە پارت بدا.

- چ؟ چ؟ بە راستیتە؟

بەڵێ. ئەو خەبەرەم لە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو وەرگرتو چوومە لایەوە بۆ ئەوەی خەبەرەکە لە زاری خۆیەوە ببیسم. ئەوەندەم قسە کرد هەناوم پسا.

(هەمزە جووت بەدزادە) بە کەیفخۆشی گوتی:

- کوێرە، چت دەوێ؟ دوو چاوی ساغ. ئێمە خەریك بووین نەخشەمان دەکێشا بۆ ئەوەی لە پارتەکەمان دەری بکەین، ئێستا خۆی ئیستیقالە دەدا.

دەنگێك لە پشتەوە هات گوتی:

- ئێوە ئاوهای تێ دەگەن؟

- کە ئاوڕم دایەوە، دیتم (ئیحسان تەڤاویت)ە.. کەی هاتبوو؟ بەبێ دەنگی ڕۆیشتو بە بێ هەستو خوست هاتەوە. وەکوو بووکۆکەی تارمایی دەوریان دەگێڕا.

(ئەمین بازرگان) گوتی:

- هاوڕێکان، ئێوە لە من باشتر (زەبووك زادە) دەناسن. پێویست ناکا من پێتانی بناسێنم. کابرا بەلاش لە پارت ئیستیقالە نادا. ئەو بێناموسە، ئەگەر بچووکترین سوودی لەم کارەدا هەبێ، واز لە پارت ناهێنێ. ئێستا بزانە داخوا چ بووە ئێستیقالە دەدا.

خاوەن ئوتێل قسەکەی بۆ سەلماندو گوتی:

-هەڵبەت ئەم ماستە موویەکی تێدایە.

(ئیحسان تەڤاویت) پرسی:

- (زەبووك زادە) بەم دواییە لە ئەنقەرە بووە.

- بەڵێ. دوێنێ لە ئەنقەرە هاتۆتەوەو ئێستا دەیەوێ ئیستیقالە بدا. بۆچی؟ هەڵبەت دەولەت لە سەر ڕۆیشتنە. پارتەکەمان نیشانەی مەرگی لێ دەرکەوتووە!!!

(زەبووك زادە) زانیویەتیو دەیەوێ پێش هەموو کەس ئیستیقالە بداو بچێتە ناو پارتی ڕکابەر.

(ئیسماعیلی بەندەی خودا) گوتی:

- زۆر راستە! لەوە زیاتر نییە. هاورێیان راستتان دەوێ منیش دوێنێ ئیستیقالەم لە پارت دا.

جەنابی (مورتەزا) قسەی پێ بڕیو گوتی:

- کوڕینە، با ئەم قسانە بنێینە لاوە. هەر بە قسە ئیش پێك نایە. (زەبووك زادە) دوێنێ لە ئەنقەرە هاتۆتەوەو بێ شك دەنگو باسی گرنگی پێیە. وا چاکە بچینە لایو راستییەکە لە زمانی خۆی ببیسین. بۆ ئەوەی ئەگەر لە ناوچوونی پارتەکەمان راست بێ، ئێمەیش زوو ئیستیقالە بدەین.

- بەڵێ، پێویستە بچینە ماڵی (زەبووك زادە).

بە کۆمەڵ ملی ڕێمان گرتو چووینە ماڵی (زەبووك زادە). زۆر بە ساردی پێشوازی لێ کردین. بە سیمایەوە دیار بوو زۆر ناڕەحەتە. سەلامێکی سەرپێیمان کردو دانیشتین.

چەند خولەکێ بە بێدەنگی تێپەڕی. خەریك بوو حەوسەلەمان بچێ، جەنابی (هەمزەی جووت بەدزادە) بێدەنگییەکەی شکاندو گوتی:

- باشە، (ئیبراهیم بەگ)، لە ئەنقەر، دەنگو باس چ هەبوو؟

(زەبووك زادە) بە منگە کنگ وەڵامی دایەوە:

- هیچ. هیچ دەنگو باسی گرنگ نەبوو.

توخوا ئەتۆ وەرە سەیری ئەو بێناموسە بکە! دەبێ بە گاز قسەی لە دەم دەربێنین. پارتەکەمان خەریك بوو لە ناو دەچوو. دەولەت لە سەر ڕۆیشتن بوو. بێ شەرەفەی دەیەویست ئیستیقالە بدا. لەگەڵ ئەوەشدا دەیگوت: هیچ دەنگو باسی گرنگ نییە. بێناموس!! ئەدی خەبەری گرنگ چییە؟! هەڵبەت ئەو ماستە موویەکی تێدایە کە ئاوها بێدەنگ بووە. کاتێکی تر بوایە، مۆڵەتی نەدەدا کەس قسە بکا. سەد هەزار راستو درۆی لە دوای یەك ریز دەکرد: (لەگەڵ فلان وەزیر بە شەڕ هاتم. سەرۆك وەزیران نێوچەوانی ماچ کردم. فلان سەفیر دەعوەتی کردمو ئەو قسە هەڵەقو بەلەقانە..)تا ئێستا کەس نەیدی بوو ئەو پیاوە لە ئەنقەرە

بێتەوەو ئاوها بێدەنگ بێ!! هاوڕێیان یەك لە دوای یەك ئەو پرسیارەیان دووبارە کردەوە، بەڵام (زەبووك زادە) لە وەڵامی هەموویان دەیگوت: (هیچ دەنگ‌و باس نییە.) دوای چەند خولەکێ، دووبارە پرسیارەکان دووبارەبوونەوە:

- باشە، جەنابی (ئیبراهیم بەگ)، لە ئەنقەرە چ دەنگ‌و باسێك هەبوو؟

- هیچ.

- باشە (ئیبراهیم ئاغا)، چ دەنگ‌و باسێکی تر هەیە؟

- باشە، (ئیبراهیم بەگ) چی کەیفت لە ئەنقەرە کرد، بۆ خۆت، بۆمان باس بکە بزانین چیت بینی؟ چیت بیست؟

- بەخوا چ بڵێم... نازانم... گوتم هیچ.

بەڵێ. زەبووك زادە وەکوو رۆژی رووناك بە سیمایەوە دیار بوو کە دەنگ‌و باسی زۆر گەرم‌و ناخۆش هەیە. بەر لەوەی بێینە ماڵی (زەبووك زادە)، لە نێو خۆمانەوە بڕیارمان دا جەنابی (هەمزە)ی سەرۆکی شارەوانی قسە بکا. ئەویش گوتی:

- جەنابی (زەبووك زادە)، وەك ئێمە تێی گەیشتووین سەرپەرشتیکەرانی پارتەکەمان ئیشەکانیان تێك داوە. قسەیەکی نەستەق هەیە دەڵێ: (ماسی لە سەرییەوە گەنی دەبێ) ئێستا بۆنەکەی گەیشتۆتە کلکی‌و ئەوەندەی نەماوە ئیشەکە تێك بچێ. بە رای ئێوە وا نییە؟(زەبووك زادە) ملی خوار کردەوەو وەڵامی دایەوە:

- بەخوا چ بڵێم؟

ئەوەندە ، لەو خوێنساردی‌و قیرسیچمەیی (زەبووك زادە) تووڕە بووم، ئەگەر بەردو کەرپووچ‌و ئاسنم بکەوتایە بەر دەست، بە سەرم دادەداو مێشکم دەپژاند. سەگباب، ئەگەر هەر کاتێکی تر بوایە، وەکوو بولبول دەیکردە چەهچەهە. کەچی ئێستا ( کەڕو لاڵ) بێدەنگی لێ کردووە، دەڵێی بەردی گۆڕستانە.

دوای سەرۆك شارەوانی، جەنابی (مورتەزا) خوا سەلامەتی کا قسەی کرد:

-جەناب، پارتەکەمان ئیتر پیاوی تێدا نەماوە. بەم جۆرە، پارتەکە هەر نەبێ باشترە. میللەت هەموو روویان لە پارتەکەمان وەرگێڕاوە. رۆژ بە رۆژ ناحەزمان زیاتر دەبێ. وا نییە، (زەبووك زادە)؟

- بەخوا چت عەرز کەم؟ ئێوە لە من باشتر دەزانن. ماشەللا ئێوە هەمووتان ئەهلی فەزڵو کەمالن!

ئیتر مەسەلەکە لە سەدا سەد بۆ هەموومان روون بووەوە. لە قسە نەکردن‌و وەڵام نەدانەوەی دیار بوو ئیستیقالە لە پارت دەداو بە نەنیا جیمان دێڵێ.

وەکوو لە پێشا لەگەڵ هاوڕێیان رێك کەوتبووین بۆ ئەوەی مەسەلەکە تەواو ئاشکرا ببێ، هاوڕێیان ئاماژەیان بۆ کردم پێشنیارەکەم بکەم. منیش گەرووی خۆم پاك کردەوەو گوتم:

- (ئیبراهیم بەگ)، ئێمەیش بیری خۆمان کردۆتەوەو بڕیاری خۆمان داوە بەڵام نەمانویست بێ پرسی تۆ هیچ شتێ بکەین. هەر چونی بێ تۆ لە ئێمە زیاتر شارەزای‌و هەمیشە پەیوەندیت لەگەڵ رابەرانی پارت هەیە. ئێمە هەمیشە پەیڕەی دەستەی فەرمانڕەواییین‌و لە کۆمەڵدا دەوری(گاز) دەگێڕین. هەر کاتێ دەستەی فەرمانڕەوایی دەوڵەت گیرو گرفتێکیان بێتە پێش، ئێمەیش تێ وەردەدەین‌و دەمانکەن بە سوپەری قەزای خۆیان. هەر هێندە ئیشەکەیش یەك لا بووەوە، ئێمەیش لە بیر دەکرێین. ئایا بە لای تۆ ئەگەر ئێمە ئیستیقالە لە پارت بدەین، هەقمان نییە؟ زۆر ببوورن کە سەخلەتت دەکەین، بەڵام بەڵام تۆ ماوەیەکە لە شارەکەمانی‌و نان‌و نمەکی خانەوادەی ئێمەت کردووە، ئەرکێکی خۆتە رێنماییمان بکەی.

دەم‌و چاوی بێ شەوقی (زەبووك زادە) هیچ جوولەی تێدا نەبوو. سەری دانەواندبووو چاوی بڕیبووە گوڵی خالیچەکە. ئەگەر سەری بڵند کردبایە، لانی کەم لە سیمایەوە شتێ تێدەگەیشتین. دوا جار، پاش بێدەنگییەکی دوورو درێژ، هاتە قسەو زۆر بە ئارامی و بە حیساب گوتی:

- جەنابینـە، ئێـوە هەمیشە هـەر وان... قسـە زۆر دەكـەن، بـەڵام ئـاخیری هـیچ ئیشی پێ ناكەن. یانی لە سەر قسەی خۆتـان نـامێنن. بـرا ئازیزەكـانم، لـە قسـەكانم نارەحەت مەبن ، ... ئێوە هیچێكتان زاتی ئەنجامدانی كارتان نییە. یەكێ بیەوێ لە پـارت ئیسـتیقالە بـدا، ئـیتر پـرس و راوێـژ ناكـا. ئێـوە ئـەقڵتان هەیـە... مێشـكتان هەیە... ئاگاداری ئەو شتانەن كە روو دەدەن.

هاوڕێیان هەموو گیانیان ببوو بە گوێ. لـە قسـەكەیەوە ئاشكرا دیـار بـوو كـاری پـارت تـەواو بـووەو ئـەو زۆر شـت دەزانـێ بـە ئێمـەی نـاڵێ. ئیسـتیقالەی خۆیشـی شتێكی مسۆگەرە.

خاوەن ئوتێل گوتی:

- ئێمە پیاوین و هەر قسەیەكی بكەین، دەیهێنینـە جـێ. ئێستا پـەڕە كاغـەزێكم بدەرێ، ئەوسا دەزانی ئێمە چەند ئازاین!!

(زەمبـووك زادە) دەتگـوت پێشـتر هـەموو شـتێكی ئامـادە كـردووە، چـەند پـەڕە كاغەزێكی لە سەر رەفە هێناو بە سەر ئێمەدا دابەشی كرد.

خاوەنی ئوتێل گوتی:

- (مەلا بەدر) تۆ دەستخەتت خۆشە، ئیستیقالەیەكیش بۆ من بنووسـە دەینێـرم بـۆ هـەموو رۆژنامـەكان بـۆ ئـەوەی بـڵاوی بكەنـەوە. بـۆ ئـەوەی خـەڵك بـزانن سەرپەرشتیارانی ئێمە چ جۆرە كەسانێكن. جەنابی (غەدیر) ناڕازی بوو:

- هاوڕێیان، وا چاكە باشتر بیر بكەنەوە. باش نییە مرۆڤ ئەوەندە لە ئیش پەلـە بكا.

- (زەمبووك زادە) كە دیتی ئیش رووی لە نشێوە، بزەیەكی هاتێ و گوتی:

- دیتتان. نەمگوت ئێوە پیـاوی ئـیش نـین، تـەنیا قسـەتان هەیـە. ئـەم قسـەیەی (زەمبـووك زادە) زۆر كـاری تـێ كـردین. مـن پـێش هـەموویان دەسـتم دایـە قەڵـەم و دەستم بە نووسین كرد:

(- بەڕێز سەرۆكایەتی پارت...

لەبەر ئەوەی چەند ساڵە تەنیا بەڵێنمان لە لێپرسراوانی پارت بیستووەو تا ئێستا هیچ بەڵێنێکتان نەهاتۆتە دی، بە پێچەوانەوە هەندێ کارتان کردووە دژی پەرژەوەندی خەڵك و وڵاتەکەمانەو ولاتتان گەیاندۆتە رۆژێکی وا پیاو دەبێ لە ناو کارە تاریکەکانتان بە مۆم بە دوای رۆژانی رابردوودا بگەڕێ، ئیتر هەرچی ئومێدمان لە دڵدا هەبوو، هەمووی کوژاوەتەوە، بۆیە ئیستیقالەی خۆمان پێشکەش دەکەین.)

داواکەم خوێندەوە. هەموو پەسندیان کرد. (زەبووك زادە) گوتی:

- پێویستە هەر کەس بە جیا بنووسێ‌و لە ژێرەوە مۆر بکا.

دەتگوت هەموومان هیپنۆتیزم بووین. هەر دەستوورێکی دەیدا کوێرانە جێ بە جێمان دەکرد. داوامان نووسی‌و واژۆمان کردو مۆرمان لێداو دامان بە (زەبووك زادە). داواکانی لە ناو سندووق ناو کلیلی داو کلیلەکەکەی نایە گیرفانی. لە پڕ وەزعی گۆڕا. حاڵەتی خاوو خلیسکی گۆڕاو بێدەنگییەکەی شکاندو بوو بە یەك پارچە هێزو چالاکی. من لە خەوی غەفلەت بە خەبەر هاتم‌و زانیم چ کڵاوێکی گەورەی لە سەر ناوین. پرسیم:

-(ئیبراهیم بەگ)، ئێوە پاشان ئیستیقالە دەدەن.

- بۆچی ئیستیقالە بدەم؟ من کەی گوتوومە ئیستیقالە لە پارت دەدەم. ئایا من قەت قسەی وام کردووە؟ ئێوە کەستان قسەی وای لە دەمی من بیستووە؟ من ئەگەر بە فیدا کردنی رۆحم، پارتەکەم یەك هەنگاو دەچێتە پێش، یەك چرکە دوا ناکەوم؟

تف!! تۆ وەرە سەیری ئەو بێناموسە بکە!! چ فێڵێکی لێ کردین!! ئێمەی لە سەر هەڵەمووت هەڵدێراو خۆی بە سەلامەتی دەرچوو.

تەماشای دەم‌و چاوی یەکترمان کرد. زمانمان لاڵ ببوو. نەماندەزانی تەگبیرمان چییە؟ جەنابی (هەمزە)ی سەرۆکی شارەوانی گوتی:

(ئیبراهیم بەگ)، من ئەو کارەی ئێوەم زۆر پێ خۆش بوو. خەڵك پاش ملە زۆر قسەتان دەرهەق دەکا. هەلبەت ئێمە باوەڕمان نەدەکرد، بەڵام بڕیارمان دا تاقیتان بکەینەوە. ئافەرین. هەر بژی! بە راستی جوامێری. سەلماندت لە پارتدا، مردن هەیە، واز هێنان نییە. بەڵێ ئەم هەموو کارو نەخشەیە بۆ تاقی کردنەوەی ئێوە بوو...

(زەبووك زادە) دیسان پێکەنی. ئەو پێکەنینەی لە سەد جوێن خراپتر بوو.

- زۆر باشە. من هیچ قسەم نییە. ئێوە منتان تاقی کردەوە.. منیش ئێوە تاقی دەکەمەوە. ئێوە قسەی خۆتان کرد. ئێستا روخسەت بدەن منیش قسەی خۆم بکەم.

رووی کردە (هەمزەی بەدجووت زادە)و بەردەوام بوو:

- تۆ، کە هەر ئەوەتە دەزانی ناوی خۆت بنووسی، لە باتی واژۆ نیگارێك دەکێشی، بە چ حیسابێ بووی بە سەرۆك شارەوانی ئێرە؟ ئەگەر بۆ خاتری پارت نەبوایە، لە هیچ شوێنێ بە کۆڵهەلگریش قبوولیان نەدەکردی تا بە سەرۆك شارەوانی را دەگا!! قسەیەکی نەستەقە دەڵێ: (سەگ لە بەر سێبەری دیوار وەردەکەوێ و دەڵی چتۆ پیاوی هونەرمەندم!!) جەنابی بەو رابردووە پرشنگدارەوە پلان لە ئێمە دادەنێتەوە.

(هەمزە جووت بەدزادە) لە ترسان هەموو قسەکانی بۆ (زەبووك زادە) سەلماند.

زەبووك رووی کردە (مەلا بەدر):

- کێ بوو تۆی لە پێشنوێژی کوێرە دێیەك هێنایە ئێرەو تۆی کرد بە ئایەتوللا؟ ئەوە پارت نەبوو؟ ئێستا ورگت بەزی زۆری گرتووە، ئیستیقالە لە پارت دەدەی؟ هەقتە.

تۆیش جەنابی (ئەمین بازرگان)، لە بیرت کرد لە سایەی پارت چ بازاڕێکی رەشت بۆ لاستیك دروست کرد؟ نانی ئیللەللات نەبوو بە خێرا لاستیکی دەوڵەت، ئێستا ئەگەر حیسابت لە هەر بانکێك بکێشیتەوە، ئەو بانکە مایە پووچ دەردەچێ.

(ئەمین بازرگان) وەڵامی دایەوزە:

- لەگەڵ باوکی خوالێخۆشبووت شەریکی ئەو لاستیکانە بووم. خودا لێی خۆش بێ تۆ بەم قسانەت رۆحی لە ناو گۆڕ تووشی ئەشکەنجە دەکەی.

ئێمە چەند ساڵ لەگەڵ باوکت نانو نمەکی یەکترمان کردووە. ئەم ئیشانە راست نین. هەموو ئامادەبووان قسەی (ئەمین بازرگان)یان پشت راست کردەوە، بە تایبەتی (هەمزە جووت بەدزادە) بۆ ئەوەی کارە کرێتەکانی خۆی دابپۆشێ لە هەموویان زیاتر پشتگیری قسەکانی کرد.

بەڵام (زەبووک) هەر هیچ گوێی بە قسەکانیان نەدا. رووی بۆ لای خاوەن ئوتێل وەرگێڕاو گوتی

- جەنابی وەکوو بنیادەمان سمێڵیشی هێشتۆتەوە! کوڕی باش، تۆ پێش ساڵێ، شاگرد کاروانسەرا بووی، ئەم ئوتێلو دامو دەزگایەك لە کوێ هێنا؟ بە ناوی پارتەوە لەگەڵ شارەوانی رێك کەوتیو شوێنی کاروانسەراکەت لە سەر مەسرەفی شارەوانی کرد بە (ئوتێلی تووریست پالاس).

بە کورتی. درێژەی نەدەمێ ئەم (زەبووك زادە) حەرامزادەیە ئێمەی هەموو باش شووشتەوەو لەو گۆڕەی دانایین. ئاخیریش گوتی:

- من رێز لە تەمەنتان دەگرمو لەبەر ئەوەی لەماڵی منن قسەتان پێ ناڵێم، ئەگەر نا، بەڵایەکم بە سەر دەهێنان تا ماون لە بیری نەکەن.

شتاقمان نەوێراین قسە بکەین. کابرا هەقی بوو ئەو هەموو سووکایەتییەمان پێ بکا... بەلگەی تاوانی لێ گرتبووینو لە ناو سندووقی نا بوو. کەوتینە سەر دەستو پێی. لێی پاڕاینەوە ئیستیقالەکانمان بداتەوە بەلام نەچووە ژێر بارو گوتی:

-هیچ نارەحەت مەبن ئیستیقاەکانتان نادەمە پارت... لای خۆم هەڵی دەگرم. ئەگەر پێویستی نەکرد، ئەوە هیچ، بەڵام رۆژێ ببینم پێ لە بەرەی خۆتان زیاتر رابکێشن، وای بە حاڵتان. چێشتێکتان بۆ ساز دەکەم یەك بست رۆنی بە سەرەوە بێ.

هیچ چارە نەبوو. دەبوایە تا ماویە، غولامی ئەلقە لە گوێی بین و هەر ئەمرێك بکا، کوێرانە جێ بە جێی بکەین. سەرمان شۆڕ کردو وەکوو جاشەکەر، کە کەوتبێتە ناو ئاوو تەڕ بووبێ، بە لەرزە لەرزە لە ماڵەکەی هاتینە دەرێ.

کەس دەنگی لێوە نەهات. کە ماوەیەك لە ماڵی (زەبووك زادە) دوور کەوتینەوە، جەنابی (غەدیر) بێدەنگییەکەی شکاندو گوتی:

- ئاخر هەی ناکەس بەچەینە، ئەدی پێم نەگوتن ئەو کابرایە ململانەی لەگەڵ ناگرێ؟! بەمگوت ئاخیری پشتمان لە عەردی دەدا. بەمگوت بەحتی بیر بکەنەوە... هەی بێ مێشکینە!! هەی خەرفاوینە!! ئێستا تەگبیر چییە؟!

باش ریشی خۆمان دایە دەست ئەو بێناموسە!! کابرا لەمەو دوا وەکوو هەوساری کەر ریشمان دەگرێ و بۆ هەر کوێ بیەوێ دەمانبا.

ئەو بێ شەرەفە سیاساتمەدارە. ئەو بەڵایەی بە سەر ئێمەی هێناوە سیاسەتێکی ئەمریکییە.

دونیا تاریك داهاتبوو، ئێمە لە کۆڵانە دەرۆیشتین و بە دەم ڕۆیشتنەوە قسەمان دەکرد. لە پڕ دیتمان کابرایەك بەرانێکی لە سەر شان بوو، لە بەر دەممان پەیدا بوو. گوتی:

- سەلامو عەلێکوم.

وەعەلەیکومموسەلام. ئەوە خێرە؟ ئۆغر بێ؟

کە تەماشای دەمو چاومان کرد، دیمان جەنابی (سەبری ئولوجانی)یە. پرسیمان:

- (سەبری) ئەوە دەچیتە کوێ؟

- دەچمە ماڵی جەنابی (زەبووك زادە). ئەم دیارییە، خەڵکی ئاوایی بۆیان ناردووە.

لە قسەکانی (سەبری بەگ) تێگەیشتین (زەبووك زادە) لە باتی ئەنقەرە چووبووە ئاوایی (ئولوجان)و بە دەستی (سەبری) ژنێکی سیغە کردبووو ئەو

ماوەیە لەوێ خەریکی بەزمو رابواردن بوو. ئەو داماوانەیش فریویان خواردووە. بەڵێنی پێداون لەو چەند رۆژە قۆچانی زەوییەکانیان لە ئەنقەرەوە دەگا...

هەموو چوونەوەماڵی خۆیان. من لەگەڵ (ئیسماعیلی بەندەی خودا) هاتینە بارەگای پارت.. (ئیسماعیل) زۆر لەو مەسەلەیە پەستو مرێس بوو، گوتی:

- ئەجندەیش ئەقڵی بۆ شتی وا ناچێ. تۆ بزانە. ئەو قۆڵبڕە سەگبابە، چۆن هەموو عالەمی خاپاندووە. بە راست بۆچی (ئیحسان تەقاویت)و (ئەمین بازرگان) ئیستیفالەیان نەنووسی؟

تا ئەو حەلە من هیچ بیرم لەو مەسەلەیە نەکردبووەوە. کە (ئیسماعیل بەگ) ئەو قسەیەی کرد، یەکسەر بە بیرم هاتەوە، وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ. بە راست. ئەوە بۆچی؟!! من ئەوسا هەستم پێ نەکرد.

- بۆچی پێ ناوێ. ئێمە هەمیشە هەر واین. کە کار لە کار ترازا ئەوسا مێشکمان دێتەوە سەر. (ئیحسان بەگ) دیتی ناتوانێ سەرۆکایەتی شارەوانی لە دەست (هەمزە جووت بەدزادە) دەربێنێ، گوتی من نابم بە سەروکی شارەوانی با (زەبووك زادە) ببێ. بە هێواشی لە کۆبوونەوە چووە دەرێو خەبەری دایە (زەبووك زادە) کە ئێمە دەمانەوێ لە پارت دەری بکەینو ئەویش ئەم پلانەی لێ دانایینەوە بە هۆی (ئەمین بازرگان) خەبەری نارد گوایە دەیەوێ لە پارت ئیستیقالە بداو ئیشەکەی وا تێك هەڵشێلا ئێمە تێدا ورو گێژ بووین. لە باتی کابرا لە پارت دەر بکەین، ئەو ئێمەی دەر کرد. گەورەترین سیاسەتمەداری ئەنگلیزیش ئەقڵی بە شتی وا ناشکێ. دەبێ ئاوی بە دەست دابکا. ئەو بێناموو‌سە!!

بەڵی برادەری خۆشەویست، ناتوانی بە قسە ئەو (زەبووك)ە بناسی. دەبێ بیخەیتە تەلەوە بۆ ئەوەی باش بیناسی. ئێمە بە دەستی خۆمان بەلگەی گەوجاتی خۆمان مۆر کردو دامانە دەستی. ئەو بەلگەیە لە چەکی بانق زیاتر جێی متمانەیە. هەر کاتێ بیەوێ، دەتوانێ ژیانمان سەراو بن بکا.

# (12)

**(بیکەنە سەرۆك شارەوانی، یا بحەسێینەوە!!)**

جەنابی (ئیسماعیلی بەندەی خودا) پاشماوەی چیرۆکەکەی بۆ گێرامەوە:

- برا، کڵاوێکی خراپیان لە سەر نابن. (زەمبووك زادە) هەر کاتێ کەیفی لێ بوایە، دەیتوانی وەکوو ورچ سەمامان پێ بکا.

ئەوە بوو چووینە لای جەنابی (رەزا) میرزای فەرماندارو دەستەو دامێنی بووین بۆ ئەوەی چارەیەکی ئەو مەسەلەیە بکا.

(رەزا) بەگ کە بە مەسەلەکەی زانی، وەکوو گەنمی برژاو دەستی بە قرچە قرچ کرد. هاوار ی کردە سەرمان:

- هەی گەوجینە، کەس دەچێتە ماڵی ئەو خوێڕییە قورمساغە؟... ئێوە کە دەتانزانی هەمووتان تەفرە دەدا، بۆچی چوونە ماڵی؟

جەنابی (هەمزە)ی سەرۆکی شارەوانی وەڵامی دایەوە:

- چ دەمانزانی ئاوها شەڵوارمان دێنێتە خوارێ؟

(ئیحسان تەڤاویت) گوتی:

- (رەزا بەگ)، شتەکە لەو قسانە رەت بووە. لۆمەو سەرکۆنە سوودی نییە. وەرن بیرێك لە هەڵبژادن بکەینەوە.

جەنابی (رەزا) سەری بادا:

- قسەیەکی نەستەق هەیە: (قاپتان دۆڕاندووە، یاری بە عەباتان دەکەن.)

- برا، ئێوە بەڵگەی گەوجایەتیتان داوەتە دەست کابرا، چۆن زات دەکەن بچنە هەڵبژاردن؟

(هەمزە جووت بەدزادە) گوتی:

- هەمووی سووچی (ئیحسان بەگ)ە. دەستی بەستین‌و تەسلیمی (زەبووك)ی کردین. ئێستایش چاوی تەماعی بڕیوەتە سەرۆکایەتی شارەوانی.

(مەلا بەدری ئاقڵمەند)یش لە ترسی ئەوەی نەوەك (ئیحسان بەگ) سەرۆکایەتی شارەوانی لە دەست دەربێنێ، حەریکە پشی دەکرێ.

جەنابی (مەرتەزا) وەکوو مرۆڤی شکست خواردوو ملی کەچ کردبووو دەستی لە گیرفانی نابوو گوتی:

- بە خوا چ بزانم... قسەیەکی نەستەق هەیە دەڵێ: (ئەگەر تف لە خوارەوە دەکەم، ریشە، ئەگەر لە سەرەوە دەکەم، سمێڵە.) دیتم ئیش شلۆقە. کۆبووینەوە بۆ ئەوەی چارەیەك لە بارەی هەڵبژاردنەوە بکەین. ئەوان دەیانەوێ حیساباتی تایبەتی خۆیان یەك لا بکەنەوە:

- هاوڕێیان، ئەم قسانەی بۆچییە؟ ئێستا کە ئێمەو (زەبووك زادە) هەموومان لە یەك پارت داین‌و پێشینان گوتەنی: (گۆشت‌و نینۆك لێك نابنەوە.) وەرن لە باتی بەدگۆیی‌و یەکتر شکاندن، نەخشەیەك دابنێین‌و پشتی ناحەزەکەمان لە عەردی بدەین.

(ئیحسان تەقاویت) کە گوایە چاوەڕێی ئەم قسانەی دەکرد، زۆر بە خۆشحاڵی‌و خەندانی قسەی منی تەواو کرد:

- سوپاس بۆ خودا یەکێ هەیە راستی دەبینێ. ئاخر یانی چی ئێمە ئەوەندە بەدگۆیی دەرهەق (زەبووك زادە) بکەین. بۆچی ئەوەندە بێ ویژدان بین؟ (زەبووك زادە) تا ئێستا زۆر خزمەتی پارتی ئێمەی کردووە. مەسەلەی هاتنی پارێزگارتان لە بیر چوو. ئەگەر (زەبووك زادە) نەبوایە، کێ دەیتوانی وەڵامی رقی پارێزگار بداتەوە؟ ها؟ لە ئێوە دەپرسم. شتەکانی دی هەر هیچ.

غەدیر بەرهەڵستکاریش پشتگیری قسەکانی (ئیحسان تەقاویت)ی کرد.

- جەنابینە لە (زەبووک) بەو لاوە کەس ناتوانێ نەجاتمان بدا. وەرن بیکەنە سەرۆکی شارەوانی بۆ ئەوەی بحەسێینەوە، ئەگەر نا، هیچمان بە دەست ناکەوێ. (زەبووک زادە) ئەگەر بزانێ ئێمە نایکەین بە سەرۆک شارەوانی، دەچێتە ناو پارتی رکابەرو ئێتر ئێمە بە هیچ جۆرێ ناتوانین دەنگ بێنین. راستی وەرن بو ویژدان حوکم بدەین (زەبووک زادە) چ عەیبی هەیە؟ درۆی شاخدار دەکا دەڵێ: ( فلان وەزیر هاوڕێمە.) (سەرەت وەریران ماچی کردم.)... ( دەستەی دەوڵەت دێتە ماڵم.)و ئە قسە هەڵەق و مەلەقانە...لێیگەرێن با بۆ خۆی ئەو قسانە بکا...دەوڵەت خۆی هەموو رۆژێ ئەو هەموو درۆیە لەگەڵ میللەت دەکا، چ بووە؟ بۆچی کەس دەنگی لێوە نایێ؟ کەچی ئەوەندە بە درۆی (زەبووک زادە) خۆمان نارەحەت کردووە.!! ئێوە مانای سیاسەت هەر نازانن. سیاسەت یانی (یەکێ) بە (هەزار) نیشان بدەی. کاتی وا هەیە وای دەوێ سیاسەتمەدار (کێچێك) بکا بە (وشتر)... یان بە پێچەوانەوە (چیایەك) بکا بە (زلە قەسەرێك). ئەگەر کەسی لە (زەبووک زادە) زرنگترمان تێدایە بتوانێ پشتی ناحەزانمان لە عەردی بدا، با پەنجەی بڵند بکا.

کەس دەنگی لێوە نەهات. غەدیر بەرهەڵستکار خەندەیەکی مانادارى کرد:

- دیتتان... بۆچی هەمووتان بێدەنگ بوون؟ ئێمە ئەرکی سەرشانمان ئەوەیە دەوڵەت بە چ رێگایەکدا بڕوا، ئێمەیش بەو رێگایەدا بڕۆین. ئەو پیاوە ئێستا جێی سەرنجی دەولەتە. سوپاس بۆ خودا هەمووتان بە چاوی خۆتان دیتتان پارێزگار چۆن دەستی لە ناو دەستی ناو چووە ماڵی. ئێمەیش پێویستە بە پێش خۆمانی بدەین و بۆ بەرەو پێش بردنی مەبەسەکانمان و بردنەوەی هەڵبژاردن خیزەر لە دووی ببەستین. پێویستە ئێمە خۆمان قسەکانی ئەو گەورە بکەین و هەزار لق و پۆپی بۆ زیاد بکەین و بە رووی ناحەزانیدا بکێشین. بۆ نموونە ئەگەر زەبووک گوتی: فەرماندار سەلامی کردو من وەلامم نەدایەوە، پێویستە ئێمە لای خەڵك بڵێین: وەزیری کیشوەر سەلامی لێ کردووە، زەبووک هیچ حیسابی بۆ نەکردووە.

تەنانەت پێویستە سوێند بخۆین کە بە چاوی خۆمان دیومانە. بەڵێ، هاوڕێیان، یاسای پارتایەتی ئەمەیە. ئەگەر نا، پیاوێکمان لێ هەڵناکەوێ مەردی مەیدانی ناحەزان بێ.

(ئیحسان تەقاویت) ئەوەندە ورووژا بوو وەکوو نوێنەران مستی لە مێز داو هاواری کرد:

- ئافەرین (غەدیر بەگ)، ئافەرین... بە راستی تۆ پیاوێکی سیاسیو ئەندامێکی دەمارگیری پارتی!!

- (مەلا بەدری ئاقڵمەند) بە ئاماژەی دەست (ئیحسان تەقاویت)ی بێدەنگ کرد:

-جەنابی (ئیحسان)، قسەکانت تەواو راستە. بەڵام ئەوەیش بزانە ئەگەر شارەوانی بە دەست ئەو بێناموسە بسپێرین، ئیتر هەرگیز ناتوانین لێی وەربگرینەوە.

ئینجا بە ئەنگوست هێڵێکی لە سەر دیوار کێشاو بەردەوام بوو:

- ها؟! من ئەوە نیشانەیەك لێرە دەکەم. ئەگەر (زەبووك زادە) دەسەڵاتی بکەوێتە دەست، ئەم شارۆچکەیە لە سەر خۆی تاپۆ دەکا. ئێمە هەموومان لێرە دەر دەکا. ئێمە دەبێ لە مەودوا، بەم تەمەنە ئاوارە ببین. یان ببین بە نۆکەری ماڵی.

(ئەمین بازرگان)، کە تا ئێستا بێدەنگ بوو، بە نائومێدی سەری لەقاندو دەنگێکی تایبەتی لە دەم دەرهات:

- پف!! تاپۆ کردنی ئەم شارۆچکەیە لە سەر خۆی هەر هیچ نییە، هەموو ئاواییەکانی دەورو بەریش لە سەر خۆی تاپۆ دەکا. بەڵام چ بکەین؟! هیچ چارەی ترمان نییە. وەکوو قسە نەستەقەکە دەڵێ: (دەبێ یان خۆمان لەگەڵ ئەم وشترە بگونجێنین، یان لەم وڵاتە بار بکەین.) ئێمەیش یان دەبێ (زەبووك زادە) بکەین بە سەرۆکی شارەوانیو لە هەڵبژاردن ببەینەوە، یان شوورەیی شکست قبووڵ بکەین. هاوڕێیان لە پارتی ناحەزی ئێمە ماناندا، نوێنەرێك هەیە، دادوەرێك هەیە خوداو (زەبووك زادە) نەبێ کەس دەرەقەتی زمانی نایێ. بە قسە هەموو کەس

دەبەستێتەوە. تەنیا (زەبوك زادە) دەتوانێ بە تەلەکەبازییەکانی قسەکانی کابرا پووچەڵ بکاتەوە. ئێمە تەنیا یەك ڕێگامان لە پێشە ئەویش ئەوەیە (زەبووك زادە) بکەین بە سەرۆکی شارەوانیو لە هەڵبژاردندا ببەیتەوەو پاشان هەمووما (زەبووك زادە) لە کارەکانیدا بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنمایی بکەین. ئەوەیەو وەسسەلام!!

دوای بیر کردنەوەو ڕاوێژێکی زۆر، دیتم تەنیا ئەو ڕێگایە هەیەو ناتوانین هیچ کەسی لە (زەبووك زادە) بێناموو‌ستر پەیدا بکەین...

ئەگەر ڕۆژهەڵاتو ڕۆژ ئاوایش ڕابسپێرین، لە (زەبووك زادە) بێناموو‌ستر پەیدا نابێ.

هەموومان بە کۆی دەنگ ئەو بۆچوونەمان قبووڵ کردوبڕیار درا بچینە ماڵی (زەبووك زادە)و مەسەلەکەی لەگەڵ باس بکەین.

جەنابی (رەزا)ی میرزای فەرماندار، بە بیستنی ئەم قسەیە، نارەحەت بووو گوتی:

- ئەوە ئێوە دەڵێی شێت بووین؟! جارێك چوونە ماڵی، بەلگەی گەوجاتی لێ وەرگرتن! ئەو جارە بچن، مارەیینامەی ژنتان بە ناوی خۆی دەکا...

- جەنابی (مورتەزا) خوا سەلامەتی کا، پشتگیری قسەکانی میرزای فەرمانداری کرد:

- ڕاستە. ئێمە نابێ بچینە ماڵی. ڕێگایەك بدۆزنەوە، بیهێنینە ئێرە...

بە کوڕی (شوکری بێ پاژنە) خەبەرمان بۆ نارد: ( وەرە بارەگای پارت ئیشمان هەیە..) وەڵامی دایەوە:

- بە چاوان. ئێستا دەگەمە خزمەتتان.

ماوەیەك چاوەڕێمان کرد، نەهات. دووبارە خەبەلارمان بۆ نارد. ئاخیری، دوای چوارەمین جار خەبەر ناردن، بەرە بەری عەسر هات. جلی نوێی پۆشیبووو جانتایەکی گەورەی لە بن هەنگڵ بوو...

کاتێ کە هاتە ژوورەوە، خێرا خێرا لە گیرفانەکانی بە دوای شتێکدا گەڕا. هەر لە ژێر لێوەوەیش ورتە ورتی دەکرد: ( سەیرە، لە کوێم دانا؟!)

هەموو، یەك پێ لە بەری هەستاین‌و زۆر لە جاران زیاتر رێزمان لێ نا بەلام (زەبووك زادە) هیچ گوێی پێ نەدا. هەموو هەست‌و هۆشی لای شتە بزربووەکەی بوو. لە گیرفانەکانی دەگەڕا. (مەلا بەدری ئاقڵمەند) دەستی بە باسی مەسەلەکە کردو گوتی:

- (ئیبراهیم بەگ) ئێمە ئەوەندەی لە بەینی خۆمان گەڕاین یەکێکی لە تۆ شیاوترو کارزانترو دروستترمان نەدۆزییەوە. ئیتر بڕیارمان داوە تۆ بۆ سەرۆکی شارەوانی هەڵبژێرین..

هەموومان واماندەزانی کە ئەو خەبەرە بە (زەبووك زادە) بدەین، خەنی دەبێ، بەلام ئەو هەر هیچ گوێی پێ نەدا، هەر لە گیرفانەکانی دەگەڕا.

(مەلا بەدر) دیسان هەندێ باسی چاکەی (زەبووك زادە)ی کردو پاشان پرسی:

- باشە، (ئیبراهیم بەگ)، ئێوە خۆتان راتان چییە؟ ئەو خزمەتە کۆمەلایەتییە قبووڵ دەفەرموون؟

(زەبووك زادە) خەریك بوو لە ناو جانتاکەیدا بە دوای ئەو شتەدا دەگەڕا کە بزری کردبوو، وەلامی دایەوە:

- داوای بوردن دەکەم مەلا، ئاگام لێ نەبوو چت گوت.

(مەلا بەدر) لە رقان رەنگی رەش هەلگەڕا بوو. ئەگەر هەر کەسێکی دی ئەو وەلامەی بدابایەوە، (مەلا بەدر) چی جوێنی لاورانەی لە منداڵی بیستبووی هەمووی پێ دەدا: هەی وا وا لێ کراو بۆچی چما تا ئێستا (یاسین)م لە بن گوێی کەر خوێندووە؟ بەلام ئەم جارە زاتی نەکرد هیچ قسەیەك بکا. وەکوو بەردی سەبووری بابەتەکەی لە سەرەتاوە دەست پێ کردەوە:

- ئێمە هیچ پیاوی لە تۆ شیاوترو کارزانترمان تێدا نییە. هاوڕێیان بڕیان داوە ئێوە بۆ سەرۆکی شارەوانی هەڵبژێرن. بێ گومان بەو مەرجەی لە هەڵبژاردن ببەینەوە.. ئێوە راتان چییە؟

(زەبووك زادە) ئەمجارەیش گوێی بە مەسەلەکە نەدا! هەر خەریك بوو لە ناو جانتاکەی دەگەڕا! ئەوەند ناڕەحەت بووین، وەخت بوو لە ناڕەحەتییان بخنکێین. تۆ تەماشا کە، سەگباب چۆن هەموومانی تەفرە داوەو گاڵتەمان پێ دەکا.

(مەلا بەدر) ئیستیغفارێکی کردو دوو بارە دەستی پێ کردەوە:

-نازانم دوای جاری چوارەم یان پێنجەمی باس کرنی (مەلا بەدر) بوو کە (زەبووك زادە) پشتی ڤیت کردەوەوەو گوتی:

- زۆر سوپاس (مەلا بەدر). بە خوا زۆرم حەز دەکرد فەرمانی ئێوە جێ بە جێ بکەم، بەڵام زۆر بە داخەوە ناتوانم... ناتوانم.

کەللەمان دووکەڵی کرد. یانی چی؟ (زەبووك زادە) سەرۆکایەتی شارەوانی رەت دەکاتەوە. ئێمە بەو رێزو ملکەچییە لێی دەپاڕێینەوە کەچی ئەو ئامادە نییە! بە کۆمەڵ لێی پاڕاینەوە، بەڵام فایدەی نەبوو. هەر خەریك بوو ناو جانتاکەی دەپشکنی گوتی:

-شەرمەزاری هەمووتانم، بەڵام ناتوانم ئەمرەکەتان جێ بە جێ بکەم. دەبێ سەرێك لە ئەنقەرە بدەم، دووبارە سەرەك وەزیران داوای کردووم!! نازانم دیسان مەسەلە چییە؟!!

دووبارە لێی پاڕاینەوە. خۆمان بە قوربان‌و بە سەدەقەی کرد، بەڵام سوودی نەبوو.

- عەرزم کردن لەم کارە بمبوورن. دەبێ بچمە ئەنقەرە. بەخوا خۆیشم لەم هات‌و چۆیە ماندوو بوویم. بەڵام ناتوانم خۆم لە یارمەتی‌و هاوکارییان دوور بخەمەوە. چ بکەم هەموویان هاوڕێی گیانی بە گیانی خۆمن. دەبێ زوو بچم.

ئەم قسانەی کردو هەستایەوە خودا حافیزی کردو ڕۆیشت. هەمووومان تەماشای دەمو چاوی یەکترمان کرد. کابرا زۆر خراپ هەموومانی مات کرد. بەرامبەر پلانی ئێمە یارییەکی وای کردبوو دەرفەتی هیچ بەرپەرچدانەوەیەکمان نەبوو. دڵنیا بووین قەبوول نەکردنی پایەی سەرۆکایەتی شارەوانی کەلەکێکە، بەڵام چ مەبەستێکی لەم کارەدا هەیە؟ کەس سەری لێ دەرنەدەکرد.

کاتێ شاگرد قاوەچی پیاڵەی چای لە پێش مەلا بەدر دانا، گوتی:

- مامە، ئەوە چییە لە بن مێز کەوتووە؟

- مەلا داهاتەوە هەندێ کاغەزو زەرفو چەند وێنەیەکی لە سەر زەوی هەلگرتەوە. لەو جێگایەی کە (زەبووك زادە) پێش چەند دەقیقەیەك دانیشتبوو. دیار بوو کاتێ (زەبووك زادە) لە ناو جانتاکەی دەگەڕا، لە جانتاکەی کەوتبوو. مەلا کە تەماشای کاغەزو وێنەکانی کرد، چاوی زەق بووەو بێ دەستی خۆی گوتی:

- یا مەولا...

وێنەکانمان لە دەستی یەکتر دەقاپاندو هەر کەسێ تەماشای دەکرد، لە سەرسامییان دەمی بەش دەبووەوەو دەستو پێی خۆی ڕێك دەخست. (ئەمین بازرگان) گوتی:

- ئەستەغفیرەللا ڕەببی!!

منیش دەرپەڕیم وێنەکانم وەرگرتو تەماشام کردن. چ ببینم باشە؟! (زەبووك زادە)ی ئێمە کە سولتانی بێناموسانە لەگەڵ سەرۆك وەزیران دەست لە گەردن وێنەی گرتووە. دەستێکی لە سەر سەرۆك وەزیران داناوەو سەرۆك وەزیرانیش دەستی لە پشتی (زەبووك زادە) وەرهێناوە. خۆش ئەوەیە سەرۆکی وەزیران بەو هەیکەلە گەورەو قەلەوەی لە چاو (زەبووك زادە) وەکوو جووجەلەیەك بوو! سەرۆکی وەزیران بە دەستی خۆی لە ژێر وێنەکە نووسیبووی:

- پێشکەشە بە برادەری هێژاو بەڕێز جەنابی (ئیراهیم بەگ) بۆ ئەوەی هەمیشە ئێمەی لە بیر بێ.

- لە یەکێ لە وێنەکاندا، سەرۆکی وەزیران لە پشت مێزی خواردنەوە دانیشتووەو سەرگەمی خواردنەوەن. زەرفەکەیش هی وەکیلو وەزیران بوو. دەتگوت (زەبووك زادە) سەراپای دەوڵەتی لە ناو جانتای خۆی کۆ کردۆتەوە.

(ئیحسان تەقاویت) بە (هەمزە جووت بەدزادە)ی گوت:

- باشە، ئێستا ئێوە چ دەڵێن؟!!

(جووت بەدزادە) شانی هەڵتەکاند:

- بەم بەڵگە زیندووانە هیچ گومانی تێدا نەماوە (زەبووك زادە) بە راستی کەسایەتییەکی گەورەیە. ئێمە نرخی نازانین! سەرۆکی وەزیرانو دەستەی دەوڵەت کەسانێك نین وێنە لەگەڵ هەموو کەس بگرن. قسەیەکی نەستەق هەیە دەڵێ: ( ناوی برادەرەکەتم پێ بڵێ، پێت دەڵێم تۆ کێی.)

- جەنابی (مورتەزا) خوا سەلامەتی دا گوتی:

- باوکە گیان، ئێمە بە هەزار سەلامو سەلەوات ناوی سەرۆك وەزیران بە زمان دەردەبڕین، کەچی رامان لە (زەبووك زادە) نییە.

ئەمە ئیتر درۆ نییە. کابرا دانیشتووە لەگەل سەرۆکی وەزیران دەخواتەوە. ئێمە بەلاش خۆمان تاخیر دەکەین. با یەکسەر لە دووی بنێرین تا سواری ترومبێل نەبووەو نەرۆیشتووە، بیگێڕینەوە. پێویستە بە هەر جۆرێ بێ، رازی بکەین سەرۆکایەتی شارەوانی وەربگرێ.

- بەڵێ.. راستە، (زەبووك زادە) هەقیەتی سەرۆکایەتی شارەوانی وەرناگرێ. ئاخر یەکێ لەگەڵ سەرۆك وەزیران هاوپێك بێ، هەرگیز رازی نابێ لەم شارۆچکە بچووکەیە ببێ بە سەرۆکی شارەوانی.

من بێدەنگ ببووم. نەمدەزانی چ بڵێم. قسەکانی ئەوان قبووڵ بکەم؟ یان تەماشای رابردووی کابرا بکەم؟

لەو قسانەدا بووین، (زەبووك زادە) بە ژووری کەوت، پرسی:

- ئەو شتانەی من لێرە کەوتوون؟

وێنەکانو کارتەکانمان دایەوە.

- بەڵێ، فەرموو (ئیبراهیم بەگ).

سەرنجێکی لە وێنەکان دا. رووی خۆی گرژ کردو گوتی:

- نا، بابە، ئەمانە بە کەلك نایەن!!

ئێمە پتر سەرسام بووین. وێنەی مۆرکراوی سەرۆك وەزیرانی بەلاوە گرنگ نەبوو. زەرفەکەو وێنەکانی لە جانتاکەی ناو دیسان خەریکی گەڕان بوو. پرسیمان:

- (ئیبراهیم) لە چ دەگەڕێی؟

- ژمارەی فایلێکە. لە سەر پارچە کاغەزێکم نووسیبوو. پەیوەندی بە کاری هاوڵاتییەکەوەیە. بۆ ئەوە بوو دەمەویست بچمە ئەنقەرە.. نازانم چم لێ کرد.

هەمووومان داهاتینەوە سەر زەوی‌و لە دوای ژمارەی فایلەکە گەڕاین. لەو کاتەدا، هەمووومان شێوەمان زۆر سەیر بوو. (مەلا بەدر) بە جۆرێ داهاتبووەوە بۆ سەر زەوی ریشی لە زەوی دەخشا. یەکێ لە هاوڕێکان کاغەزەکەی دۆزییەوەو هاواری کرد:

- ئەوەتا .. دۆزیمەوە.

(زەبووك زادە) کاغەزەکەی وەرگرت. ملی رێی گرت بڕوا. (ئەمین بازرگان) پێشی گرت.. (ئیحسان تەفاویت) دەستی گرت:

-(ئیبراهیم بەگ) تۆ گەورەی ئێمەی. لێ ناگەڕێین بڕۆی.. دەبێ لەم شارە بمێنی‌و سەرپەرشتی ئێمە بگریتە ئەستۆ. ئێمە دەزانین سەرۆکایەتی شارەوانی ئێرە شایەنی تۆ نییە، بەڵام تۆ خەڵکی ئێرەیت‌و دەبێ بۆ خاتری ئەو خەڵکە قوربانی بدەی.

زۆر رجاو تکامان کرد. (مەلا بەدر) ریشیشی بە دەستەوە گرت:

- (ئیبراهیم خان)، ئەم شارۆچکەیە دەبێ لە سایەی تۆ پێش بکەوێ. وەرە پیاوی چا بە قسەمان مەشکێنە!! دڵمان مەشکێنە!! سەرۆکایەتی شارەوانی وەرگرە.

(زەبووك زادە) دوو دڵۆپە فرمێسکی لە چاوان هات. سەری بڵند کردو گوتی:

-زۆر باشە. قبووڵ دەکەم.

ئەم رستە کورتە وەکوو خەبەری نەجاتی حوکمدراوێکی سەر دار، کاری لە هەموومان کرد. بە راستی مژدەیەکی زۆر خۆش بوو!! بە داخەوە کەیفخۆشییەکەمان زۆر درێژەی نەکێشا چونکە (زەبووك زادە) لە ئاخیری قبووڵی کرد.

- بەڵێ...

رستەکەی بە ناتەواوی جێ هێشتو نەختی راوەستا. قسەیەکی نەستەق هەیە دەڵێ: (مرۆڤی ئاقڵ هەموو وشەیەکی ماوەیەك هەڵدەسەنگێنێ..)

- فەرموو (ئیبراهیم بەگ). بۆچی بێدەنگ بووی.!

(زەبووك زادە) دیسان پشتە چاوی نەختێ تەنك کردو گوتی:

- بەڵام بوونە سەرۆکیی شارەوانی من چەند مەرجێکی هەیە.

(هەمزە جووت بەدزادە)، کە یەدیتی سەرۆکایەتی شارەوانی لە دەست دەچێ. ویستی کارێکی وا بکا لانی کەم بەینی لەگەڵ (زەبووك زادە) خۆش بێ. بۆیە بە ورووژانو خۆشەویستییەکی زۆرەوە گوتی:

- هەر مەرجێکتان هەبێ بە گیانو دڵ قبووڵی دەکەین.

(زەبووك) خۆی گوشی بۆ ئەوەی یەك دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوی بێنێ. وەڵامی دایەوە:

- هاورێیان، یەکەمین مەرج ئەوەیە: ئێوە لە کارەکانما رێنماییم بکەنو بە روونو ئاشکرایی غەڵەتەکانی خۆمم پێ بڵێن. ئێمە هەموومان بنیادەمینو وەکوو پەندەکە دەڵێ: (مرۆڤ دەشێ غەڵەت بکا.) غەڵەت کردنی بنیادەم میراتە بۆی ماوەتەوە. پایە مرۆڤ گێژو بوغرا دەکا. ئەگەر من خۆم لێ بزر ببێو ئێوە بە رووم هەڵنەهێنن، نامەردن...

نازانم ئەو بێناموسە قۆرلێرە چ کاریگەرییەکی سەیری لە دەنگی دا بوو، مرۆڤی مەستو گێژ دەکرد. دەنگی باشترین گۆرانیبێژی نۆپێرا لە چاو دەنگی ئەو

نامـەردە هـیچ نـەبوو. هـەمووەمان وورووژا بـووین و فرمێسکمان لـە چـاو دەهـات.

(هەمزە جووت بەدزادە) بێ دەستی خۆی گوتی:

- راستە. نامەردین.

(ئەمین بازرگان)، شەرمی لە تەمەنی خۆی نەکردەوە، گوتی:

- هیچ ئەمری ترتان نییە.

- ئەسـتەغفیرەللا. مـەرجی دووەم ئەمەیـە: هـیچ کـەس خـۆڕا بـە کارەکـانم هەڵنەڵێ. من زورم رك لە مەرایی و چاپلووسی ماستاوساردکەرەوان دەبینـەوە. پیا هەڵدان و پەسندان زوو مرۆڤ لە رێ دەر دەبا. شـەیتان لـە دەروازەی مـەرایی دێتـە ژوورەوە!!

ئەستەغفیرەللا... رێك وەکوو پێغەمبەرو گەورەپیاوانی ئایینی قسەی دەکرد.

- نابێ کارێکی وا بکەن من بوغراو لەخۆ بایی ببم. ئەگەر رێگای راسـتم نیشـان نەدەن، لە هەموو شتێ کەمترن...

ئەم جارە نۆرەی من بوو دروشم دابدەم. بێ دەستی خۆم هاوارم کرد:

- بەڵێ، لە هەموو شت کەمترین!!

مەرجی سێیەمی من ئەمەیە کە:...

(زەبووك زادە) دیسان بێدەنگ بووو ئێمە دووبـارە پێمـان داگـرت کـە بـەردەوام بێ:

- تکایە بفەرموون.

- دەستوراتی من موو بە موو جێ بە جێ بکەن.

(مەلا بەدر)ی ریش بزن گوتی:

- هەرکەسێ سەرپێچی لە فەرمانی ئێوە بکا بێ ویژدانە!!

(زەبووك زادە) بە جوولەی سەر سوپاسی کرد:

- هـــەمووتان دەزانـــن ناحـــەزەکانمان زۆر بـــەهێزن، بـــە تایبـــەتی سەرپەرشـتیارەکەیان، (برهـان الـدین)، کـە نوێنـەری دادرووەرییـە. پیـاوێکی قـاڵ و

سیاسەتمەدارێکی زیرەکە. شکستدانی ئەوانە بەو سادەیە نییە. بە یەکگرتن و ڕێککەوتن نەبێ، ناتوانین بە سەریاندا زاڵ ببین.

سەگباب بە جۆرێ قسەی دەکرد، ئێمە گەرووما‌ن وشك ببوو. کەس دەنگی ناڕەزایی لێوە نەدەهات. هەموو پشتگیری قسەکانمان دەکرد. یەك دونیا خۆشحاڵ بووین کە بۆ خاتری ئێمە قبوولی کردووە ببێ بە سەرۆکی شارەوانی و چاوی لە چوونە ئەنقەرە پۆشیوە.

(زەبووك زادە) چووەوە ماڵێ بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا بەرنامەی بەربەرکانی ناحەزان ڕێك بخا. هەر هێندە لە ژوورەوە دەرچوو، (ئیحسان تەقاویت) گوتی:

- هاوڕێیان، خەیاڵتان ئاسوودە بێ.. ئەو (زەبووك)ە نامەردە کە سەرۆکایەتی شارەوانی قبوول کرد، پارتەکەمان بردووتیەوە. ئێمە هەرگیز دەرەقەتی (برهان الدین) نەدەهاتین. ئێستا وەرن سەیر کەین بەرامبەر (زەبووك زادە) چ غەڵەتێك دەکا. (زەبووك) بەڵایەکی وای بە سەر دێنێ (برهان الدین) بە مەرگ ڕازی ببێ. ئەگەر گەواهینامەی نوێنەرایەتی لێ نەسەندو لە پێش دادوەریی نەیکرد بە سکاڵانووس، من سمێڵم لە بنیڕا دەتاشم...

جەنابی (غەدیر بەرهەڵستکار) گوتی:

- کەس لە من باشتر نازانێ، کارێکی وا دەکا تەیرو ماسی سکیان بە (برهان الدین) بسووتێ. ئەگەر سەراپای دونیامان سەراو ژێر بکردایە، یەکێکی لە (زەبووك زادە) بێ ناموسترو قۆڵبڕترمان نەدەدۆزییەوە!!

لەگەڵ (ئیحسان تەقاویت) بە یەکەوە لە کۆبوونەوە هاتینە دەرەوە. کاتێ گەیشتینە دەورو بەری مزگەوت، ڕوو بە ڕوو لە فەرهاد وێنەگر ڕاست هاتین. سەلاممان کردو سەلامی لێ وەرگرتینەوە. ماوەیەکی زۆر بوو، فەرهاد چووبووە شارو لای وێنەگرێکی بە ناوبانگ کاری دەکرد. پرسیم:

- ئەوە تۆ لە کوێی؟ بە تەواوی نیشتمانت لە بیر کردووە.

بەخوا ئیش زۆرە... ماوەم نییە بێمەوە. ئێستایش ئیشێکم هەیە.

- خێرە ؟!

- خێرت بێتە ڕێ، مامە گیان. ڕاستی تێکەو لێکەیەکم لەگەڵ (زەبووك زادە) هەیە. هاتوومەتە لای ئەو، بەڵام لە بەیانییەوە تا ئێستا ئەوەندەی دەگەڕێم نایدۆزمەوە.

(ئیحسان تەقاویت) پرسی:

- تێکەو لێکەی چیت هەیە؟!

- بەحوا، ئەوە ماوەیەك پێش ئێستا لای وەستاکەم، بای نریکەی 250 لیرە وێنەی گرت ،بە ناسیاوەتی من، وێنەکانی برد کە دوای چەند ڕۆژێ پارەکە بێنێ. ئێستا ئەوە دوو مانگە هیچ خەبەری نییە. دوێنێ وەستام پێی گوتم: یان پارەی وێنەکان وەردەگری، یان لە کن من دەڕۆی!

فەرهاد وێنەگر لە ناڕەحەتیان دەستی بە گریان کرد. پرسیارم کرد:

- ڕۆڵە گیان، ئەوە چ وێنەیەك بوو پارەکەی 250 لیرە بوو.

کە فەرهاد باسی کرد، تێگەیشتم ئەو وێنانەی چۆن دروست کردووە. کەواتە مەسەلەکە ئاوها بووە کە جەنابی وێنەگر بە هونەری مونتاج دەموچاوی سەرۆك وەزیران و زەبووگ زادەی لە سەر وێنەیەکی چەسپاندووە. ئەگەرنا، سەرۆکی وەزیران بەو پایەو گەورەییەی خۆی هەرگیز نایێ لەگەڵ (زەبووك زادە)ی قۆڵبڕی ئێمە لە سەر مێزێك دابنیشێ و بخواتەوە.

فەرهاد وێنەگر بە پاڕانەوە گوتی:

- مامە گیان، یارمەتیم بدەن ئەو پارەیە لە (زەبووك زادە) وەربگرم، ئەوەك نانم دەبڕێ.

سکم پێ سووتا وەڵامم دایەوە:

- ڕۆڵە گیان، من لە جێی تۆ بم، بێ ئەوەی (زەبووك زادە) ببینم، لێرە دەڕۆم و چاو لەو پارەیە دەپۆشم. بڕۆ دەستی وەستاکەت ماچ بکەو تکای لێ بکە 250 لیرەکە لە مووچەت بگێڕێتەوە.

- یانی چی؟ لێ بگەڕێم لە بەر چاوی خۆم پارەکەم بخۆن!؟ جگەری دەردێنم.

ئەوەند بە دۆڕ دڵ قسەی دەکرد، پێکەنینم هات. گوتم:

- رۆڵە گیان، اۆ ناتوانی جگەری ئەو دەربێنی. گیرفانیشت دەبڕێو هەرچی هەتەو نیتە لێت دەسەنێ. وەرە بە گوێی هی لە خۆت گەورەتر بکە!!

فەرهاد وێنەگر نەچووە ژێر بار... دیتم فایدەی نییە، گوتم:

- خۆت دەزانی!! ئێستا مادام قسە وەرناگری، لانی کەم پارەکەت بە ئەمانەت لای یەکێ دابنێ، ئیجا برۆ.

فەرهاد وێنەگر گوێی نەدایێو رۆیشت. (ئیحسان تەقاویت) (خرپ..خرپ) پێدەکەنی... پرسیم:

- بە چ پێدەکەنی؟

- پێنەکەنم چ بکەم؟! تۆ بیری لێ بکەوە، ئەو (زەمبووك زادە)یە چ ئەقڵێکی هەیە؟! جنۆکەیش فریو دەدا... کابرا یەکەم جار هات گوتی: سەرۆکایەتی شارەوانی قبووڵ ناکەم. ئەگەر یەکەم جار، قبووڵی بکردایە، لەوانە بوو یەکێ لە ناو ئێمە پەیدا ببێو نارەزایی دەربڕێ. پاشان بە فێلێك وێنەو کارتەکانی فڕێ دایە سەر زەویو ئەو شانۆگەرییەی دروست کرد کە ئەقڵی بنیادەم رادەگرێ...

گوتم:

- لەگەڵ هەموو ئەمەیشدا، خراپ نەبوو. لانی کەم نەفەرێکمان پەیدا کرد دە (برهان الین)ی بەر بدەین. لە (زەمبووك زادە) بەو لاوە ئێمە کەسمان مەردی مەیدانی ئەو نین.

لە یەك جیا بووینەوە. چووینە قاوەخانە. خاوەن ئوتێل لەوێ بوو. مەسەلەی وێنەکانم بۆ باس کرد. خاوەن ئوتێل هیچ بە لایەوە سەیر نەبوو. زۆر بە خوێن ساردی گوتی:

- من یەکەم جار دەمزانی.

- لە کوێ دەتزانی؟

- ئەی تۆ وێنەکانت نەدی؟ لە یەکێکدا، سەرۆك وەزیران زۆر گەورە بووو (زەبووك زادە) بچووك بوو، لەوەی تر، (زەبووك زادە) گەورە بووو سەرۆك وەزیران بچووك بوو.

دەرکەوت من لە هاورێکان دەبەنگتر بووم. چونکە من نەبێ، هەموو بە مەزەندە بە مەسەلەکەیان دەزانی.؟ بەڵام بۆ ئەوەی (زەبووك زادە) (برهان الدین) شکست بداو ئێمە ببەینەوە، هیچ قسەیان نەدەکرد.

ئەو رۆژە بۆ سبەینێ، بیستم فەرهاد وێنەگر نەگەڕاوەتەوە شار. خەریکە دوکانی وێنەگری لە شارۆچکەکەمان دەکاتەوە. (ئیحسان (تەقاویت) دەبینێ فەرهاد وێنەگر پارچە جگەرێکی لە سەر دەستەو دەڕوا. بەو خەیاڵەی ئەمە جگەری (زەبووك زادە)یە، پێشی لێ دەگرێو دەپرسێ:

-فەرهاد، ئەوە چییە؟ جەرگی (زەبووك زادە) نەبێ!!

فەرهاد وێنەگر بە ترسو لەرز تەماشای دەورو بەری خۆی دەکا:

- وس... مامە (ئیحسان)، بە هێواشی قسە بکە!! نەوەك بە (ئیبراهیم خان) بگاتەوە... من تا ئێستا نەمدەزانی ئەو پیاوە کەسایەتییەکی چەند گرنگە!!! (زەبووك زادە) نیعمەتێکی خودایە. ئێمە قەدری نازانین. خوا روحمی کرد ناوی پارەم نەهێنا نەوەك ئابڕووم پاك دەچووو دەچوو. کە منی دی گوتی:

- رۆڵە، من هەر بە دوای تۆدا دەگەڕام... خودا تۆی بۆ هێنامە ئێرە.. باش بوو هاتی.!

بڕیاری داوە لە سەر حیسابی خۆی دوکانێکی وێنەگریم بۆ دروست بکاو لێرە بمێنمەوە وێنەی دەنگو باسی پارتو هەڵبژاردن بگرم... کە هەستام ویستم بێمە دەرەوە، ئەم جگەرەی پێدامو گوتی:

- رۆڵە گیان، ئەمە بۆ دایکت ببە..

توخوا تەماشای ئینسانییەتو گەورەیی بکە.

بەڵێ، جەناب، چ سەرت بیەشینم؟ پارتەکەمان لە سایەی (زەبووك زادە) لە هەڵبژاردن بردییەوەو جەنابی ئیبراهیم بەگ بە سەلامو سەلاوات لە سەر کورسی سەرۆکایەتی شارەوانی دانیشت.

باوەڕ بکە هەر بە خاوی (برهان الدین)ی نوێنەری دادوەریی دەخوارد. بەڵام فایدەی چییە؟ زۆر بەدبەختی بە سەر هێنایین. کارێکی کرد هەمووومان لە دەستی دیقی مەرگمان کردو خوێن رشاینەوە.

ئەم ئیشە سووچی کەس نییە. هەر بەڵایەکمان بە سەر هاتووە، لە بێ مێشکیو کەودەنی خۆمان بووە. پێویستە بە تۆبز لە سەرمان بدەن. هیچ چارەی تر نییە. رۆڵە گیان، ئێمە ئەوە چووین، تۆ ئاگاداری خۆت بە. نەکەی رۆژێ، پەیوەندی پێوە بکەی، ئەوەك فاتیحات بۆ لێ دەدرێ!!

# (13)

## (گاڵتەمان پێ کرد، خراپتر بوو!..)

خاوەن ئوتێل بەم جۆرە باسی دەکرد:

- خۆزگە ئەو ناکەس بەچەیەمان نەکردایە بە سەرۆکی شارەوانی! بە دەستی خۆمان بەڵامان بە سەرخۆماندا هێنا. کابرا، کە بوو بە سەرۆکی شارەوانی، بوو بە کابرایەکی ئەوەندە خراپ، هەر مەپرسە!! شەمەر دەرەقەتی نایێ !!

- شەوێ لە چێشتخانەی ئوتێل دانیشتبووین دەمانخواردەوە، تازە چەند پێکێکمان هەڵدا بووو خەریك بوو مەست دەبووین، (زەبووك زادە) رابواردنەکەی لێ تێکداین. هەتیوچەی بێ داكو باب، نەیهێناو نەیبرد بێ پێشەکی گوتی:

- لە سەردەمی (عبدالنظیف) پاشای بابە گەورەم، ئەم شارۆچکەیە کەوتبووە ناو جەنگەل.

دەتگوت بۆمبایەگی گەورەیان لە بن گوێم تەقاند. یەکەم جار وامزانی بە غەڵەت تێگەیشتووم.. تەماشای رووی هاوڕێیانم کرد، دیتم ئەوانیش وەکوو من واقیان وڕ ماوە. کام پاشا؟! نیوەی زیاتری خەڵکی ئەم شارۆچکەیە بە چاوی خۆیان بابە گەورەی ئەم پیاوەیان دیوە. کەی پاشا بوو؟! خۆم پێ؟ رانەگیرا لێم پرسی:

- ببوورە (ئیبراهیم بەگ) فەرمووت سەردەمی کێ!؟

بەبێ شەرمو بەبێ چاوڕوویی ، زۆر بە توندیو سەنگینی تەماشای دوڕ چاوی کردمو وەڵامی دایەوە:

- لە سەردەمی(عبدالنظیف) پاشا.

ئێمە درۆی گەورەمان بیستبوو، بەڵام تا ئێستا درۆی وا گەورەمان بە بیردا نەدەهات. جەنابی (رەزا) میرزای فەرماندار گوتی:

- (ئیبراهیم بەگ) مەبەستت چییە؟

بێ دەستو پێی لێ گوم ببێ گوتی:

- خەریك بووم لە کتێبخانەکەم بە دوای شتێدا دەگەڕام، دەستەخەتێکی خوا لێخۆش بوو (عبدالنظیف) پاشای بابە گەورەم دیتەوە. خوای لێ خۆش بێ. پوختەی مێژووی ئەم شارۆچکەیەی نووسیوە. بە ڕاستی زۆر گرنگو سەرنجکێشە. لە زەمانی کۆن شارۆچکەکەمان پایتەختی دەوڵەتی (جانوفولیز) بووە.

هەموو تەماشای دەمو lاوی یەکترمان کرد. کورە، ئەو چ دەڵێ؟

(جانوفولیز) چییە؟ کامە پایتەخت؟ (عبدالنظیف) چ کەودەنێکە؟!

جەنابی (رەزا) میرزای فەرماندار پرسی:

- ئەو کتێبەی دەڵێی، بە چ زمانێك نووسراوە؟

جەنابی (رەزا) جێگایەکی باشی گرتبوو. چونکە (زەبووك زادە) پیتی عەرەبی نەدەزانیو بێ شك ئەو کتێبەی لە زەمانی بابە گەورەی نووسراوە بە زمانی عەرەبییە. بەڵام (زەبووك زادە) ئەم جارەیش خۆی لێ بزر نەبوو. بە بێ دامان وەڵامی دایەوە:

- جەنابی رەزا، ئەمە چ پرسیارێکە؟! هەڵبەت بە زمانی عەرەبی کۆن نووسراوە. ئەو کاتە پیتی لاتینی نەبوو.

کابرا درۆ لەسەر درۆی دەهۆنییەوە. سەراپای شارۆچکەکەمان رێ و رەچەڵەکیان دەناسی. لەگەڵ ئەوەشدا لە خۆی تەریق نەدەبووەوە.

من خۆم لە بیرمە تەمەنم پازدە، شازدە ساڵ بوو، لە لای شارستانی (فارس) چەند کۆچبەرێك هاتنە ئێرە. دەوڵەت هەر یەکەو پارچە زەوییەکی پێ دان بۆ ئەوەی کار بکەنو نانی ژنو منداڵیان دەربێنن. لەو کۆمەڵە کەسە یەکێکیان قیافەی زۆر سەیرو سەرنجکێش بوو. دەستی درێژو ملی وەکوو کەلەشێر بڵندو

هەلگەڕاوە بوو. من چەند ساڵە جگەرە دەکێشم‌و ملیۆنەها جگەرەکێشم دیوە بەڵام تا ئێستا کەسی وەکوو ئەوم نەدیوە. سیمایەکی تایبەتی بە خۆیەوە دەگرت مرۆڤ لە پێکەنینیان دەپچڕا. هەمیشە چاکەتی بە سەر شان دادەدا. بە کورتی سیماو قیافەی وای دەردەخست نەزانێکی ملەستوورە..

ڕۆژێ، گەنجێك لێی پرسی:

- ببوورە. پرسیار کردن عەیب نییە... ناوت چییە؟

کابرا ئەم پرسیارە ڕاچڵەکی:

- بڵێ ئاوها؟! هێشتا ئێوە من ناناسن؟! تف لە ئێوە! چۆن گەورەترین نەزانی وڵاتی خۆتان ناناسن.؟!

پاشان دەستی بە سمێڵی داهێناو بەردەوام بوو.

- من پێم دەڵێن نەزان (ماندار یووسف)! ئێستا منتان ناسی؟

هەڵبەت. لەگەڵ ئەو ناساندنەیش هێشتا کەس نایناسێ.

(یووسفە ڕەشی زیبك زادە) پێکەنینێك دەکا وەکوو ئەو پێکەنینەی زانا بەرامبەر نەزانی دەکاو لە سەد جوێن خراپترە.

دوای ئەو ڕۆژە، گۆڕانی گەورە لە شارۆچکەکەمان ڕووی دا. هەموو خەڵکی شارۆچکەکە بە پێڕەو کردنی (زیبك زادە) بە قیافە بە ڕێدا دەڕۆیشتن. بە قیافە جگەرەیان دەکێشا. بە قیافە دەکۆکین. جگە لەوەیش هەمیشە سمێڵیان با دەدا. بەقاڵ‌و چەرەزفرۆشەکانی شارۆچکە سەریان سوڕما بوو. نەیاندەزانی هۆی چییە فندق ئەوەندە ڕەواجی پەیدا کردووە! جاران، ساڵی، بە زۆر یەك کیلۆ فندقیان دەفرۆشت. فندق ئەوەندە لە ناو سندووقان دەمایەوە هەموو خراپ دەبووو فڕێیان دەدا، بەڵام ئێستا فرۆشتنی فندق ئەوەندە بە هەڕمێن بووە، نرخی چەند قاتی جارانی لێ هاتووەو لە بازاڕ دەست ناکەوێ. تومەز چەوراتی فندقی سووتاو بۆ دەرهاتنی موو باشە!!و کارێکی زۆر دەکاتە سەر ڕەنگ‌و ڕەونەقی مووو ڕەش‌و

بریقەداری دەکا. پیرو گەنج تەنانەت کوڕی پازدە، شازدە ساڵی دەیانەویست بە لێدانی ڕۆنی فندق سمێڵیان چەخماخی بکەن.!

لێچواندن عەیب نییە، سمێڵی پیاوەکانی شارۆچکەکەمان لە شاخی شوور درێژتر ببوو. گەنجەکان، ئەوەندەی سمێڵیان با بدەن، سەری پەنجەیان ڕەقێتە ببوو.

شەوێ، (عوسمان قەساب)، خوا لێی خۆش بێ، (یووسفە ڕەش)ی بۆ شێو داوەت کرد. سەرانپای گەنجانی شارۆچکە کەوتنە جمو جووڵ. حەزیان دەکرد لەو دانیشتنەدا ئامادە بن و ماوەیەك لە نزیکەوە گوێ (یووسفە ڕەش) بگرن.

داوەتێکی وا بوو تا ئەو ڕۆژە کەس شتی وای لە شارۆچکەکەمان نەدی بووو نەبیستبوو. هەموو تەماشای دەمی (زیبك زادە)یان دەکرد داخۆ چ قسەی باش و عالی دەکا! بەڵام ئەو قەت هیچ دەمی نەکردەوە. بەردەوام سمێڵی با دەدا.

دوای ئەوەی شێوێکی زۆر باشمان خوارد، (یووسفە ڕەش)ی (زیبك زادە) لە سەری مەجلیس، لە سەر دۆشەك دانیشت و دەستی بە قسە کرد:

- جەنابینە، چیرۆکی من زۆر دوورو درێژە!!...

لە قسەکانی تێگەیشتم هێشتا چواردە ساڵی تەواو نەکردبوو، ببوو بە قارەمانی وڵات. لە بیست ساڵی، ببوو بە ڕێگری سەر چیا. لە سی ساڵی، لە دەوڵەت یاخی ببوو. هەر جارەی لە چیا دەهاتە خوارێ، جەندرمە بە مادوون دەچوونەوە.

تا (زیبك زادە) زیاتر باسی دەکرد، ئێمە لە سەرسامییان دەممان زیاتر بەش دەبووەوە.

(زیبك) ئەو شەوە، تا سبەینێ، باسی کارە سەیرو سەمەرەکانی خۆی کرد... باسی دزی و بێناموسییەکانی خۆی کرد کە لە ژیانی کردبووی.

کابرا چل ساڵ، خەوو خۆراکی لە کارمەندانی دەوڵەت حەرام کردبوو بەڵام سەیر لەوەدایە ئێمە تا ئەو ڕۆژە ئێمە ناومان نەبیستبوو!!

بـه راسـتی جێـی سه‌رسـامییه‌! ئێمـه میللـه‌تێکی وه‌کـوو کیسـه‌ڵ وایـن. سـه‌رمان بردۆته‌وه ناو قاوغی خۆمانو ئاگامان له عه‌مری بێزه‌وار نییه.

خانوویـه‌کی هـه‌ره چـاكو خۆشـی میراتـی ئه‌رمه‌نییـه‌کانمان دایـه (زیبـك زاده). مه‌سره‌فیشی کاسبو خـه‌ڵکی شـار گرتیانـه ئه‌سـتۆ. لێ نه‌ده‌گه‌ڕان (یووسـفه ره‌ش) ده‌ست بۆ ئاوی ساردو گه‌رم ببا. ئه‌گه‌ر ده‌ستێکی له ناو ڕۆن بوایه، ده‌سته‌که‌ی تری له ناو هه‌نگوین بوو. خه‌ڵك ده‌ترسان، خوا نه‌کا، (یووسفه ره‌ش) تووڕه ببـێو ژیـان به هه‌موو عاله‌م تاڵ بکا. ماڵه‌که‌ی وه‌کوو عه‌نباری سه‌ربارخانه پڕ بوو له ناووقه. هه‌ر که‌سه هه‌رچی ده‌که‌وته به‌ر ده‌ستی، بۆی ده‌برد، نـه‌وه‌ك نـه‌زانێکی نـاوداری وا له ده‌ست خه‌ڵك ناڕه‌حه‌ت ببـێ. ئـاخیریش بـۆ ئـه‌وه‌ی لـه بـه‌ڵای ئـه‌و بحه‌سێنه‌وه‌و خـه‌یاڵیان ئاسـووده بـێ، جـوانترین کچـی شارۆچـکه‌یان لێ مـاره کـرد. ئه‌گه‌رچـی (یووسفه ره‌ش) به خۆشبوونی ژیانو گوزه‌رانی له خراپـه‌و ئـازاردانی خـه‌ڵکی که‌م کردەوه‌و خه‌ڵك چـه‌ند ڕۆژێـك هه‌ناسـه‌یه‌کی ره‌حـه‌تیان هه‌ڵکێشا، بـه‌ڵام کـه خـودا کـوڕێکی پـێ کـه‌ره‌م کـرد (ئیـبراهیم)و (ئیـبراهیم) بـوو بـه شـه‌ش حـه‌فت سـاڵی، شه‌یتانیی ئه‌و منداڵه‌و ئه‌و ناڕه‌حه‌تییه‌ی ئـه‌و منداڵـه یـه‌ك بسـته تووشـی خـه‌ڵکی ده‌کـرد، هـی ئـه‌وه نـه‌بوو به‌رگـه‌ی بگیرێ. خۆزگـه هـه‌ر ئـه‌و کاتـه شـیرپاکێك ئـه‌و حه‌رامزاده‌یه‌ی له ناو ببردبوایه!!و داغی به جه‌رگی باوکی بنایه!! بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌مڕۆ ئه‌و دززاده بێ دایكو باوکه ئه‌وه‌نده روو قایم نه‌بێ له ناو خه‌ڵك دابنیشـێو باسی باوکه گه‌وره‌ی بکاو بڵێ پاشایه‌کی گه‌وره بوو.

جا وه‌ره ئێستا مێشکت له سه‌ر ده‌رنه‌چێ!! به کورتی خۆم پێ ڕانه‌گیرا، گوتم:

- (ئیبراهیم به‌گ)، ئه‌و (عبد النظیف) پاشایه پاشای کوێ بوو؟

(زه‌بووك زاده) بێ ئه‌وه‌ی له خۆی ته‌ریق بێته‌وه، وه‌ڵامی دایه‌وه:

- باپیره گه‌وره‌مان سه‌رداری سولتان مـراد پاشـای کـۆنی عوسمـانی بـوو. ده‌وڵـه‌ت هه‌موو زه‌وی ئه‌م ناوچه‌یه‌ی پێداوه.

- تف!! سەگباب، بابە گەورەی کرد بە پاشا، بە جەهەننەم!.. خەریکە باپیریشی بەرز دەکاتەوە بۆ پلەی ( سەرداری). ئەگەر قسە نەکەین خۆی دەکا بە جەنەراڵو وردە وردە دەبێ بە سەرۆك وەزیران!!

ئێمە چاوەڕێمان دەکرد، جەنابی (رەزا)ی میرزای فەرمانـدار (زەبـووك زادە) وەکوو ئەسکەناسی رزیو ورد بکا، بەڵام ئەو چ بڵێ باشە؟! نەیهێناو نەیبرد گوتی:

- بەڵێ، راست دەفەرمووی. من بە تەواوی باوکی تۆم لە بیرە.. پیاوێکی گەورە بوو، خوای لێ خۆش بێ، زۆر باشم لە بیرە رۆژی لە دایك بوونی تۆ، باوکت یەك گوندی گەورەی بە لادێییان بەخشی...مرۆڤی جاران شتێکی تر بوون!! باوکت سفرەی هەمیشە لە گۆڕێ بوو.. ژارو نەدار هەمیشە لە سەر سفرەی باوکت بوون. زەمانێکی خۆش بوو! هەموو خەڵکی ئەم شارۆچکەیە قەرزاری چاکەی باوکی خوالیخۆشبووی تۆن!!

(ئەمین بازرگان) داهاتەوەو لە بن گوێم گوتی:

- کردی بە گاڵتەجاڕ. وا نییە؟

- چ بکا، چارەی نییە؟

(زەبووك زادە) تێگەیشت ئێمە باسی چ دەکەین. بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- مامە (ئەمین) تۆ (عبد النظیف) پاشای بابە گەورەی منت دیبوو؟

- نەخێر... من ئەوسا کۆرپەیەکی شیرەخۆرە بووم. بەڵام باوکم زۆر باسی دەکرد.

وەخت بوو لە سەرسامییان شاخ دەر بکەم!! وەی خودایە، خودایە، ئەو خەڵکە بۆچی ئەوەندە مەراییکەرو دووڕوو و کوڕی رۆژن. هەر ئێستا لە بن گوێی من گوتی: کردوویانە بە گاڵتەجاڕ! ئێستایش ئاوها دەڵێ!!

ئانیشکێکم لە قەپرغەی دا، بە سەرنجی سەرکۆنە ئامێزەوە سەرزەنشتم کرد. بە ئاماژە وەڵامی دایەوە: تەفرەم دا.

بەڵام من دەمزانی ئەمە چ جۆرە تەفرەدانێکە. (یووسفە رەش)یان کرد بە پاشا . باپیریان کرد بە سەردار. من لەو بیرانەدا بووم، (مەلا بەدر) دەستی بە قسە کرد:

- خودا لە باوکی مەرحوومت خۆش بێ! ئەساو ئێستایش کەس نەیتوانی جێگای پڕ بکاتەوە.

(زەبووك زادە) وێنەیەکی لە ناو جانتای گیرفانی دەرهێناو پێشانی داین.

- ئەمە وێنەی (یووسفە رەش)ی پاشای باوکمە.

وێنەکەم وەرگرتو تەماشام کرد. وێنەی یەکێ لە سەرۆك وەزیرانی کۆن بوو. بەو جلە تایبەتیو مەلیلەدۆزییەوە، هیچ بە (یووسفە رەش) نەدەچوو. (زەبووك زادە) لێی پرسیم:

- چۆنە؟ باشە؟

- نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە. مەگەر من لە ناو ئەو کومەڵە کەسە لە هەموویان راستگۆترم؟

وەڵامم دایەوە:

- هەڵبەت چاکە. رێك خۆیەتی. قیافەکەیم بە تەواوی لە بیرە. دەڵێی ئەم وێنەیەی لە کاتی خەباتی میللی گرتووە.

(ئەمین بازرگان) دیسان داهاتەوەو لە بن گوێم گوتی:

- هاورێ، تۆ لە هەموومانت تێپەڕاند. ئاخر کوری (یووسفە رەش)و خەباتی میللی؟! ئەو گۆڕ بە گۆڕ چووە لە سمێل بادان زیاتر هیچی نەدەزانی.

پێکەنیمو وەڵامم دایەوە:

- تەفرەم داو گاڵتەم پێ کرد.

(مەلا بەدر) دەنگی ساف کردو گوتی:

- برادەرانی ئازیز، ئەرکی مرۆڤایەتی وامان لێ دەکا بە مەبەستی قەدرگرتنی ئەم پاشا گەورەو میللییە، وێنەی (یووسف پاشا) بە قەد خۆی گەورە بکەینو لە

چوارچێوەیەکی زێڕی بگرینو لە سالۆنی کۆنفرانسی شارەوانی هەڵیبواسین بۆ ئەوەی هەموو خەڵك بیبینێ.

من بە هێواشی گوتم:

-تف لە ریشت! ئەی مرۆڤی سەگ سیفەت!! ئاخر لە وڵات مرۆڤ قات بووە تا وێنەی (یووسفە رەش)ی بێناموس لە چوارچێوە بگرینو لە سالۆنی شارەوانی دابنێین؟!

ئەوانەی تریش هەموو بە یەك دەنگ پێشنیاری (مەلا بەدر)یان پەسند کرد:

- بەڵێ، ئەمە ئەرکێکی میللیو کۆمەڵایەتییە.

بە کورتی پارەیەکی زۆریان لە بووجەی شارەوانی خەرج کردو وێنەی (یووسفە رەش)یان لە چوارچێوەیەکی زێڕ گرتو لە هۆڵی سالۆنی کۆنفرانسی شارەوانی هەڵیانواسیو لە ژێرەوە نووسیان:

( قارەمانی تێکۆشەری میللی: (یووسفە رەش) پاشا.)

ئەگەرچی هەموو لە هەموو دەڵێن باش گاڵتەمان بە (زەبووك زادە) کردو تەفرەمان دا! بەڵام فایدەی چییە کابرا لە خۆی تەریق نابێتەوەو شەرم لە خۆی ناکاتەوە. هەر میوانێکی دێتە شارەوانی، وێنەکەی پێشان دەداو زۆر بە ترشو خوێ باسی فیداکاریو خزمەتەکانی باوکی خوالێخۆشبووی دەکا.

ئێمەیش کە ئەم (...)ەمان خواردووەو بۆ گاڵتە پێ کردنی وێنەیەکمان بۆ باوکی دروست کردووە، ئیتر ناتوانین هیچ قسەیەك بکەینو ناچارین بەرگەی هەموو بێناموسییەکانی بگرین تا بزانین خودا چ دەکا!

## (14)

**(ئەم جۆرە مانگایە...**

**دەبێ ئەم جۆرە گوێرەکەیەی هەبێ!)**

(ئیحسان تەقاویت) سەربردەیەکی بۆ گێڕامەوە:

- بەندە بابایەکی سەربازم... سیو چوار ساڵی رێك خزمەتی سەربازیم کردووە. سەراپای وڵات بست بە بست گەڕاوم. هەزار پیاوی سوار چاك لە بەر دەستم دەرچووین. ئەگەر سەرانسەری وڵات بگەڕێی، ناتوانی یەکێکی وەکوو من بدۆزیتەوە. پیاو مەدحی خۆی نەکا، بە یەك سەرنج دەتوانم هەمو کەس بناسم.

هەزار دزو قاچاغچیو زەلامکوژم دیوە بەڵام هیچێکیان وەکوو ئەم (زەبووك زادە)یە بێنامووس نەبووین. ئەو بێ شەرەفە لە سەگبابیو حەمزادەیی لە هەموو کەسی تێپەڕاندووە. ئەگەر هەموو پیسی دونیا کۆکەیتەوە، ناکاتە یەك نینۆکی (زەبووك زادە)...هەموویشی سووچی (مەلا بەدری ئاقڵمەند)ە. ئەو بوو، ئەو خاکەی بە سەر ئەم شارۆچکەیە داکرد. (مەلا بەدر) زۆر زیرەکە. هەموو شتێ دەزانێ. تەنیا شتێ کە نەیزانی سوورەتی ئەلحەمدە.

رۆژێ، شوانێکی شارۆچکەکەمان خەبەری هێنا فرۆکەیەك لە پشت ئیمامزادە بەربۆتەوە! ژنو منداڵو پیرو لاو چوونە ئەو جێیەی شوانەکە گوتبووی. دوو کەسیش رایان کرد بۆ لای بارەگای جەندرمە بۆ ئەوەی خەبەری کەوتنی فرۆکەکە بە دەوڵەت بگەیەنن.

جەندرمە وەك برووسكە هاتنە شوێنەكە. بەڵام هەرچەندە خەڵكو جەندرمە گەڕان، هیچ نیشانەیەكی فڕۆكەیان نەدۆزییەوە.

بەینەك پێ چوو، ڕۆژێكی تر، شوانێك لە كاتی مەڕ لەوەڕاندن ئاسكەلتێك دەدۆزێتەوە. یەكسەر بە غار دەچێ جەندرمە ئاگادار دەكاتەوە.

ئاسكەلتەكەیان هێنایە شارۆچكە. من خۆیشم بینیم. یەك پارچە ئێسقان بوو. گۆشتەكەی نەمابوو. دیار نەبوو ئاسكەلتی چ شتێكە. پزشكی تەندروستیی شارۆچكە بە مادۆن چووبوو. یەك فەرمانبەری تەندروستیمان هەبوو بە ناوی (حەیدەر تەنقیە). ئەومان هێنا. جەنازەكەی پشكنی، بەڵام هیچ سەری لێ دەر نەكرد... لە دوای (مەلا بەدر)مان نارد، كە سەری لە هەموو شتێ دەردەچێ، مەلا، هەر هێندە چاوی بە ئاسكەلتەكە كەوت، گوتی:

- فڕۆكەوانی چی؟ ئێمە هیچ جەنگمان نەبووە. شەڕمان نەبووە.

(مەلا بەدر) دەستی بە ریشی داهێناو وەڵامی دایەوە:

- لە بیرتانە ماوەیەك پێش ئێستا فڕۆكەیەك لێرە كەوتە خوارەوە؟

- بەڵێ.

- ئەمە ئاسكەلتی فڕۆكەوانی ئەو فڕۆكەیەیە. داماوە شەهید بووە!! فڕۆكەوانی جەنگییە..

هەموومان ئافەرینمان لە ئەقڵی (مەلا بەدر) كرد! دەولەت هێشتا نەیتوانیوە فڕۆكەی سەربازیی پەیدا بكا، كەچی (مەلا بەدر)ی ئێمە فڕۆكەوانیشی پەیدا كردووە. ئێستا چ بكەین؟ یەكسەر خەبەری جەندرمەمان دا. ئەوانیش خەبەری ئارێزگاریان دا! (زەمبووك زادە) ئاگای لەو ڕووداوانە نەبوو. كە پێی زانی زۆر پێ ناڕەحەت بوو:

- بۆچی بێ ئاگاری من ئەو كارەتان كردووە؟ تف!! حەیف بۆ ئەو نانە گەنمەی ئێوە دەیخۆن.

پرسیمان:

-(ئیبراهیم بەگ)، ئایا ئێشێکی خراپمان کردووە خەبەری پارێزگارمان داوە؟!

- بێ گومان ئێشێکی خراپتان کردووە. دەرفەتێکی عالیو نایابتان لە دەست داوە.

لە قسەکانی هیچ تێنەگەیشتین... تەماشای یەکترمان کرد. (مەبەستی چییە؟ دیسان دەیەوێ چ دەستە گوڵێك بە ئاودا بدا!؟)

(مەلا بەدر) پرسی:

- ئەو دەرفەتە نایابە چ بوو، ئێمە تێکمان دا؟

ئاخر ئەحمەقینە، بەربوونەوەی فڕۆکەو دۆزینەوەی جەنازەی فڕۆکەوانەکە مایەی خێرو بەرەکەتی شارۆچکەکەمانە.

زیاتر سەرمان سوڕما. کەوتنی فڕۆکەو شەهید بوونی گەنجێك چۆن دەبێ بە مایەی خێرو بەرەکەت؟

(مەلا بەدر) دیسان پرسی:

- جەنابی (زەمبووك زادە)، ئەم ئێشە خێرەکەی لە چیدایە؟

- من چیتان پێ بڵێم کە ئێوە هیچتان ناچێتە مێشك! ئەگەر ملیۆن لیرە خەرج بکەن بە قەدەر ئەم رووداوە شارۆچکەکەمان بە ناوبانگ ناکا.

(ئیسماعیلی بەندەی خودا) گوتی:

- رۆڵە گیان، روونتر قسە بکە، با ئێمەیش تێ بگەین!!

(زەمبووك زادە) دەستی بە روون کردنەوەو لێکدانەوەی بابەتەکە کرد. جەندرمەیەك هات. گوتی:

- جەنابی پارێزگار دەستووری داوە جەنازەی فڕۆکەوانی شەهید رەوانەی پایتەخت بکەین.

کە جەندرمەکە ئەم قسەیەی لە دەم هاتە دەرێ، (زەمبووك زادە) بە دوو دەست لە چۆکی خۆی دا:

- ئایوای!! دیتت چی لێهات؟ جا ئێستا وەرە چاکی کەوە؟!

دوو کەسەی لەسەر جەنازەی فرۆکەوانەکە دانــاو چــووینە بارەگــای پارت.(زەبووک زادە) پەیوەندی بە رابەری پارت کرد:

-جەنازەی ئەو فرکەوانەی فرۆکەکەی لە خاکی ئێمە بەربۆتەوە، بە هیچ جۆرێ نادەین بە هیچ کەس!. بە پارێزگاریش بڵێن دووسبەی رێو رەسمی بە خاک سپاردنی جەنازەی شەهید بە تەشریفاتی سەربازیی بەرێوە دەچێو هەر لە جێی خۆی جەنازەکە دەشارینەوە. ئەگەر بیانەوێ جەنازەکە لێرە ببەن، سەراپای خەڵکی شارۆچکەکەمان مانگرتنی گشتی دەکەن.

تەلەفۆنی دانایەوەو ئاوڕی لە ئێمە دایەوە:

ئێستا بینیتان کەودەنی نەخوێندەوارینە؟ سوپاس بۆ خودا ئیشەکەم رێك خست، نەوەك فێڵیان لێ دەگردین. ئێستا دەبێ چاکی لێ بکەین بە لاداو جەنازەی شەهید بە جۆرێ بە خاك بسپێرین تا ئێستا کەس شتی وای نەدیبێ. زوو خەبەر بە (محەمەد) تۆپچی بدەن تۆپ لە سەر چیای ئیمام زادە ئامادە بکا.

(هەمزە جووت بەدزادە)، کە دوای کەوتنی لە سەرۆکایەتی شارەوانی، وەکوو پشیلەی کەوتووە ناو ئاوی لێ هاتووە.ئەو قیافانەی جارانی نەماوە. لە کاتێکا کە لە پێش (زەبووك زادە) وەستابوو، پرسی:

-دەبێ چەند تۆپ باوێن؟

(زەبووك زادە) تووڕە بوو:

– ماڵ خراپ ئەوەیش پرسیار کردنی پێ دەوێ؟! بۆ بەرز راگرتنی رێزی شەهید، پێویستە لە سبەینێ هەتا ئێوارێ یەك لە سەر یەك تۆپ باوێن!!

- زوو کەن تاقی سەرکەوتن لە عەنبار دەربێنن و ئامادەی بکەن. من ئێستا دەچمە شار، کارو بار رێك دەخەمو چەن کەسێك داوەت دەکەم. تا من دێمەوە نابێ هیچ کەمو کەسرییەك هەبێ.

(زەبـووك زادە) ڕۆیشـتو ئێمـە خـەریكی كاروبارەكـە بـووین. سـەراپای خـەڵكی شارۆچكەكە كەوتبوونە جمو جووڵ. هەر یەكە ئیشێكی دەكرد. (ئـەمین بازرگـان) گوتی:

- بـە ڕاسـتی هـەر بـژی (زەبـووك زادە) كـە ڕێنماییمـان دەكـا، ئەگـەرنا، ئێمـە گەنجینەیەكی ئاوا گەورەمان لە دەست دەچوو.

منیش گوتم:

-بە ڕاستی، ڕاست دەكەی! گۆڕی شەهیدێك بۆ ئێمە زۆر ڕۆر پێویست بـوو. حـوا لە باوكی (زەبووك زادە) خۆش بێ كە تێی گەیاندین!

هەموو شتێكمان ئامادە كرد، بەڵام (زەبووك زادە) هێشـتا لـە شـار نـەهاتبووەوە. تەلەفۆنمان بۆ بارەگای پارتَ كرد لە شارو گوتمان:

- ئەو جەنازەیە چ لێ بكەین؟

– هیچ. ئەمە شتێ نییە خراپ ببێ.!!

- ئەدی ئەو ڕێو ڕەسمەی بڕیارە بیكەین؟

- سەبر بگرن، خەبەرمان بە ئەنقەرە داوە، بڕیارە دەستەی دەوڵەتو ژمارەیـەك فەرمانبەری گەورەی سەربازییو مەدەنی بێن. زۆر باش ئاسكەلتەكە بپارێزن! یەك دەقیقە لێی غافل نەبن! نەوەك ناحەزەكانمان بیبەنو پلانەكـەمان لێ تێـك بـدەنو ئەو شانازییە بۆ خۆیان ببەن. ئێمە دۆزیومانەتەوەو شانازییەكەی بۆ ئێمەیە.

تەلـەفۆنمان دانایـەوە. دیتمـان ڕاسـت دەكـا. كـەوتنی فڕۆكـەو شـەهیدبوونی فڕۆكەوانەكە شتێ نییـە هـەموو ڕۆژو هـەموو حەفتەیـەك دوبـارە ببێتـەوە. ئەمـە شانازییەكە بەنسیبی هەموو شارێك نابێ.

دوای دوو ڕۆژ (زەبـووك زادە) هاتەوە...هـەموو ئـێش ڕێـك خـرا بـوو. تـاقی سـەركەوتنمان چـەقاند بـوو. هـەموو دوكانـەكان بـە ئـاڵای میللـی ڕازابوونـەوە. (عوسمان قەساب) گوتی:

-(ئیبراهیم بەگ)، قوربانی ناوێ؟

(زەبووك) خەندەیەکی گالتەجاڕانەی کرد:

- کورە، بڕۆ دوای ئیشی خۆت!! تۆیش دوو گای مردەڵەت هەیە، دەتەوێ بە ئێمەی ساغ بکەیتەوە؟! بەیانی، کە خەڵکی شار قوربانییان هێنا ، ئەوسا وەرە تەماشا کە، بزانە قوربانی یانی چی؟

قسەکەی راست بوو. لۆری پڕ گاو مەڕ یەك لە دوای یەك هاتنە شارۆچکەکەمانو گیانداری بەسەزمانیان لە گۆڕەپانەکە بە تاڵ دەکرد. تا بەرەبەری نیوەڕۆ ئەوەندەیان گاو گامێشو مەڕ هێنا، گۆڕەپانی شار وەکوو لەوەڕگای تەکساس لە رانو گاران شەپۆلی دەدا.

لە (زەبووك)مان پرسی:

-ئەو هەموو گاو مەڕەی بۆچییە؟

- دەمەوێ هەمووی لە بەر پێی میوانان بکەم بە قوربانی...

لە هەر لاوە دەنگێك دەهات. ژمارەیەك شادو بە کەیف بوون:

-هەر بژی (ئیبراهیم بەگ)! تێر گۆشت دەخۆین!

- کێ ئەم هەموو گۆشتە دەخوا؟!

- ئەوەی مایەوە دەیکەین بە قاورمە!

- بە باسترمەچی دەفرۆشین.

چەند کەسێکی تر ناڕەحەت بوون:

- ئەم (زەبووك زادە) سەگبابە بۆچی ئەو هەموو زێدە مەسرەفییە دەکا؟!

- ئەو گۆشتی قۆربانییە بۆچییە؟ بۆچی ئەوەندە ئیسراف دەکا؟

- کێ پارەی ئەو هەموو مەڕو گایە دەدا. شارەوانی مایەپووچ دەبێ!

- ئەوە سەرۆکی شارەوانیمان شێت بووە؟!

- بابە، جەنازەی شەهید بیانووە.. دەیەوێ ساڵێکی تر ببێ بە نوێنەر.گەورە گەورەکانی وڵاتی داوەت کردووە بۆ ئەوەی خۆی پێشان بدا.

- بۆچی مەسرەفی میوانان لە کیسەی ئێمە دەدا؟

- چارە چییە؟

- نازانم...تەنیا ئەوە دەزانم ئێمە ئەوە هیچ، ئەوەو ناتۆرەیشمان ناتوانن پارەی ئەو هەموو گاو مەڕو ماڵاتە بدەن.

- غەدیر (بەرهەڵستکار) قسەکەی بڕیو گوتی:

- هاوڕێینە، تازە کار لە کار ترازاوەو باس کردن سوودی نییە. دەبوایە ئەو کاتە ئەو قسانە بکەین کە ئەو بێناموسەمان بۆ سەرۆکی شارەوانی هەڵبژارد. ئێستا چ کەڵکی هەیە؟ ئەو سوارەیەو ئێمە پیادە. دوای چەند سەعاتێکی تر میوان دێن دەبێ بیرێك لە پێشوازی کردنیان بکەینەوە! کاتی ڕێو ڕەسمەکە خەریك بوو نزیك دەکەوتەوە...

هەر ترومبیلی دوا مۆدێل بوو یەك لە دوای یەك دەهات. شارۆچکەکەمان تا ئەو ڕۆژە شتی وای بە خۆیەوە نەدیبوو.

لەو کاتەدا ترومبێلێکی پڕ سەرباز هاتو مۆسیقای سەربازیی دەستی بە لێدانی ئاوازێکی بە جۆش کرد.

پارێزگار لەگەڵ چەند کارمەندێکی دەولەت، کە لە ئەنقەرە هاتبوون، بەشدارییان کرد. (زەبووك) چوو بە خێری هێنان. پاشان لە سەرەخۆ چەند قسەیەکی کرد: پاشان زانیمان سەرۆك وەزیران داوای بوردنی لە (زەبووك زادە) کردووە.!!

ڕێو ڕەسمەکە بە ئاوازێکی غەمگینی مۆسیقا دەستی پێ کرد...

میوانەکان بۆ حەوشەی مزگەوت چوون کە جەنازەی شەهید لەوێ داندرا بوو.

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) نوێژی مردووی لە سەر کردو ڕۆیشتین. ئاوازی ماتەمین لە پێش جەنازەکە لێ دەدرا. شەهیدمان بردە گۆڕستانو بە خاکمان سپارد... ئینجا گوتاردان دەستی پێ کرد. نوێنەری ئەنقەرە لە هەموو کەس باشتر قسەی کرد. هیچ لە قسەکانی نەگەیشتین بەڵام دەنگی ئەوەندە بە سۆز بوو، مرۆڤی دەگریاند.!

هەموو میوانەکان بە دەنگی بەرز لە پرمەی گریانیان دا.

(هەمزە جووت بەدزادە) گوتی:

- ئەگەر مانای قسەکانیمان بزانیایە نووری عەلا نوور بوو..

(ئەمین بازرگان) ئەوەندە گریا بوو، ژانە سکی گرت بوو. ئاخر بابە، مەگەر بنیادەم ئەوەندە فرمێسکەی هەیە؟! دوای هەموویان (مەلا بەدر)ی خۆمان چووە سەر کورسی بۆ ئەوەی دوعا بکا. بەڵام ئەویش ورووژا بوو لە باتی ئەوەی دوعا بکا، دەستی بە گوتاردان کرد...

- سەیرە!! ئێمە شتی وامان لە مەلای خۆمان رانەدەدیت. ئەوەندە بە چاکی قسەی دەکرد گوتاری ئەوانی تر لە چاو ئەوەی مەلا هیچ نەبوو. خەڵکەکە گریانێکیان هات ، هەر مەپرسە!! (نوورییە کوێر) لە پێش من وەستا بوو گوتی:

- هەر باشە من لە چاوێك زیاترم نییە. ئەگەر دوو چاوم هەبوایە یەك دڵۆپە ئاوم لە لەشدا نەدەما.

بەڵام مەلا دەمی گەرم ببوو، لامەزەبە وازی نەدەهێنا...

- ئاخر (مەلا بەدر) بەسسە ئیتر. خنکاین ئەوەندە بگرین.

بە چاو ئاماژەمان دەکرد. برۆمان هەڵدەتەکاند. تەنانەت یەکێ لە پشتەوە عەبای راکێشا. بەڵام نەخێر، فایدەی نەبوو!!

مەلا گەرم ببوو . دەست بەردار نەدەبوو. بە کورتی کە ئێمە تەواو بووین مەلایش رەوزەی تەواو کرد. چ ببینم باشە؟ لە دوو دەریای خوێن نقووم ببووین. ئەمە ئیتر چییە؟ هەر کەسە چەقۆیەکی بە دەستەوە گرتووە بە بیسمیللا کردن هەرچی گاو مەڕی دەکەوتە بەر دەست سەری دەبڕی. خەڵکەکە یەك لە دوای یەك سەڵەواتیان لێ دەدا.

منیش تا دەنگم تێدا بوو هێنامە گەروومو سەڵەواتی پیرۆزم لێدا. لە ناکاو هەستم کرد (جەلیلە شێت) چاوی لە قەپێلك دەرهاتووەو هاوار دەکا:

- هەر کەسێ شەرەفی هەیە چەقۆیەکم بداتێ.

- شێتە، چەقۆت بۆچییە؟

- دەمەوێ منیش لە خێری قوربانی بەشدار بم.

کاتێ ئیش‌و کار تەواو بوو، میوانەکان سواری ترومبێل بوون‌و بەرەو شار جوولان، سێ لۆری پڕ مرۆڤی چەکمە لاستیک لە تەک گۆڕستان ئیستاپیان گرت. مرۆڤەکان دابەزین‌و کەلەشی گاو مەڕەکانیان لە لۆرییەکان بار کرد. لە بەر خۆمەوە گوتم: ئەمە ئیتر چ کەلەکێکە!

چوومە لای یەکێ لە چەکمە لە پێکان‌و لێم پرسی:

- کاکە، ئەو هەموو گۆشتەی قوربانی بۆ کوێ دەبەن؟

- قوربانی چی؟ ئەوە تۆ شێت بووی!؟ ئەم مالاتەی دەیانبینی هی کوشتارگەی دەولەتن. ئێمەیش کەولکەرین.!!سەرۆکەکەمان فەرمانی دا کوشتاری بەیانیمان بێنین لێرە سەر ببڕین.

قوربانییەکانیان لە ناو لۆری کردو بردیان.

هەژارو دەستکورتی داماو لە گۆڕەپانەکە کەوتنە گەڕان بەلکو کەلەپاچەیێ، گۆشتێ، ئێسکێ بدۆزنەوە بەلام لەو خوێن‌و خوڕەی تێکەلێ خاک ببوو زیاتر هیچیان دەست نەکەوت‌و ئارەزووی یەک سک تێرخواردنی گۆشتیان بردە ناو گۆڕ.

چووینە لای (زەبووک زادە):

- (ئیبراهیم خان)، ئەمە چ یارییەک بوو کردت؟!

- گەلۆرینە، دەتانەویست پارەی قوربانی لە بووجەی شارەوانی بدەین؟! من چوومە لای سەرۆکی کوشتارگەو هەق‌و حیسابێکی کەمم داو کوشتاری بەیانی هێنایە ئێرە.

خەبەری کەوتنی فڕۆکەو دۆزینەوەی جەنازەی فڕۆکەوانی شەهید وەک تۆپ دەنگی دایەوە. ڕۆژنامەکان وێنەو باس‌و ناوی شارۆچکەکەمانیان بە پیتی گەورە لە سەر لاپەڕەی یەکەم نووسی‌و ناوی شارۆچکەکەمان لە هەموو شوێنێ کەوتە سەر زمانی خەلک.

ئەو رۆژە، بۆ بەیانی (زەبووك زادە) گوتی:

دەبێ پەیکەرێك بۆ فڕۆکەوانەکە دروست بکەین. پارەکەی، دەبێ خەڵکی شارۆچکە بیدەن.

وەرە ئەمە چا بکە! زیندوو خەون بە پارەوە دەبینن، لە کوێ پارە بۆ مردوو کۆ بکەنەوە. بەڵام چارە نەبوو.

دەستمان بە کۆکردنەوەی پارو بوو کرد. لە کاتی ئێشکردندا، بیستمان چەند کەسێك لە پایتەختەوە هاتوون‌و دەیانەوێ جەنارەی فڕۆکەوانی شەهید لە گۆڕ دەربێنن‌و بیپشکنن...

-بابە، پشکنینی چی. ئێسکێکی وشك‌و برینگ پێویست بە پشکنین ناکا.

فەرماندەی هەوایی گوتبووی: تا ئێستا هیچ فڕۆکەمان نەکەوتۆتە خوارەوەو ئێمە فڕۆکەوانی شەهیدمان نییە. ئەوە لە کوێ هاتووە؟! پێویستە ئێسکەکەی بپشکنین. بۆ ئەوەی دەربکەوێ ئەوە کێیەو مەسەلە چییە؟

پزیشکی یاسایی لە شار هاتبوو. بە ئامادەبوونی فەرماندەی جەندرمەو پشکێنەری دەولەت، گۆڕەکەیان هەڵدایەوەو ئێسکەکانی شەهیدیان دەرهێناو بردیانە شار.

لە لایەکەوە خراپ نەبوو. ئاخری ناسنامەی شەهید دەردەکەوێ‌و دەزانین رێ‌و رەسمی ناشتنی جەنازەمان بۆ کێ کردووە؟و خەریکین پەیکەری کێ دروست دەکەین؟

(برهان الدین)، کە سەرۆکی ناحەزانەو لە چالاکی ئێمەو لەو سەرکەوتنەی بە نسیبمان بووە لە حەسوودیان وەخت بوو بتەقێ، دەرفەتی وەرگرت‌و دەستی بە پڕوپاگاندەی دژی ئێمە کرد.

خوا رەحمی کرد (زەبووك زادە) سەرۆکمان بوو، ئەگەر نا، کابرا پاك ئابڕووی هەمووومانی دەبردو بە ناوی ساختەو فێڵ هەمووومانی بە گرتن دەدا.

(زەبووك زادە) خەبەری بۆ (برهان الدین) نارد:

- کارێکی وا مەکە نوێنەرایەتیت هەڵوەشێنینەوە نانت ببڕین. لە جێی خۆت دانیشەو بێ دەنگ بە. فرۆکەوانی شەهیدو دروست کردنی پەیکەرەکەی یەکێکە لە کارە شانازییەکانی ئێمە.

- (برهان الدین) لەو هەرەشەیە راچڵەکی. ئەو، (زەبووك زادە)ی باش دەناسی. دەیزانی بڕیار لە سەر هەر شتێ بدا، جێ بە جێی دەکا.

ئێمەیش چالاکیمان بۆ کۆ کردنەوەی پارەو دروست کردنی پەیکەری شەهید زیاتر کرد. (زەبووك زادە)، لەو دانیشتنەی بۆ ئەم ئیشە کردبوومان، زۆر باش قسەی کردو گوتی:

- هەر کەسە پێنج قروش، دە قروش بدا ئیشی پەیکەرەکە تەواو دەبێ. من خۆم بە دەوری خۆم هەزار قروش دەدەم.

- هەمووومان لە سەرسامییان دەممان بەش بووەوە. توخوا تۆ وەرە تەماشای حاتەمبەخشیی ئەو پیاوە بکە. بۆ خاتری ئێمەو بۆ بەرز کردنەوەی شەرەف و شانازی شارۆچکەکەمان ئامادەیە چاو لە پارەی خۆی بپۆشێ. خەڵکەکەیش دەماریان جووت بوو، هەر کەسە لە بەر ئەوانی دی پارەیەکی زۆرتری دا. (زەبووك زادە) لە کۆتایی گوتارەکەیدا گوتی:

- هاوشارییانی ئازیز، هیچ میللەتێك نابێ بە بێ شوێنەوار بێ. دەزانن شوێنەوار یانی چی؟ شوێنەوار یانی زیارەتگا. یانی شتی کۆن.. ئێستا تێگەیشتن؟ ئەگەر یەکێ لێتان بپرسێ کوا شوێنەواری شارۆچکەکەتان؟ چی وەڵام دەدەنەوە؟

شارو شارۆچکەکانی تر ئەوەندە زیارەتگایان لێیە، مرۆڤ ناتوانێ بە ناویاندا تێبپەڕێ. کە خەڵك بێنە ئێرەو ببینن ئێمە زیارەتگامان نییە، تفمان لە روو دەکەن. ئایا ئێوە ئەو شوورەییە قبووڵ دەکەن. ئێمە سەر بەرزین‌وشانازی پێوە دەکەین کە زیارەتگای ئێمە راستەقینەیەو رەمزی نییە. لە بیرتان چوو، ماوەیەك پێش ئێستا، بۆ هاتنە دی نیازو چاکبوونەوە لە بەڵاو نەخۆشی چەند قۆناغ لە

چیاو چۆل بە پێ دەرۆیشتن دەچوونە زیارەتی مەلای رەش؟ لەمەودوا پێویستتان بەو نارەحەتیو هاتو چوونە ناکا.

هەموو شتێ بۆ ولات پێویستە. دیموکراسیو قوتابخانەو نەخۆشخانە بە لایەك، دوعاو رەملو ئوستورلابیش بە لایەك! هەریەکە مشتەری جیایە!

گابرا ئەوەنـدو بـە چـاکیو عـالی قسـەی دەکـرد، مـرۆڤ هەناسـەدانی لـە بـیر دەچووەوە.

کاتێ کە ویستیتی لە سەر سەکۆ بێتە خوارێ، دووبارە گوتی:

- بۆ دروست کردنی ئەو پەیکەرە، من پێنج هەزار قروش دەدەم.

بە جۆرێ ئـەو قسـەیەی کـرد وەك ئـەوەی ئێستا ئەسکوناس لـە گیرفانی خـۆی دەربێنێو فرێـی بداتـە سـەر مێـز! بـەلام یـەك قروشیشی نـەدا... تـەنیا بـە چـاکی قسەی دەکرد.

دوای دوو سێ رۆژ، لە تەك گۆڕستان لە (نووری سەفار)و (جەلیلە شێت) راست هاتم، هـەردووکیان نائاسـایی بـوون. خـەریکی تەقـە بـوون بـە چـەکی بـەر پشـتێن. چوومە پێشو مەچەکم گرتن:

- ئەوە چۆنە یەکتان گرتووە؟ راستم پێ بلێن.. هەردووکیان راچلەکینو کەوتنە ( تتە پتە). زانیم شتێ هەیە. گوتم:

- یاللا، پێش کەون بزانم...

هەردووکم بردنە بارەگای پارت. (ئیسماعیلی بەنـدەی خـودا)و (هـەمزە جـووت بەدزادە)و خاوەن ئوتێـلو (ئـەمین بازرگـان) لـەوێ کـۆ ببوونـەوە. کـە فشارمان بـۆ (نووری سەفار) هێنا باسی رووداوەکە بکا، کەوتە پاڕانەوە:

- هـەقتان نـەبێ.. ئازادمـان بکـەن.. لێگـەڕێن بـە باشـی خزمـەتی خـەلکی ئێـرە بکەین..

- خزمەتی چی؟ خێرە؟!

- دەمانــەوێ (زەبــوك زادە)ی پــیس لــە نــاو ببــەین‌و شــەرەف‌و ئــابڕووی شارۆچکەکەمان بپارێزین..

(هـەمزە جـووت بـەدزادە) رازی بـوو... (ئیسماعیل بەنـدەی خـودا) هـانی دان، بەڵام (ئەمین بازرگان) رازی نەبوو:

- سکم پێتان دەسووتێ! هیچتان پێ ناکرێ‌و لە ناو زیندان دەرزێنەوە...

لە قسەو جوولانەوەی (ئەمین بازرگان) تێگەیشتین دەیەوێ سەرمان گەرم بکاو بە هەر جۆری بی بە هێواشی رووداوەکە بـە (زەبـووك زادە) بگەیـەنی. جەنابی (مورتەزا) گوتی:

- مـن ئـەو (جەلیلـە شـێت)ە دەناسـم ئەگـەر بڕیـار بـدا ئیشـێك بکـا لـە ژێـر چەرخیش بێ، ئەنجامی دەدا.

بڕیار بوو سێ کەس لە بەینی خۆمانەوە هەڵبژێرین بچنە لای (زەبـووك زادە)و هەرچی پارەی لە (نوورییە کوێر)و (جەلیلە شێت) وەرگرتـووە لێی وەر بگرنـەوە. (ئـەمین بازرگـان)و جـەنابی (هـەمزە)و مـن هەڵبـژاردراین. بـە (جەلیلـە شـێت)و (نوورییە کوێر)م گوت:

- ئێوە لێرە بن. لێرە نەجوولێنەوە تا ئێمە دەچین پارەکەتان وەردەگرینەوە.

(نووری) گوتی:

- (ئیحسان بەگ)، بەخوا ئەو بێناموسە ئێوەیش تەفرە دەداو شەڵوارتان لە پێ دەکاتەوە!!

هاوارم کرد:

-کورە، بێدەنگ بە! ئەمە چ جۆرە قسە کردنێکە!! (...)ی دەخوا. چۆن دەتـوانی شتی وا بکا؟

بەم تانەو تەشەرە (نـووری)م بـێ دەنـگ کـرد. بـەڵام نارەحـەتی‌و ناخۆشییەکی سەیر سەراپای داگرتم:

- ئەو نامەردە بەڵایەکیش بە سەر ئێمە نەهێنێ!!

که ویستمان به ڕێ بکەوین، (جووت بەدزادە) گوتی:

- کوڕینە، ئاگاداری گیرفانی خۆتان بن. دەستتان لە گیرفانتان دەرنەهێنن.

- لە ڕێگادا، دوو سێ جار مەشقمان لە سەر ئەو شتانە کرد کە دەبوایە بە (زەبووك زادە) بڵێین. دەبوایە پێی بڵێین:

- (زەبووك)، ئەو ئیشانە بۆ تۆ عەیبە. لە تۆ ناوەشێتەوە پاش ملە ئەو قسانەت لە سەر بکەن. خەڵك لە حەقی خۆی خۆش نابێ. تۆ ئێستا سەرۆکی ئێمەی. ئەگەر ئێمە نەبوویینایە (جەنیبە سیت)و (نوورییە کوێر) تیکە تیکەیان دەکردی. دەبێ پارەکەیان بدەیتەوە، دەبێ واز لەو فرتو فێڵانە بێنی. ئابڕووچوون بەسسە! هەڵبژاردنی ناوچەیی وا نزیك دەکەوێتەوە. ئەگەر رازییان نەکەی لە سەرۆکی شارەوانی لات دەدەینو فلانو فیسار...

کاتێ گەیشتینە بەردەم ماڵی (زەبووك زادە)، (ئەمین بازرگان) دەستی بە سکییەوە گرتو گوتی:

- وای!! پێویستم بە چوونە سەر ئاوە. دەبێ بچمە ئاودەست. ئێوە بڕۆنە ژوورەوە. من سەرێك لە مزگەوت دەدەمو دێم.

- ئێوەو خودا، تەماشای (ئەمین بازرگان) بکەن.. پەندێکی پێشینان هەیە دەڵێ: (تاژی لە کاتی ڕاو (...)ی دێ.) دەیەوێ خۆی لە شەڕەکە بباتە دەرێو بەرۆکی ئێمە بداتە دەست ئەو بۆرەپیاوە قۆڵبڕە.

توند بازووم گرت:

- نەخێر. نابێ بچی. ئاودەست لە ماڵی (زەبووك زادە) هەیە.

- ئازارم مەدەن. باش نییە پیاو کە چووە ماڵی خەڵك بچێتە ئاودەست.

(هەمزە جووت بەدزادە) تووڕە بوو... پاڵمان بە (ئەمین بازرگان)ەوە ناو فرێمان دایە دالانی ماڵی (زەبووك زادە).

دەست لە ناو گیرفان، چووینە ماڵی (زەبووك زادە).:

- سەلامو عەلەیك (ئیبراهیم بەگ).

کابرا هیچ لە جێی خۆی هەڵنەستا. لە سەر قەنەفە دانیشتبوو دەستی لە باخەڵی نابووو لە دونیای بیر کردنەوەدا نقووم ببوو. کە دانیشتین‌و هەناسەیەکمان دا، هێدی هێدی سەری بڵند کردو چاوی بڕییە لای ئێمە! تازە بە باشی دەم‌و چاومان بینی. چاوەکانی وەکوو دوو کاسە خوێن وا بوون. وەکو هەوری بەهاری فرمێسکی لە چاوان دەڕشت. چ بووە؟ دایکی مردووە؟ مانگای بەری هاویشتووە؟ چ بەڵایەکی بە سەر هاتووە، ئاوها دەگری؟!

دوای ئەحیی بە دەنگێکی لەرزان‌و نووساو گوتی:

- بە خێر هاتن مامەکانم.. - خودا خراپتان بۆ نەهێنێ (ئیبراهیم بەگ)، چ بووە؟

- دەتانەوێ چ بێ؟ هەموو کەس دەزانێ مردن هەقە، بەڵام مرۆڤ دڵی بەروەست نایێ.

- خۆتان سەلامەت بن. کێ وەفاتی کردووە؟

(زەبووك زادە) بە گریانێکی حەسرەتبارەوە وەڵامی دایەوە:

-وڵات بە شەهیدانەوە دەمێنێ . سەربە خۆیی ئێمەو شەرەفی ئێمە بە خێرا ڕۆحی ئەو کەسانەیە کە لە ڕێگای نیشتمان شەهید بووین.

ئەوەندە بە غەمباری قسەی دەکرد، منیش گریانم هات. خەفەت گەرووی گرتبووم، وەخت بوو دڵم شەق ببا. ئەگەر نەختێ بگریابام، حاڵم باشتر دەبوو. بەڵام بۆ پیاوێکی وەکوو من عەیب بوو.

بە هێدی بە (ئیحسان تەقاویت)م گوت:

- بمگرە، خەریکە وەزعم تێك دەچێ.

(زەبووك زادە) دەنگی بڵندتر کرد:

- هەموو بستێکی خاکەکەمان بە خوێنی شەهیدان ئاو دراوە.

ئەو دەسماڵەی فرمێسکی پێ دەسڕییەوە ئەوەندە تەڕ ببوو، ئەگەر بتگوشیبایە یەك دونیا ئاوی لێ دەهات. ئاخیری ئەوەندەی قسەی کردو گریا تا ئێمەیش

هەمووومان گریاین. لە ژێرەوە سەرنجێکم لە جەنابی (هەمزە) دا. بە دامەنی چاکەتەکەی فرمێسکی دەسڕییەوە. (ئەمین بازرگان)ی بێچارە ئەوەندەی فرمێسك رشتبوو، هەموو دامەنی تەڕ ببوو.

لە دڵی خۆمدا گوتم:

-کوڕە، ئاگاداری خۆت بە! ئەمەیش یەکێکە لە کەلەکەکانی (زەبووك زادە). دەیەوێ تەفرەمان بدا. بەڵام کە گوێمان لە (بستێکی خاکی نیشتمان)و (خوێنی شەهیدان) دەبوو حوماں پێ رانەدەگیرا. (هەمرە جووب بەدزادە) لە بن گوێم گوتی:

- کابرا دیسان تەفرەی داین، وا چاکە خۆمان رێك بخەین و مەبەستی خۆمانی پێ بڵێین.

(زەبووك زادە) تێگەیشتبوو، دەستی خۆی پێش خست:

- تف لە ئێمەی میللەت!! شەهیدانی نیشتمان گیانی خۆیان دەکەنە قوربانی، کەچی ئێمە کەمتەرخەمی لە دروست کردنی پەیکەریان دەکەین. ئاخر ئەو پارەیە چ نرخێکی هەیە؟

(ئەمین بازرگان) یەکسەر دەستی بردە گیرفانی و پەنجا لیرەی فڕێ دایە ئەو گۆڕە. (جووت بەدزادە)یش سەد لیرەی لە سەر دانا. من تەنیا بیست لیرەم پێ بوو. بیست لیرەکەم داو گوتم:

- پارەم پێ نییە. پاشان ئەوەی تر دەدەم.

بەم جۆرە، رووممان نەهات هیچ قسە بکەین. کابرا خەریك بوو لە داخی نیشتمان دەمرد! چۆن بتوانین باسی پارە بکەین؟! لە کاتێکا کە فرمێسکی وەکوو کلکی ئەسپ لە چاو دەڕشت، خوا حافیزیمان کردو چووینە بارەگای پارت.

جەنابی (مورتەزا) پرسی:

- باشە، چ بوو؟

(جـووت بـەدزادە)، کـە هێشـتا چـاوی بـە فرمێسـك بـوو، جاروبـار لـووتی بڵنـد دەکرد، وەڵامی دایەوە:

- سوپاس بۆ خودا پەیکەرەکەمان پێك هێنا.!!

- ماڵ خراپ پەیکەری چی؟ ئێوە بە چ ئیش چووبوون؟!

تـازە زانیمـان ئێمـە بـە چ ئیشـێك چـووبووینە ئـەوێو مەسـەلەکە چـۆن بـە پێچەوانە شکایەوە.

لەو کاتەدا، جەنابی میرزای فەرمانـدار هاتە ژوورەوەو گوتی:

- هاوڕێینە، دەزانن چ رووی داوە؟

- چ رووی داوە؟

ئێسکی فڕۆکەوانی شەهیدیان پشکنیوە دەرکەوتووە ئاسکەلتی بنیادەم نییە.

- ئەدی ئەسکەلتی چییە؟

پزشکی یاسایی بە نووسـین شایەدی داوە ئـەم ئاسکەلتە هـی (ماسـی کۆسـە)یە. کـەوتنی فڕۆکـەو ئـەو شـتانەیش درۆ بـووە. گوایـە فڕۆکەکـە لـە ئاسمـان یـاری پاڵەوانبازی کردووەو تەقڵەی لێداوە، خەڵك وایانزانیوە بەربۆتەوە.

- بابە، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟

ئەوەیە راستی.

هەموو ئاوڕمان لە لای (مەلا بەدری ئاقڵمەند) دایەوە:

- مـەلای هـیچو پـووچ، تـف لـە ریشـت!! ئێمـە نوێـژمان لـە سەرماسـی کۆسـەی مردوو کردووە!!

(مەلا بەدر) وەڵامی دایەوە:

- من چوزانم. (ئیبراهیم بەگ) ئـەم قسانەی فێـر کـردم. منـیش بـە دەسـتووری ئەوم کرد.

لەگەڵ هەموو ئەوەدا، لەگەڵ ئەوەی هەموو زانیمان هیچ شەهید لە گۆڕێ نییە، ئارامگامــان بـۆ لــە ســەر تەپــە دروســت کــردو پەیکەریشــمان بــۆ کــرد. بــوو بــە زیارەتگایەکی باش بۆ خەڵك!!

ژنی نەزۆك‌و پیاوی نێرەمووك‌و شێتی زنجیر لە دەست‌و پێ‌و کەسانی قــەرزارو پێویست دەچنە سەری‌و داوای چارەسەر دەکەن. پەندێکی بە ناوبـانگ هەیـە دەڵێ: (ئەم جۆرە مانگایە دەبێ ئەو جۆرە گوێرەکەیەی هەبێ!).

من (زەبووك زادە) بە کەمتەرخەم نازانم. تا ئێمەی میللەت ئەوەنــدە کــەوودەن‌و ساویلکەو خۆش بـاوەڕ بـین، هــەر بەڵایــەکی هــی وەکــوو (زەبــووك زادە) بەسـەرمان بێنن، هێشتا هەر کەمە. بەڵام تۆ بۆ خۆت ئاگادار بە، تەفرەت نەدا... تــۆ غــەریبی، میوانی ئێمەی.. خوا قبووڵ ناکا بەدبەخت ببی

# (15)

## (زەبووك چۆن ناحەزەكەی بە زیندووی چاوان خوارد؟..)

(ئەمین بازرگان) باس دەكا:

-جەنابی ئازیز، هەموو ئیشەكانی ئەو پیاوە نائاساییین. بریا نەمانكردایە بە سەرۆكی شارەوانی!! بەڵا تازە كار لە كار ترازاوەو پەشیمانی سوودی نییە.

هەڵبژاردن نزیك كەوتبووەوە... ناحەزەكان چالاكی گەرمو گوڕیان دەنواند. بەڵام (زەبووك زادە)ی ئێمە هیچ خەبەری نەبوو. من هەموو سەرمایەكەمم بە قەرز دایە لادێییەكان. بۆ ئەوەی لانی كەم لە كاتی هەڵبژاردندا دەنگ بە پارتی ئێمە بدەن. بەڵام چما (برهان الدین)ی سەگباب لێ دەگەڕا.

نازانم چ پڕوپاگاندەیەكی دەكردو چ قسەی لەگەڵ لادێییەكان دەكرد. نانی ئێمەیان دەخواردو دوعایا بۆ ئەوان دەكرد.

جاران لادێیەكان دەیانگوت:

-مردن هەیە بەڵام گەڕانەوە لە پارتی نییە!! خوا یەكەو پارتیش یەكە!

بەلام لەو ماوەیەدا، بەردی لە دوو داوێن. ئەم قسانەیش سووچی (برهان الدین)ی نامەرد بوو. هەر ڕۆژەی هە ڵبژاردن نزیك دەكەوتەوە، جمو جوولی میللەت زیاتر دەبوو. كۆبوونەوەیەكمان لە پارت كرد بۆ ئەوەی چارەیەك بدۆزینەوە. هەموو لە كاتی خۆی هاتن تەنیا (زەبووك زادە) دیار نەبوو

خاوەن ئوتێل گوتی:

- کورینە، مەترسن. (زەبووك زادە) ئەو نوێنەرە لووتبەرزە بە زینـدووی چاوان قووت دەدا..

(مەلا بەدر) قسەکەی بۆ سەلماند. هەمووومان ئەوەمان قبوولّ بوو بەلاّم ئەی گوا (زەبووك زادە)ی نامەرد؟ ویستمان یـەکێ بنێرینـە دووی کە بـە هێنکە هێنـك بـە ژووریّ کەوت...

کە لە سەر کورسی دانیشت، (هەمزە جووت بەدزادە) گوتی:

- (ئیـبراهیم بـەگ)، خەریکـە هەڵبـژاردن دادێ ... چ بکـەین؟ ئـەم (بورهـان)ە سەگبابە، خراپ پیاوی لە دەوری خۆی کۆ کردوونەتەوە. کەس دەنگ بە ئێمە نـادا. شکست دێنین و لای دۆستو دوژمن ئابرووومان دەچیّ.

(زەبووك زادە) وەکوو یەکیّ گویّ بداتە هەقایەتێکی خـەیالّی، زۆر بـە دڵنیـاییو خوێن ساردی بزەیەکی هاتیّو گوتی:

- ئێوە هەقتان بە سەر ئەو شتانەوە نـەبیّ!! ئەمـە بـۆ مـن لێگەڕێن!!لـە خـوێنم ساردیو توورەبوونی (زەبووك زادە) توورە بووین:

بابە، ئەو پیاوە مرۆییەکی خەیاڵییە. خەریکە شەرەفو ئابرووومان دەچیّ، ئـەو هەر بە خەیاڵیشیدا نایێ.

- (ئیحسان تەقاویت) بە توورەیی گوتی:

- ؟ ئـاخر چ؟ چ بۆتـۆ لێگـەڕێین؟ دەتـۆ نەخشـەیەك دانـیّ.. بیرێکـی لیّ بکـەوە. پێویستە لە سەرەتاوە ڕێی لیّ بگرین.

- باوکە گیان، ئـەو پیـاوە هـی ئـەوە نییـە نەخشـەی بۆ بکێشین. بـە پشـتیوانی خودا، وەکوو خوێی کوتراو وردو خاشی دەکەمو بە بای دەکەم.

دڵنیا بووین (زەبووك زادە) وا دەکا، بەلاّم بە لامانەوە گـرنگ بـوو بـزانین بـە چ ڕێگایەكو بە چ جۆرێك دەیەویّ ئەو پیاوە لـە مەیـدان وەدەر بنـیّ کـە ئـەو هـەموو لایەنگرە سەر ڕەقەی پەیدا کـردووە؟ دەترسـاین خـوا نـەکا شکست بێنـیّو فەشـەل بینەوە.

(زەبووك زادە) نەختێ وەستا، ئینجا بزەیەكی هاتێو گوتی:

- ئێستا واز لەو قسانە بێنن. من بڕیارم داوە كارێكی باش بكەم. دەمەوێ بزانم ئاخۆ ئێوە لەگەڵمان؟

ئێمە هیچێكمان حەوسەلەی گوێ دانە پێشنیارمان نەبووو نەماندەویست لە هەڵبژ1اردن بەولاوە دەست بۆ هیچ كارێكی تر ببەین. (زەبووك) چاوەڕێی ئێمەی نەكرد، بەردەوام بوو:

-دەمەوێ مزگەوتێك لەم شاروچكەیە دروست بكەم وێنەی هەتا لە شاریش نەبێ. لە باتی دوو منارە چوار منارەی بۆ دەكەم. هەر منارەی سێ تەبەقە. هەشت گومبەتی بۆ دەكەم. هەموو گومبەتەكان بە ئاوی زێڕ زیڕكفت دەكەم. ناوەوەی دەكەمە مەرمەڕی سپی. دەرگەكانی لە سەدەف و میحرابی لە مەڕ مەڕی رەش دەكەم. بە كورتی دەبێ مزگەوتێكی وا دروست بكەم لە سەرانسەری دونیادا بێنە تەماشای. رازین. ئازادی (ئیبراهیم بەگ). كێ هەیە لەگەڵ ئەم جۆرە مزگەوتەدا نەبێ.ئەمە چ پرسیارێكە!!

- پێویستە رێكخراوێك دروست بكەین بە ناوی ( رێكخراوی دروستكردنی مزگەوت).

لە داخان پێچم دەخواردەوە... ئاخر بابە لەو كاتەی هەڵبژاردنداییەم هەموو پڕ ئیشییە. دروست كردنی مزگەوت چییە؟

بەڵام (مەلا بەدر) بە پێچەوانەی من، بە بیستنی ئەم خەبەرە زۆر خۆشحاڵ بوو. پرسی:

- ببوورە. كێ پارەی ئەم مزگەوتە دەدا؟

- بیرم لەوەیش كردۆتەوە. دەبێ بۆ ئەم ئیشە كۆبوونەوەیەك بكەین.بێ گومان كۆبوونەوەكە دەبێ لە دەرەوەی پارت بێ. كاری دین جیایە لە سیاسەت. ئەگەر ئێمە بمانەوێ بە تەنیا ئەو ئیشە بكەین، ناحەزان تووڕە دەبن و دەڵێن:

- ئێمەتان بە پیاو حیساب نەكردووە.

لەو رۆژە، کە هەڵبژاردن نزیك بۆتەوە، نابێ بیانۆ بە دەست ناحەزان بدەین. هەموو خەڵکی شارۆچکە داوەت بکەن بۆ کۆبوونەکە. هەمووومان بە مەزەندە وای بۆچووین (زەبووك زادە) دەیەوێ، بە بیانووی دروست کردنی مزگەوت، لەگەڵ ناحەزان ئاشت بێتەوە.بە هەر حاڵ بیرێکی باش بوو. بڕیارمان دا کۆبوونەوەکە لە یانەی مامۆستایان بکەین.

لە شارۆچکە رامانگەیاندو خەبەرمان بۆ دێهاتی دەورو بەر نارد. رۆژی کۆبوونەوە هەموو خەڵکی شارو کێخوای گوندەکان لە یانەی مامۆستایان کۆبوونەوە. ئەوەندە خەڵك هاتبوو، ترساین یانەی مامۆستایان بڕووخێ. ئەوانەی لە ناو سالۆن جێگایان نەبووەوە، لە حەوشە بە پێوە راوەستان. خوا کردی هەوای خۆش بوو.

بڵندگۆیان لە بازاڕو لە گۆڕەپان چەقاند بۆ ئەوەی قسەو گوتارەکان بە گوێی کاسبو پیشەوەرانیش بگا. تا ئێستا لە شارۆچکەکەمان کۆبوونەوەی وا نەدیترا بوو.

(زەبووك زادە) پێشتر بە هەمووومانی گوتبوو: (بەخێرهاتنی ناحەزانی پارت بکەن جێگای باشیان بدەنێ.)

ئێمەیش وامان کرد. ناحەزانمان لە لای سەرەوەی سالۆنەکە دانا. کورسی (برهان الدین)مان لە تەنیشت جەنابی فەرماندار دانا. یەك لە دوای یەك جگەرەو قاوەو چامان پێشکەش ناحەزان کرد.

(ئیحسان تەقاویت) لە تەنیشت من دانیشتبوو. لە بن گوێم گوتی:

- دیار نییە داخۆ ئەو (زەبووك)ە ناجسنە دیسان چ نەخشەیەکی کێشاوە!

ئانیشکێکم لە قەپرغەی دا.

- کورە، ئەوەندە بەدگومان مەبە. (زەبووك) دەتوانێ چ نەخشەیەك لە کاری ئایینی بکێشێ. لەبەر ئەوەی ئێمە خۆمان خراپین، گومان لە هەموو کەس دەکەین. کابرا خەریکە شەوو رۆژ بۆ خاتری ئێمە رۆحی دەردێ.

بەرنامە دەستی پێ کرد. جەنابی (زەبووك زادە) چووە سەر سەكۆ. میكرۆفۆنی ڕاكێشایە پێش خۆیو زۆر بە ئارامیو بە لێكدانەوە دەستی بە قسە كرد:

- برا ئازیزەكان، ئێمە هەموومان كوڕی ئەم خاكو ئاوەین. هەستی نیشتمان پەروەریو وڵات پارێزی لە دڵو ڕۆحمان شەپۆڵ دەدا. جیاوازیمان لە نێودا نییە. ئێمە تەنیا لە سایەی یەكگرتنو ڕێك كەوتن توانین وڵاتو زێدمان بپارێزین. بە تایبەتی لە بواری مانۆكیو ئایینی دەبوایە یەكگرتنمان توندو پۆڵتر بێ. كاری دین لە كاری دونیا جیایە. سیاسەت شتێكی ترە. ئەوە بە جێی خۆی. نیشمان بەوە نییە.

ئێمە ئەمڕۆ باوەشمان بۆ بەرامبەركانمان كردۆتەوە. دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ كردوونو داوای یارمەتیتان لێ دەكەین. بۆ ئەوەی لە بەجێ هێنانی كارێكی گەورەی كۆمەڵایەتی یارمەتیمان بدەن. ئێمە نیازمان وایە ڕێكخراوێك دروست بكەین بە ناوی (ڕێكخراوی دروست كردنی مزگەوت). پێویستە بەڕێوەبەرایەتی ئەو ڕێكخراوە بە چەند كەسێكی ئاقڵو بە ئەزموونو كار ڕاست بسپێرریێو پێویستە سەرپەرشتكارەكەی هەموو خەسیەتی باشی تێدا بێ. سەد هەزار جار سوپاس بۆ خودا هی وامان لە ناودا هەیە. ئەو كەسە جەنابی (برهان الدین)ە كە بە ڕاستی پیاوێكی بە دینو كارزانو ئاقڵو سەر ڕاستە.

من لە باتی هەموو دانیشتوانەوە، داوا لە جەنابی (برهان الدین)ی برای هێژامان دەكەم ئەو ئەركە قبوولّ بفەرموێ. سەرپەرشتی (ڕێكخراوی دروست كردنی مزگەوت) لە ئەستۆ بگرێ. ئەویش بێ شك قبوولّی دەكا. گومانی تێدا نییە هەموو دانیشتوانیش بەم دەست نیشان كردنە ڕازین.

سالۆن لە بەر چەپڵەڕێزانی دانیشتوان هەژا.

لە بازارو گۆڕەپانی شارۆچكە ئەوەندە نەمابوو شارۆچكەكەمان لەبەر چەپڵەو سەڵەوات كاول ببێ.

جەنابی (عیرفان)، کە پیرترین پیاوی شارۆچکەیە لە کەیفخۆشییان دەگریا. دلۆپە فرمێسکی لە ریشی سپی دەچۆڕایەوە. (مەلا بەدر) لە جێی خۆی هەستاو گوتی:

- سەد هەزار جار سوپاس بۆ خودا کە نەمردین. ماینو ئەو رۆژانەمان دی کە تەباو ناحەز یەکیان گرت.

برای دینی هەموو وەکوو یەك گیان وان لە دوو جەستەدا لەگەڵ یەك تەباو تفاقنو دەستی هاوکاری بۆ یەك درێژ دەکەن.

دەنگی چەپڵەو سەلەوات گەیشتە تەشقی ئاسمان. خەڵك دەوری نیو سەعات لە سەر یەك چەپڵەیان لێدا.

جەنابی (برهان) لە جێی خۆی هەستا. بە گرانو سەنگینی چووە لای مایکرۆفۆن. رووی گرژ بوو. سەرنجێکی غەمگینی لە خەڵکەکە داو دەستی بە قسە کرد:

- هاوشارییانی بەرێز، زۆر سوپاسی ئەو خۆشەویستییە دڵسۆزانەتان دەکەم کە بەرامبەر بە من نیشانتان دا، هەر بژین! بەڵام من لەگەڵ ئەم پێشنیارەدا نیم. ئێمە زۆر شتمان کەمە کە دروستیان لە مزگەوت باشترە.

کە (برهان الدین) ئەم قسەیەی لە دەم هاتە دەرەوە، سالۆن پڕ بوو لە وشەی ناڕەزاییو سووکایەتی:

یەکێ هاواری کرد:

- بێدەنگ بە ، قورمساغ!

یەکێکی تر گوتی:

- برۆ گوم بە، کافر!

سێیەم:

- بیبڕەوە، بێ شەرەف!

(برهان الدین) هەوڵی دا بە ئاماژەی دەستو سەر دانیشتوان بێ دەنگ بکاو بەڵگەی خۆی پێشکەش بکا. گوتی:

- روخسەت بفەرموون... عەرزتان بکەم... بۆچی... دروست کردنی مزگەوت..

بەڵام خەڵکە تووڕەکە مۆڵەتیان نەدا قسەکەی بکا:

- پێویست ناکا قسە بکەی!- برۆ بزر بە، گەلۆر!

- لە سەر ئەو سەکۆیە بیهێننە خوارێ (...) ی بێناموس.

(زەبوت رادە) لە جێی خۆی هەستا. چووە تەك (برهان الدین). میکرۆفۆنەکەی وەرگرتو دەستی بە قسە کرد:

- برا بەڕێزەکان، هاوشارییانی ئازیز، ئێمە رێزی رای گشتی دەگرین. لەوانەیە برادەری ئازیزمان، جەنابی (برهان الدین) قسەی تری هەبێ. تکا لە جەنابتان دەکەم روخسەت بدەن ئەویش قسەی خۆی بکاو هۆی جیاوازیی رای خۆی بەرامبەر دروست کردنی مزگەوت، روونتر بکاتەوە.

دووبارە دەنگی قرەقرو ناڕەزایی لە هەموو لایەکەوە بەرز بووەوە... (برهان الدین) دووبارە لە قسە کردن بەردەوام بوو.

- هاوشارییانی ئازیز، ئەگەر حەز ناکەن قسە بکەم، بێدەنگ دەبم.

- دە قسەکەت بکە، نێرەکەر!

- قسە بکە بزانین چ غەلەتێ دەکەی!

(برهان الدین) لە کاتێکا کە هەوڵی دەدا خوێن سارد بێو جلەوی خۆی بگرێ. بەردەوام بوو:

- ئەی گەورەپیاوانی شارۆچکە، ئێمە هەر بەڵایەکمان بە سەر دێ، لە نەزانیو تێنەگەیشتنی خۆمانەوەیە. ئێمە زۆر زەرەرمان لە نەزانیی تووش بووە. بێ گومان لە ئایندەیش زیانێکی زۆرمان تووش دەبێ. ئێوە دەڵێن مزگەوت دروست بکەین، زۆر باشە! من لەگەڵتانم.. بە چاوان دروستی دەکەین... بەڵام ئایا شارۆچکەکەمان مزگەوتی تێدا نییە؟! ئایا شەوو رۆژ ئەوەند خەڵك دێنە نوێژ کە جێگایان

نەبێتەوە!؟ سوپاس بۆ خودا مزگەوتێکی باشمان هەیە لە باوکو باپیران بۆمان بۆ ماودتەوە. دەڵێن ئەو مزگەوتە خراپ بووەو خەریکە دەڕووخێ، زۆر باشە نووژەنی دەکەینەوە. بە بڕوای من دروست کردنی مزگەوتی نوێ راست نییە. ئەو پارەی دەتانەوێ لەوە سەرفی بکەن، لە دروست کردنی قوتابخانەیەکی سەرف بکەن.

دووبارە دەنگی قرە قرِی دانیشتوان بەرز بووەوە. (برهان الدین) بە ئاماژەی دەست خەڵکەکەی بێدەنگ کردو بەردەوام بوو:

- روحسەت بدەن. شارۆچکەکەمان نە یەك قوتابخانەی سەرەتایی زیاتری تێدا نییە. ئەویش تەواو نییە. بەشی منداڵەکانمان ناکا. هەر پۆلەی شەست، حەفتا منداڵی تێدایە. هیچ لە قسەی مامۆستا ناگەن. منداڵ ناچارن زستان بە-بەفرو کرێوە لەم سەری شارۆچکەوە بچنە ئەو سەری. ئەمە هەم وەختی لە منداڵان دەوێ، هەم مەترسیشی تێدایە. لە بیرتان کرد، پار چۆن گورگ کوڕەکەی نەنە (گوڵبەدەن)ی دڕاندو خواردی؟ نەختێ بیر لە منداڵانی خۆتان بکەنەوە. لە باتی مزگەوت، قوتابخانەیەك لەو سەری شارۆچکە دروست بکەن. ئەگەر پارەکەیش دەری نەهێنا، داوایەك بۆ وەزارەتی پەروەردە دەنووسین‌و یارمەتی وەردەگرین. (زەبووك زادە) هەستی کرد قسەکانی (برهان الدین) کار لە دانیشتوان دەکاو خەڵکەکە وردە وردە رقو نارەحەتییان نامێنێ، لە جێی خۆی هەستاو گوتی

- پێویستمان هەم بە مزگەوتەو هەم بە قوتابخانە!!

(برهان الدین) بە توندی‌و سەنگینی وەڵامی دایەوە:

-یەکەم جار قوتابخانە پێویستە.

(زەبووك زادە)یش دەنگی بڵندتر کرد:

ئێمە ناحەزانمان داوەت نەکردووە بۆ ئەوەی کارەکانمان بشکێنن. دڵنیایم هیچ یەکێ لە براکانی ئێمە وەکوو جەنابی (برهان الدین) بیر ناکاتەوە. یەکسەر هەموو ئەوانەی لە بارەگای پارت ئامادە بوون بە رازی‌و نارازییەوە، هاواریان کرد:

- بەڵێ، ئێمە یەکەم جار مزگەوتمان دەوێ.

(برهان الدین) كە دیتی هاوڕێیانی پارتی خۆیشی بە پێچەوانەی راو بۆچوونی ئەو دروشمیان دادا، خوێنی هاتە جۆشو گوتی:

- بۆچی خۆمان هەڵبخەڵتێنین؟

(مەلا بەدری ئاقڵمەند) لە جێی خۆی دەرپەڕیو هاواری كرد:

-ئێوە دەڵێن ناخۆشە منداڵ لە دوورەوە بێنە قوتابخانە، بیر لە پیرەمێردەكان ناكەنەوە، بە پشتی كۆماوو بە كوتە كوتی دار عەسا چۆن بێنە مزگەوت؟!

(زەبوك زادە) كە دەرفەتەكەی بە چاك زانی، چووە پشت میكروفۆنو خێرا خێرا دەستی بە قسە كرد:

- هاوڵاتییانو برایانی ئازیز، حەیف ناتوانین لەم دانیشتە بچووكەدا لە قسەی یەكتر بگەین!!

بە راستی (زەبووك زادە) بۆ سەرۆكایەتی وەزیران باشە!

هاوڵاتییەك وای گوتو دانیشتوان خوێنیان هاتە جۆش. رێك وەكوو سەرۆك وەزیران قسەی دەكرد. بە گەرمو گوڕیو بە توندو بە فەرماندانەوە گوتی:

-وەكوو دیارە جەنابی (برهان الدین) قوتابخانەی كردووە بە بیانوو دەیەوێ رێ لە دروست كردنی مزگەوت بگرێ... وەك ئەوەی تەنیا ئاشنای وشەی قوتابخانە بێ.

كاتی ئەم قسەیەی كرد، دەستی بۆ لای (برهان الدین) درێژ كرد. وامان زانی دەیەوێ زللەیەك لە (برهان الدین) بدا. هاواری كرد:

- (برهان الدین)، گەڕەكی موسلمانان جێگای فرۆشتنی گۆشت بەراز نییە!! ئێمە زۆر باش لە مەبەستی ناحەزان دەگەین. بڕۆ مەمنوونی خوای بە خەڵكی ئەم ناوچەیەی، ئەگەرنا، لێ نەدەگەڕاین یەك دەقیقە لە شارۆچكەكەمان بمێنیتەوە. ئێمە دەزانین ئەو بیرو باوەڕە پیسانە لە مەرامی كۆمۆنیستییەوە هاتوون. لەمەودا ئیشمان بە هی وەكوو تۆ نییە. ئێمە بە پشتو پەنای خوداو بە یارمەتی خەڵكی موسلمان مزگەوتەكە دروست دەكەینو هیچ هێزێك ناتوانێ رێمان لێ بگرێ.

دەنگی چەپڵەرێزان لە سالۆنو لە بازاڕو لە گۆڕەپانی شارۆچکە گەیشتە ئاسمانو خەڵك هاواریان كرد:

- بژی (زەبووك زادە)!

(برهان الدین)، كە دیتی كار شلۆقە، بە هەموو هێزی خۆیەوە هاواری كرد:

- (زەبووك زادە)، تۆ كە ئەوەندە باسی مزگەوت دەكەی، ئایا لە عومری خۆت پێت بە مزگەوت كەوتووە؟

(برهان الدین) راستی دەكرد بەڵام لە بەر غەڵبە غەڵبو چەپڵەرێزانی خەڵكەكە، دەنگی بە كەس نەدەگەیشت.

خەڵكە وایانزانی (برهان الدین) دیسان دروشمی پێچەوانە لێ دەدا، لەم لاو لەو لا دەستیان بە دەربڕینی ناڕەزایی كرد:

- ئەو بێ دینی بێدەنگ كەن!!

- ئەو كافرە لە سالۆن فڕێ دەنە دەرەوە!

تەنانەت لایەنگرانی پارتەكەی خۆیشی دروشمی توندیان لە دژ لێ دەدا:

- بەسسی كە، ئابڕووت بردین!

چەند كەسێك پەلاماریان دا. ئەگەر (زەبووك زادە) رێی لێ نەگرتبان (برهان الدین)یان پارچە پارچە دەكرد.

(برهان الدین) زۆر بە كەساسیو زەلیلی لە سالۆنەكە چووە دەرێو بە زەحمەت بە ناو جوێنو قسەی ناشیرینی ئەو خەڵكەدا تێپەڕی كە لە گۆڕەپانی شارۆچكە كۆببوونەوەو گەیشتەوە ماڵێ.

ئێمە لە نەخشەی (زەبووك زادە) گەیشتینو زانیمان مەبەستی لە پێك هێنانی دانیشتنەكەو دروست كردنی مزگەوت چی بوو؟!

دوای رۆیشتنی (برهان الدین)، زەبووك وادە (رێكخراوی دروست كردنی مزگەوت)ی پێك هێناو بە سووربوونەوە سێ كەسی لە ناحەزەكان ناچار كرد سەرپەرشتی رێكخراوەكە قبووڵ بكەن.

که ئیش‌و کار تەواو بووو له یانه هاتینه دەرەوه، (زەبووك زاده) گوتی:

- کورینه، بینیتان شکستدانی (برهان الدین) چەند ئاسان بوو؟ ئێستا بڕۆن خاترجەم بن له هەڵبژاردندا ناحەزمان نییه.. بردنەوەمان مسۆگەره..

راستی دەکرد. (برهان الدین) دوای ئەو شکستە شوورەییه، نەیتوانی له شارۆچکەکەمان بمێنێتەوه. ناچار بوو بۆ ماوەیەك بچێته ئەنقەره.

بەڵێ، جەناب، ئەو (زەبووك زاده)ی ئێمه شەیتانێکی سەیره!! رۆستەمی زالیش ناتوانێ بەرامبەری بوەستێ، سەر له بەری یاسای نامەردی‌و بێ شەرەفی له بەر کردووەو له بێ شەرەفی‌و سەگبابی‌و قۆڵبڕی، له هەموو دونیادا تاکی نییه. وریا بن ریشتان نەکەوێته بەر دەستی.

# (16)

## (دەست ماچکەر زۆرن!)

جەنابی (مەرتەزا) خوا سەلامەتی کا، بەم جۆرە باس دەکا:

- کە هەڵبژاردن نزیك کەوتەوە، مەسەلەی دەست نیشان کردنی پاڵێوراو هاتە ئاراوە. دەبوایە پاڵێوراوی خۆمان دەست نیشان بکەین. لە ئەنقەرە فەرمانیان بە پارێزگا کردبوو، هەر کەس توانای نوێنەرایەتی هەیە دەتوانێ خۆی بپاڵێوێ.

هەموومان لە بینای پارت کۆبووینەوە.. (هەمزە جووت بەدزادە) گوتی:

- هاوڕێیان، دەتانەوێ بە راستیو بە سپی کراوی قسە بکەین، یان دەتانەوێ دیسان بە فێڵو تەلەکەبازی کار بکەین؟

هەموومان دەمانزانی (جووت بەدزادە) مەبەستی چییە؟ مەبەستی ئەوە بوو (زەبووك زادە) ببێ بە نوێنەرو ئەو دووبارە بگەڕێتەوە سەرۆکی شارەوانی، چونکە دڵنیا بوو تا (زەبووك زادە) هەبێ، ئەستەمە ئەو ببێ بە سەرۆکی شارەوانی.

ئیحسان) تەقاویت وەڵامی دایەوە:

- بێ گومان پێویستە بە روونی قسە بکەین. هەڵبژاردن نزیك بۆتەوەو کاتی دەوربازیو قسەی بە پێچو پەنا نییە.

(جووت بەدزادە) قسەکانی سەلماند:

- ئێستا مادەم وایە پێویستە هەموو هاوڕێیان بەڵێن بدەن هەر قسەیەکی لێرە دەیکەین ، لێرە دەرنەچێ.

هەموومان بەڵێنمان دا. جەنابی (هەمزە) بەردەوام بوو:

- پێویستە ڕێگایەك بدۆزینەوە ئەم شارۆچکەیە لە دەست (زەبووك زادە) نەجات بدەین. ئەم بێناموسە هەتا مافی منداڵی شیرەخۆرەیشی خواردووە...

پیرەژنی پشت كۆماوی توشی ئاه و ناڵە كردووە.. (ئەمین بازرگان) گوتی:

- بابە، بڕیار بوو ڕەپو ڕاست قسە بكەین.

ئێمە ئەم هەموو ئازارەمان كێشاوەو (زەبووك زادە)مان بۆ ڕۆژێكی ئاوها هەڵگرتووە بۆ ئەوەی ناحەزان وردو خاش بكا. ئێستا كاتی ئەوە نییە قسەی لە دژ بكەین. پێویستە لە بەرامبەر ناحەزان پشتی بگرین.

(جووت بەدزادە) وەڵامی دایەوە:

- منیش مەبەستم ئەوەیە. پێویستە بە بەردێك دوو چۆلەكە بكوژین... هەم ئەو لە ناحەزان بەر بدەین‌و هەم بەلای ئەو لە كۆڵ خەڵكی ئەم شارۆچكەیە بكەینەوە. با لێرە ببێ بە نوێنەرو بچێتە ئەنقەرە. لەوێ هەر غەڵەتێكی حەز دەكا، با بیكا.

بێ گومان شتەكە بە چاو زۆر ڕاست بوو. بۆیە هەموو دانیشتوان قسەكەی (جووت بەدزادە)یان سەلماند.تەنیا (ئیسماعیلی بەندەی خودا) ڕازی نەبوو:

- شتی وا ڕاست نییە. ئێوە هەقتان نییە وڵات وێران بكەن. هەرچی لێرە دەبێ بەینی خۆمانە. زیانی قۆڵبڕی‌و فێڵبازی ئەو دامێنی خۆمان دەگرێ. بەڵام كە ببێ بە نوێنەرو بچێتە ئەنقەرە، زەرەر بە سەراپای وڵات دەكەوێ. بۆ ئەم كارە، جەنابی (ڕەزا) میرزای فەرماندار لە هەموو كەس لێوەشاوەترە. ئێمە لێی پاڕاینەوە... بە زۆر ناچارمان كرد ئیستیقالە لە كارەكەی بدا. ئەو لە كوێ؟! (زەبووك زادە) لە كوێ؟! با ئابڕوومان لە پێش خەڵك نەچێ.

(ئیحسان تەقاویت) گوتی:

- بە لای منەوە (باوەدین)ی بەڕێوەبەری قوتابخانە هەڵبژێرین. ئەو لە هەموو كەس لێوەشاوەترە... دە پازدە ساڵ منداڵەكانی ئێمەی پەروەردە كردووە. هەقی لەسەر هەموومان هەیە.

هـەمووومان (بـاوەدین)مـان دەناسـیو بـە راسـتیش خۆشماندەویسـتو رێزمـان دەگـرت. پیـاوێکی سەرراسـتو داوێنپـاك بـوو. لـەو هـەموو ماوەیـەدا تەنانـەت نەیتوانیبوو خانوویەك بۆ خـۆی بکڕێ. بۆیـە هـەموومان بەرامبـەر پێشنیارەکەی (ئیحسان بەگ) بێدەنگییەکی تێکەڵ بـە رەزامەنـدی دایگـرتین. خـەریك بـوو رازی ببین، کە (هەمزە بەگ) لەولاوە گوتی:

- هاوڕێینە، یەکێ ماوەی سی ساڵ خزمـەت، نـەتوانی ژیـانی خـۆی دروست بکـا، چۆن دەتوانی بارو دۆخـی شاروچکەکەمان چا بکا؟ کابرا پیـاوێکی زۆر بـاشو بـە شـەرەفە، بـەلام فایـدەی چییە؟! کـابرا دوای ئـەو هـەموو زەحمەتـە نـەیتوانیوە خانوویەك بـۆ خـۆ ی بکـڕێ کـە لـە ئـاخیری عـومری تێیـدا سـتر ببـێ. هەرچـی لـە دایكو باوکیشی بە میرات بۆی مابووەوە هەمووی فرۆشتو خواردی. پیاوی وا چۆن بە کەڵك نوێنەرایەتی دێ؟!

پێویستە هـی وەکـوو (زەبـووك زادە) ببـێ بـە نوێنـەر کـە گەیشتە ئەنجوومـەن هـەقمان لـە نـاو گـەرووی شـێریش بـێ، دەری دێنـێو ئـەم شارۆچـکەیە، کـە خـاکی مردووی بە سەردا کراوە، لە ژێر باری ئەم غەمو ناڕەحەتییە نەجات دەدا.

هاوڕێینە، وەرن بە گوێی من بکەن. ناوی (زەبووك زادە) بۆ پایتـەخت بپـالێون. ئـەوەی تـر لـە سـەر خـۆی. هـەم لـە دەسـتی دەحەسـێینەوەو هـەم خێـرێکیش بـە شارۆچکەکەمان دەبڕێ.

(ئیحسان تەقاویت) وەلامی دایەوە:

- بە پێچەوانە، پیویستە نوێنەری ئێمە پیاوێکی راستو بە شەرەف بێ!

(هەمزە جووت بەدزادە) ناڕەزاییی دەربڕی:

- بابـە گیـان، ئێـوە ئەوەنـدە باسـی راسـتیو نـامووس دەکـەن، دەمـەوێ بـزانم نامووسپەرستی چ پەیوەندییـەکی بـە نوێنەرایەتییـەوە هەیـە؟! یـەکێ کـە کـارێکی دەکەوێتـە بـەر دەست، بـا تـالان بکـا، بـا دزی بکـا، لانـی کـەم جـارو بـار خێـری بـە شارۆچـکەکەمان دەگـا. پەنـدێکی پێشـینان هەیـە دەڵـێ: (هـەموو زارێکـی کـراوە

خۆراکی دەوێ) مرۆڤی تەواو دەبێ هەم خۆی بخواو هەم خواردن بەوانی تریش بدا.

(ئیحسان تەفاویت) گوتی:

- قسەکانتان راستە. بەڵام (زەبووك زادە) خۆی چی هەیە، ئێوە ئەوەندە لایەنگریی دەکەن؟! ئەوساو ئێستایش ئێوە هەزارێکەکی کارەکانی (زەبووك زادە) ئاگادار نین.

(جووت بەدرادە) قسەی بە (ئیحسان بەگ) بڕی:

- بۆچی باسی چاکەکانی ناکەن. کێ ئەقڵێکی وەکوو ئەقڵی (زەبووك زادە)ی هەیە؟! کێ تا ئێستا بە قەدەر ئەو سوودی بۆ خەڵکی ئێرە هەبووە؟! خۆی لێرە نییە، خودای لێرەیە!! (زەبووك زادە) هەرچی هەبێ، کاری خۆی باش دەزانێ. لە بیرتان چوو، قومی هەوراز شارۆچکەی بە کرێ داو شکستی بە گەورەترین بەڵێندەری شارۆچکەکەمان دا. کابرای خاوەن دەزگا نۆ هەزار لیرەی دایە شارەوانی تا زەبووك لێ گەڕا قوم لە رووبارەکە ببەن. کابرا لە سبەینێ تا ئێوارێ لە بیری خزمەت کردنی ئێمە دایە.

(ئەمین بازرگان) قسەی جەنابی (هەمزە)ی سەلماند:

- بەڵێ، جەنابی (هەمزە) بەگ، راست دەفەرمووی... دەبێ بە چاك بڵێین چاك...ئێمە ئەگەر ئەقڵمان بخەینە کار، دەبینین کەس لە (زەبووك زادە) باشتر نییە. پەندێکی پێشینان هەیە دەڵێ: (مار کە دەڕوا بە خوارو خێچی دەڕوا، بەڵام کە دەگاتە بەردەم کونەکەی، بە راستی دەچێتە ناو کونەکەی.)

ژیانیش بەم جۆرەیە. کاتێ کار گەیشتە جێگای ناسك، دەبێ راست بڕۆین. ئێمە ئێستا لە حەدو سەدی هەڵبژاردنداین. رێك گەیشتینە بەردەم کونەکە. (زەبووك زادە) کاتی خۆی هەر کارێکی کردووە چاوی لێ دەپۆشین. ئەو کارانە شتێکی ترن‌و ئەم کارەی ئێستایش شتێکی ترە. پێویستە دەنگی پێ بدەین‌و رەوانەی

ئەنجوومەنی بکەین. ئەویش دەبێ هەرێمان پێ بدا ببێ بە پیاوێکی باش‌و سەر راست...

پاشان ئاوڕی لە من دایەوە گوتی:

- تۆ رات چییە؟

من کە ئەو بارو دۆخەم بینی مێشکم لە سەردا نەما. نەمدەزانی لە وەڵامی پرسیارەکەی چ بڵێم؟ مەسەلەکان تێکەڵ‌و پێکەڵ ببوون... بتەوێ‌و نەتەوێ‌و ئەم کارە دەکراو (زەبووك زادە) دەبوو بە نوێنەرو ناڕەزایی من‌و ئەوانی تر لە کیسەو نارەحەتی زیاتر هیچی لێ نەدەکەوتەوە. وەڵامم دایەوە:

- دۆست‌و دوژمن دان پێدا دەنێن لە (زەبووك زادە) بەو لاوە هیچ کەس شایەنی نوێنەرایەتی نییە. ئێوە بە پاڵاوتنی (باوەدین)و جەنابی (رەزا) میرزا خیانەتی دەرهەق دەکەن. ئەگەر با ئەو خەبەرە بە بەر گوێی (زەبووك زادە) بگەیەنێ، هەردووکیان لە ناو دەبا. کارێکی وایان پێ دەکا تا ماون پێیان بەو ناوە نەکەوێ. من سکم پێ دەسووتێن. گوناهە ئەو بەدبەختانە ئاوارەو سەرگەردان بکەین...

ئاخیری هەموو بڕیارمان دا (زەبووك زادە) هەڵبژێرین تەنیا (ئیحسان تەفاویت) رازی نەدەبوو. هەرچی کردمان، نەمانتوانی ئیقناعی بکەین...ئاشکرا بوو دەیەویست خۆی هەڵبژێرێ... ئەوەندەی ئامۆژگاریمان کرد:

- بابە، واز بێنە... نوێنەرایەتی گاڵتە نییە.. ئەزیەت دەخۆی...

وەڵامی دەدایەوە:

- ئەگەر ئەو (زەبووك زادە)یە، منیش (ئیحسان تەفاویت)م...هەرچی لە دەستی دێ، با بیکا.. من ئەوە ماوەیەکی دوورو درێژە چاوەڕێی دەرفەتێکی وا دەکەم‌و ئێستا دەبێ ئەو دەرفەتە بقۆزمەوە... بە هیچ نرخێ خۆم ناکێشمەوە...

رووی نەدەهات بە ئاشکرا بڵێ: من بپاڵێون... بەڵام لە قسە کردنییەوە دیار بوو.

وا چاکە بچینە لای (زەمبووک زادە)و ئە مەسەلەیە لە بەر دەمی خۆی یەک لا بکەینەوە. ئەگەر ئەو ئاگادار نەبێ ، ئێمە هەرچی بڵێین‌و هەر بڕیارێ بدەین بێ فایدەیە.

(ئیحسان تەفاویت) نەیدەویست خۆی لێ بەدەر ببا. وەڵامی دایەوە:

- ئێوە کارەکان بدەن بە من، هەقتان نەبێ. (زەمبووک زادە) کێیە ئەوەندە حیسابی بۆ بکەین؟ کابرایەکی فۆڵبڕو تەلەکەباز شایانی ئەو هەموو قسەیە نییە.

هەمووومان لە ناحی دڵەوە لەگەڵ ئەوەدابووین. بەڵام زاتمان نەدەکرد باسی بکەین.

بە کۆمەڵ چووینە ماڵی (زەمبووک زادە). (ئیحسان تەفاویت) یەکەم جار، خێرا خێرا دەڕۆیشت، بەڵام کە لە ماڵیان نزیک کەوتینەوە، خۆی دایە پاش. لە بەر دەرگا خەبەرمان نارد گوتمان کارێکی گرنگمان هەیە. دوو سێ دەقیقەی پێ نەچوو، دایکی هات‌و گوتی:

- فەرموون وەرنە ژوورەوە. بە خێر بێن. تکایە نەختێ هێواشتر جەنابی (ئیبراهیم) خەریکە بە تەلەفۆن قسە لەگەڵ ئەنقەرە دەکا. لە سەر پەنجەی پێ‌و هێدی هێدی چووینە ژوورەوە. (زەمبووک زادە) خەریک بوو تەلەفۆنی دەکرد. بە دەست ئاماژەی کرد: دانیشن! زۆر خێرا خێرا قسەی دەکرد...

تۆ جەنابی ببینەو سەلامی منی لێ بکە.. ئێمە (ڕێکخراوی دروست کردنی مزگەوت)مان پێك هێناوەو خەریکی پارە کۆکردنەوەین. ئەوەی تر دەبێ دەوڵەت دروستی بکا... چ؟! دوو سەد هەزار لیرە؟ سێ سەد دانە؟ بابە، دەنگت نایێ. نەختێ قایمتر قسە بکە. گوتت سێ سەد هەزار؟ نا قبووڵ ناکەین. زۆر کەمە. مزگەوتێکی باش بە سێ سەد لیرە دروست ناکرێ. من بەڵێنم بە هاوشارییەکانی خۆم داوە... سەڵام لە جەنابی بکە. پێی بڵێ بە خوا لە یەك ملیۆن کەمتر بێ، قبووڵ ناکەم‌و ڕەوانەی دەکەمەوە. ئەوسا ئابڕووی خۆی دەچێ. من هەقم لە سەر نییە. چی؟! چت گوت؟ بەڵێ، زۆر باشە. مەمنوونم...

کاتێ (زەبووک زادە) بە تەلەفۆن قسەی دەکرد، (ئیحسان تەفاویت) لە جەنابی (هەمزە)ی پرسی:

- کە دەڵێ جەنابی مەبەستی کێیە؟

(جووت بەدزادە) وەڵامی دایەوە:

- لەم وڵاتەدا چەند جەناب هەیە؟ دیارە مەبەستی سەرۆک وەزیرانە.

- بە راست؟! یانی (زەبووک زادە) ئاوها قسە لەگەڵ سەرۆک وەزیران دەکا؟!

- ئەی چی؟

(زەبووک زادە) هێشتا هەر خەریکی تەلەفۆن کردن بوو:

- بابە گیان، دەنگت باش نایێ. نەختێ قایمتر قسە بکە. ئاها! ئێستا دەنگەکە باش بوو! لە بارەی هەڵبژاردی ئێمەوە خاتر جەم بە! ئێمە لە ئێستاوە بردوومانەتەوە. ئێستا تۆ دەتەوێ قسە لەگەڵ وەزیری ئاوو کارەبا بکەی، سەلامی منیشی لێ بکەو پێی بڵێ ئاوبەندێکمان دەوێ. ئەو ئاوبەندە دەبێ پێش هەڵبژاردن دەست پێ بکا. دەبێ ئاوبەندێك لە سەر رووباری شارۆچکەکەمان دروست بکەن، لە هەموو وڵاتدا تاکی نەبێ. چی؟ سەد ملیۆنی تێ دەچێ؟

من ئەم قسانەم بە مێشکدا ناچێ. ئەگەر پێنج سەد ملیۆنیشی تێ بچێ، دەبێ تا چەند رۆژی تر دەست بە ئیشەکە بکەن. من ئاوبەندم دەوێ وەسسەلام!! ها؟ خێر نییە.

جەنابی (ئەمین) بە هێواشی بە (هەمزە) خانی گوت:

- کورە. (زەبووک) شێت بووە. رووباری شارۆچکەکەمان ئاوی تێدا نییە تا ئاوبەندی لە سەر دروست بکا.

جەنابی (هەمزە) وەڵامی دایەوە:

- بیر لە ئاوو ماو مەکەرەوە! (زەبووک زادە) ئەگەر بڕیار بدا، ئاوی رووبارەکەیش لە شوێنێکی تر دێنێ!

(زەبووک زادە) بە ئارامترو بە سەنگینتر لە تەلەفۆن قسەی دەکرد:

- گوێ بگرە، بزانـە چ دەڵێم؟ ئـەوە چـەند رۆژە، بـە دوای وەزیـری پیشەسازیدا دەگەڕێم، پێم نادۆزرێتەوە دوو قسەی بە تەلەفۆن لەگەڵ بکەم. نـازانم لـە کوێیـە؟ نەکا وازی لە رابواردنیش نەهێنابێ! چی؟ هەر ئەوە مابوو! ئێمە لێـرە بـە هیلاك بچین و شەووڕۆژ بۆ میللەت برەتێین، ئێوەیش لەوێ خەریکی عەیش و نـۆش بـن!! هاء هاء هاء! گالتە دەکەم. بەڵێ، بـە زمـانی مـن بـە وەزیـری پیشەسازی بڵـێ دەبـێ کارخانەیەك لەم شارۆچکەیە دروست بکا. ئەویش پێش هەڵبژاردن!! ئەگەر نا پاش هەڵبژاردن بە کەلك نایێ. چی؟ کارخانەی چی بێ؟ چوزانم . ئەوە خونـان برِیـاری لە سەر بدەن. ئێمە تەنیا دەمانهەوێ کارخانـە بـێ. ئـەوەی تـر لـە سـەر خۆتـان! چ کارخانەیـەك باشـە ئـەوە دروسـت بکـەن. ئێمـە دەسـت لـە کاروبـاری دەوڵـەت وەرنادەین. ئێمە تەنیا کارخانەمان دەوێ!!

نازانم لەو سـەری تەلـەفۆن چییانگوت، (زەبـووك زادە) تـووڕە بـوو. دەسـتی بـە جوێن و قسەی ناشیرین کرد. ئینجا گوتی:

- من ئەو قسانەم بە مێشکدا ناچێ. چاوەڕێ دەکـەم ئیشـەکە دەسـت پـێ بکـا... کاتێکی شاد.

دەسکی تەلەفۆنی دانایەوەو بە روویەکی خۆش بە خێرهاتنی کردین:

- بە خێر بێن! چ عەجەب ئێمەتان بە بیر هاتەوە؟!

بـەر لـەوەی وەڵام بدەینـەوە، لـە کاتێکـا کـە ئارەقـەی ناوچـەوانی بـە دەسماڵ دەسڕییەوە، بەردەوام بوو:

- ئەوە قسەم لەگەڵ نەنقەرە دەکرد. دەك خوا ئەو تەلەفۆنانـەی ئێمـە نـەهێڵێ. ئەگەر بچوومایە سەر تەپەی ئیمام زادەو ئاوها هاوارم بکردایە باشتر گوێیـان لـە دەنگم دەبـوو!! قسـەم لەگـەڵ وەزیـری بازرگـانی دەکـرد. برادەرێکـی باشـە! برِیـارە کارخانەیەکمان بۆ لێرە دروست بکا. بە مەرجێ هاورێیان بە زیرەکی خۆیان نرخی زەوی گرانتر نەکەن. تکاتان لێ دەکەم لە چ جێیان باسـی ئـەو شـتە مەکـەن، نـەوەك ئەو زەوییەی مەتری بە دوو لیرەیە، دەبێ بە سەد لیرە.

وەکوو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، نەختێ وەستا ، ئینجا گوتی:

- بە ڕاست! جەنابی (ئیحسان)، ئەو زەویەی هەوراز شارۆچکە کە زەوی تۆیە، چەند هەکتارە؟

(ئیحسان تەڤاویت) دوگمەی چاکەتی داخستو بەرێزەوە دەستەکانی لە سەر سنگی لێك تێپەڕاندو وەلامی دایەوە:

- قوربان، نزیکەی حەفتا هەکتار دەبێ!

- بە لای منەوە، زەوییەکەی تۆ بۆ دروست کردنی کارخانە لە هەموو شوێنێ باشترە. با حیساب بکەین بزانین مەتری بە سەد لیرە پارەکەی دەکاتە چەند؟ بەو نرخەی دەدەی؟

ئیحسان تەڤاویت بەو پێشنیارە وڕو گێژ بوو. کەوتە پتە پت:

- زەوی زەوی خۆتە! چۆنت پێ باشە وای لێ بکە!

(زەبووك زادە) یەکەو جگەرەی پێشکەش کردین. دایکیشی قاوەی بۆ هێنـاین... ئینجا (زەبووك زادە) پرسی:

- بە ڕاست! جارێ پێم بلێن مەسەلە چییە؟ خێرە هاتوون؟ چ ئیشتان بە من هەیە؟ ئینجا پاشان...

- (ئیحسان تەڤاویت) لە ترسی ئەوەی نەوەك ئەوانەی تر هیچ قسە نەکەن و فرۆشتنی زەوییەکەی تێك بچێ، دەست پێشخەری کرد:

-جەنابی (ئیبراهیم بەگ)، عەرزێکی بچووکمان لە حزوورتان هەیە...

- تکایە فەرموو چ ئەمرێتان هەیە؟

- ببوورە قوربان، ئێوە ئەمر دەکەن. ئێمە داوایەکمان لە جەنابتان هەیە؟ لە بەیانییەوە تا ئێستا باسمان دەکرد کە کەس لە خاوەن شکۆ شیاوتر نییە بۆ نوێنەرایەتی ئەنجوومەن .. لەبەر ئەوەی دلنیاین قسەمان ناشکێنی، هاتووین تکات لێ دەکەین ئەم خزمەتە کۆمەلایەتییە قبوول بفەرمووی.

- ببووره جەنابی (ئیحسان)، تا گەوره هەبن، ئێمە چین؟ ئێوه لە من لە پێشترن؟ نوێنەرایەتی ئەنجوومەن مافی ئێوەیە. خەڵك گوێیان لەم قسەیە بێ چیم پێ دەڵێن؟!

(ئیحسان تەقاویت) بە سیمایەكی شەرمنانە پەلاماری (زەبووك زادە)ی داو دەستی ماچ كرد. ئەویش نە جارێك‌و دوو جار، بەڵكە یەك لە سەر یەك دەستی ماچ دەكرد.(زەبووك زادە) دەستی دەكێشایەوە، جەنابی (ئیحسان) وازی لێ نەدەهێنا. ئەوەندەی لە ما بوو دەستی كابرا لە بنەوە دەربێنی. (زەبووك زادە) دەپاڕایەوە:

- مێرسی... سوپاست دەكەم. سەلامەت بی!!

بە راستی هەندێ كەس زۆر هیچ‌و پووچ‌و مەراییكەرن!! 1

(زەبووك زادە) بە كوڕی (ئیحسان بەگ) دەشێ.. بەڵام تۆ وەره تەماشا كە چۆن دەستی دەلێسێتەوە!!!

- (ئیبراهیم بەگ)، ئەگەر تكامان نەگری، دڵمان دەشكێنی.

(زەبووك زادە) نەدەچووە ژێر بار:

- نا. بە گیانی هەمووتان قبووڵ ناكەم. نامەوێ خەڵك پاش ملە قسەم بۆ هەڵببەستن‌و بڵێن : پلەو پایە چاوی كوێر كردووە. من تەنانەت بڕیارم داوە واز لە سەرۆكایەتی شارەوانیش بێنم. وام پێ باشە بە بێ پلەو پایە خزمەتی هاوشارییەكانم بكەم!!

- توخوا (ئیبراهیم بەگ)، ئەم قسانە مەكە!! بمرین واز لە تۆ ناهێنین!!

لە دڵی خۆمدا گوتم:

- توخوا، تۆ وەره، تەماشای ئەم قۆلبڕە بكە!! ئێستا لە پایەی سەرۆكی شارەوانیش تێر بووەو دەیەوێ واز بێنێ. ئاخیر كابرا بڵێ موڵكی باوكت بێ خودان ماوە؟ كارخانەی دایكت بێ سەرپەرشت ماوە؟ دەتەوێ واز لە پایەی سەرۆكایەتی شارەوانی بێنی؟!

(زەبووك زادە) وەك ئەوەی لە سەر هەق بێ، گوتی:

- بۆ خاتری خزمەتی میللەتو وڵات ئەمری ئێوە قبووڵ دەكەم. هەر بژین!!

ئومێدەوارم بەرامبەر هەمووتان رووم سپی بێ!!

هەمووومان بەبێ بیر كردنەوە وەڵامان دایەوە:

- هەر بژیو هەر بەردەوام بی!! بێ گومان رووسپی دەبی!!

(زەبووك زادە) تا بەر دەرگا بە رێی كردین. كە لە ماڵی هاتینە دەرەوە، (ئیحسان تەقاویت)، شەرمی نە ئێمە دەكرد، سەری دانەواندبووو نە پێشەوە دەرۆیشت. چاوەرێمان دەكرد دوو سێ قسە بكا بۆ ئەوەی تف لە چارەی بكەین. بەڵام هیچی نەگوت. هەر كەسە چووە لایەك. منو (مەلا بەدر) چووینە لای قاوەخانە...

لە گۆرەپانی شارۆچكە لە سەرۆكی پۆستو تەلەگراف راست هاتین. خەریك بوو لەگەڵ دوو كارمەندی خۆی قسەی دەكرد. دوو كارمەندیش لای ستوونی تەلەفۆن خەریكی كار بوون. چاكو چۆنیمان كردو پرسیم:

- (شەوكەت) خان، ئەوە خێرە؟

بە نارەحەتی وەڵامی دایەوە:

- بابە، وازم لێ بێنە. خەریكە لە دەست ئەو تەلەفۆنانە شێت دەبم.

- بۆچی؟ چ بووە؟

- تێلی تەلەفۆن خراپ بووەو ئیش ناكا. نازانم چ بێ شەرمێك تێلەكانی خراپ كردووە؟ لە پایتەخت هەرەشەیان بۆ ناردووم. خۆمان ئەوەندەی گەراین، شوێنی پچرانەكەمان پێ نەدیترایەوە، ئێستا دوو كارمەند لە پایتەختەوە هاتوون، چاكی بكەنەوە...

لە سەرسامییان دەمم بەش بووەوە... ئەگەر تێل خراپ بووبێ، ئەی (زەبووك زادە) قسەی لەگەڵ كێ دەكرد؟ گوتم:

- بابە، تازە (زەبووك زادە) لەگەڵ وەزیری بازرگانی قسەی دەكرد...

سەرۆکی پۆستە بزەیەکی گاڵتەئامێزی هاتێ:

- چ دەڵێی؟ بابە، ئەوە دوو رۆژە، هیچ پەیوەندیمان نییە.

دیم دیسان باش فریومان خواردووە. ئەگەر خەڵك تێ بگا، ئابرووومان دەچێ.

ئیتر گوتم:

- بە گاڵتەم بوو بابە. هیچ نییە.

ئێستا تێگەیشتی چەندمان ئازار لە دەست ئەو کابرایە خواردووەو چۆن راستەوراست تەفرەی داوین؟ نازانم چ گوناهێکمان دەرهەق خوای خۆمان کردووە، تووشی ئەو بەڵای ناگەهانە هاتووین؟

# (17)

**(حاجی... حاجی ئەککە!!)**

**جەنابی (مورتەزا)، خوا سەلامەتی کا، رووداوەکانی دوای ئەوەی بۆ باس کردم:**

**- هەڵبـژاردنی ئـەو دەورەیـە زۆر ناڕێـك بـوو. ئێمـە هـەموو کارەکانمـان ڕێـك خستبوو، چاوەڕێی ئـەنجامی هەڵبـژاردنمان دەکرد...هەمیشە گوێ قـوڵاغ بـووین: هەندێ لە دیار تەلەفۆن‌و هەندێ لە دیار رادیۆ. هەر خوا خوامان بوو نـەدۆڕێنین!! من لە عومری خۆم ساتی وا سەخت‌و ناخۆشم بە سەر نەبردووە!!**

**بەرە بەری عەسر بـوو، دەنـگ‌و باسیی هەڵبـژاردن لـە رادیۆ بـڵاو کرایـەوە. لـە پارێزگەکـەمان هـەموو شـارەکان شکسـتیان خواردبـوو، لـە هـەموو شـوێنی پـارتی ناحەزی ئێمە بردبوویەوە. تەنیا شارۆچکەی ئێمە بە زۆرینەی دەنگ ناحەزی بـۆڕ دابـوو. تـۆ نـازانی خـەڵکی ئێـرە کردیانـە چ هـەراو هۆریایـەك؟ دەتگـوت قیامـەت هەستاوە!! هەر کڵاو بوو دەفڕییە ئاسمان!! گەورەو بچووك، پیرو گـەنج لـە کـەیفان کڵاویان فڕێ دەدایە ئاسمان.**

**سەرتیپ (محەمەد) تـۆپێکی کـۆنی لـە سـەر تەپـەی ئیمـام زادە خستبووە کـارو یەك لە دوای یەك تۆپی دەتەقاند: گرم...گرم!!!1**

**(ویسـل چـلاق) سـەری زوڕنـای کردبـووە لای پـارتی ناحـەزو ئـاوازی (سـەمای کەمەر)ی لێ دەدا. ئەو شەوە خەڵك بـە قـەدەر یـەك سـاڵ مەشـرووبیان خـواردەوەو سەمایان کرد...**

پارێزگار بە تەلەفۆن سوپاسی زەبووکی کرد. برووسکەی پیرۆزبایی یەك لە دوای یەك لە ئەنقەرە دەهات.

بە شکۆو تەنتەنە (زەبووك زادە)مان رەوانەی ئەنقەرە کرد. چاوەڕێ بووین هەر هێندە پێی بە پایتەخت بکەوێ، بەو هەموو برادەراتی‌و ئاشنایەتییەی پێشووی لەگەڵ سەرۆکی وەزیران‌و دەستەی دەوڵەت هەیبوو، ئێشەکانمان پێك دێنێ... ئاوبەندی سەر رووبارەکە دروست دەکاو کارخانە دادەمەزرێنێ.

بەڵام (زەبووك) چۆن رۆیشت هەر ئەو رۆیشتن بوو. ئێوە چەندتان دیوەوە، ئێمەیش هەر هێندە!! بەدبەختی لەوەدا بوو، هەر هێندە (زەبووك زادە) رۆیشت، سەرو سەکووتی (برهان الدین) پەیدا بوو: نەحەزانمان رۆژ بە رۆژ بە هێزتر دەبوون‌و ئێمە سەعات بە سەعات زیاتر رسوا دەبووین. هەموو رۆژێ دوو سێ برووسکەمان دەنارد دەمانگوت: (زەبووك) دەستمان بە دامانت بمانگەیێ بەڵام هیچ خەبەر نەبوو. تەلەفۆنمان بۆ دەکرد. ژنەکەی وەڵامی دەدایەوە:

- چۆتە لای سەرۆك وەزیران. یان ئەنجوومەن کۆبوونەوەیان هەیە.

زانیمان ئاوو هەوای ئەنقەرەی لێ کەوتووەو ساختەو فۆڵبڕییەکانی زیاتر بووە.

(برهان الدین) هەموو حەفتان کۆبوونەوەی گوتاردانی دەکرد. لە گۆڕەپانی شارۆچکە، دەچووە سەر سەکۆو هەرچی تفنگ‌و پلارو لابڕدونگی بە خەیاڵدا دەهات تێی دەگرتین. ئێمەیش لە ترسان‌و لە شەرمەزارییان زاتمان نەدەکرد وەڵامی بدەینەوە. دەچووینەوە ماڵێ‌و دەرگامان لە سەر خۆمان کلیل دەدا.

ئاخیری، رۆژێ، بە عام چووینە برووسکەخانەو داوای برووسکی راستەوخۆمان کرد. کابرای برووسکەچی ئەنقەرە گوتی:

- (زەبووك زادە) کۆبوونەوەی هەیە. داوای خۆتان بڵێن بۆ ئەوەی پێی بگەیەنین...

رازی نەبووین. وەڵاممان دایەوە:

- لە ناو برووسکەخانە مان دەگرین. هەر کاتێ کاری تەواو بوو، با بێ قسە بکەین...

بیستو چوار سەعاتی تەواو لە برووسکەخانە ماینەوە... دەوری سەعات چواری پاش نیوە شەو، کە هاتە برووسکەخانەی ئەنقەرە، دەستمان بە ئاڵو گۆڕ کردنی پەیام کرد.

(زەبووك زادە) وەڵامی دایەوە:

- ئێوە بۆچی ئاوەها بێ ئەمەكو خۆش باوەڕن؟ من تا ئێستا نە حروور سەرۆکی وەزیران بووم. لە بارەی کاروباری شارۆچکەکەما گفتو گۆمان لەگەڵ دەستەی دەولەت دەکرد.

ئاخر توخوا تا ئەم وەختە درەنگە دەستەی دەوڵەت دەبێ؟ کەس نازانێ قورمساغە تا ئەو درەنگەی شەو لە کام سەماخانەو مەیخانە بووە؟! منەتیشمان لە سەر دەکا!!

گوتمان:

- جەنابی (زەبووك زادە)، سەرێك لە شارۆچکەکەمان بدە. وەرە، بارو دۆخمان زۆر شڕە!

کاتم لە کوێ بوو؟ ناتوانم سەنگەر چۆل بکەم!!!

باشە، ئەدی ئێمە تەگبیرمان چییە؟

- ئێوە وەرنە ئەنقەرە. بە ماوەی دوو سێ سەعات هەموو کارەکانتان بۆ پێك دێنم. ئاوبەند دروست دەکەم. کارخانەکەیشتان دەدەمێ بیبەن!!

بۆ بەیانی ژمارەیەك ریش سپی شارۆچکەکەمان لەگەڵ (مەلا بەدر)و (ئیحسان تەفاویت)و (جووت بەدزادە)و (ئەمین بازرگان)و من بە رێ کەوتین، چووینە ئەنقەرە.

واماندەزانی هەر هێندە بگەینە ئەنقەرە، زەبوك زادە دەستمان دەگرێو لەم وەزارەتەوە دەمانباتە ئەو وەزارەتو گیرو گرفتی ئاوو کارەباو دەزگای پاك

کردنەوەو ترومبێلی ئاگر کوژاندنەوەو قیر کردنی جادەکانمان بۆ پێك دێنێ. بەڵام حەیف!! راستە گوتوویان: (بنیادەم شیری خاوی خواردووە!)

کەر بە هەموو کەرایەتی خۆی کە پێی بکەوێتە ناو قۆرتێك ئیتر نەگەر رایشی بکێشن بەو لایەدا ناچێ. بەڵام بنیادەم، کە لە هەموو بوونەوەرێك بەرزترە، هەزار جار فێڵی لێ دەکرێو.. سەد جار زیانی لە شتێ بەر دەکەوێ، هەر واز ناهێنێ.

لە ئەنقەرە چ دەردەسەرییەکمان دی، هەر خوا دەزانێ!! ئەو بێناموسە بەزمێکی پێ کردین، لە هەقایەتان بیگێڕینەوە...

منو چەند کەسێکی تر تا ئەو رۆژە ئەنقەرەمان نەدی بوو.... بەڵام (ئیحسان تەقاویت) شارەزای هەموو شوێنێ بوو. یەکەو راست چووینە ئوتێلێك خاوەنەکەی خەڵکی شارۆچکەی خۆمان بوو. (مەلا بەدری ئاقڵمەند) گوتی:

- هاوڕێینە، (زەبووك زادە) دەیەوێ ئێمە بباتە لای سەرۆکی وەزیرانو دەستەی دەوڵەت...

(هەمزە جووت بەدزادە) قسەکانی مەلای سەلماند:

- راستە. وێنەگرو پەیامنێرەکان وێنەی باسی ئێمە لە رۆژنامەکانیان بڵاو دەکەنەوە، ئەگەر رێكو پێك نەبین، هەموومان ئابڕوومان دەچێ!!1

بە راستی قسەکەیان راست بوو. (ئەمین بازرگان) کەرەوێتی نەبەستبوو.! (ئیسماعیل بەندەی خودا) هیچ پانتۆڵی باشی نەبوو. مەلا بەدر لە هاوینو بەو دونیا گەرمە گالشی لە پێ کردبوو.

بە کۆمەڵ چووینە بازاڕی جلفرۆشیی . یەکەو دەستە بەرگی سەراپامان کڕی. بە (مەلا بەدر)و (ئەمین بازرگان)مان گوت:

- کاکە گیان، کەمێ ریشو سمێڵتان رێك بخەن!

چووینە سەرتاشخانە. دەمو چاومان پاك بووەوە، بە پرسیاران چووینەماڵی (زەبووك زادە). خانوویەکی لە تەلارێکی حەفت نهۆمی گرتبوو. کە (ئەمین بازرگان) بینای حەفت نهۆمی بینی، گوتی:

- هاوڕێیان، بە راستی جێی شانازییە نوێنەرەکەمان دامو دەزگایەکی ئاوهای هەیە. دوژمن لە حەسوودییان کوێر دەبن! خوا رۆژ بە رۆژ پایەی بەرزتر بکاتەوە!!

ئاخیری زەنگمان لێدا. خانمی (ئیبراهیم بەگ) دەرگای نیوە کردەوە. هەموومان ئیکلاممان کێشاو سەلامامان کرد. ماشەللا ژنەکەی چەند جوان ببوو!! سەد سوێندت دەخوارد ژنی ئەنقەرەیە!! هیچ لە ژنی چارشێو بەسەرو خەڵکی شارۆچکەکەمانی نەدەکرد. هەر کەسی تەماشای بکردایە، دەیزانی ژنی نوێنەری ئەنجوومەنە!!

بە نازو گرشمە پرسی:

- هیچ ئیشتان هەیە؟

-ئێمە لە شارۆچکەوە هاتووین. ئیشمان بە جەنابی (ئیبراهیم بەگ) هەیە!!

رووی گرژ بوو. دیار بوو کەیفی بە قسەکەمان نەهات. بە گنەیی وەڵامی دایەوە:

- لەماڵەوە نییە.

- خوشکە گیان چۆن دەتوانین بیبینین؟

وەڵلا دیار نییە. پێش چەند دەقیقەیەکیش سەرۆکی وەزیران بە تەلەفۆن تاقیبی دەکرد. وەك ئەوەی دیسان ئیشیان وەستا بێ لە دوای (ئیبراهیم بەگ) دەگەڕێن!!

نەماندەزانی تەگبیرمان چییە؟ توخوا تۆ تەماشای ئەو ژنە بکە کە تازە پێڕاگەیشتووە. لەو رۆژەوە کە هاتۆتە ئەنقەرە، مرۆڤایەتی لە بیر کردووەو هەر فەرموویشمان لێ ناکا بچینە ژوورەوە ماندووی خۆمان بحەسێنینەوە.

من بە رووقایمی گوتم:

کە پیاو پارەو پایەی زیاد بوو، ئیتر پێشوازی لە هاوشارییەکانی خۆی ناکا.

سەری بردە ژوورەوەو بە دەم دەرگا داخستنەوە وەڵامی دایەوە:

- داوای بوردن دەکەم. ئەمرۆ رۆژی پێشوازی کردنی میوانانمان نییە.. چەند خانمە وەزیرێك لە ماڵمانن. ئەگەر نا دەمگوت فەرموون وەرنە ژوورەوە ماندووی خۆتان بحەسێننەوە..

- باشە ئێستا چار چییە؟ (ئیبراهیم خان) لە کوێ بدۆزینەوە؟ سەرێك لە ئەنجوومەن بدەن، ئەگەر لەوێ نەبوو، سەرێك لە کۆشکی سەرۆکی وەزیران بدەن، ئەگەر هەر نەتاندۆزییەوە، برۆنە یانە، بێ شك لەوێیە...بە پرسیاران چووینە ئەنجوومەن.. کەس لەوێ نەبوو. دووبارە بە پرسیاران چووینە کۆشك. لە یەکێ لە پاسەوانەکانمان پرسی:

- تکایە، بە جەنابی (زەبووك زادە) بفەرموون هاوشارییەکانت هاتوون.

وامانـدەزانی هەموو دەرگەوانو کارمەندەکان (زەبووك زادە) دەناسن، ئێستا دەچن خەبەری دەدەنێ. بەڵام کابرای پاسەوان بە رووگرژی پرسی:

- (زەبووك زادە) کێیە؟

زۆر نارەحەت بووین. گەوجی نەخوێندەوار ئاغای ئێمە ناناسێ. (مەلا بەدر) وەڵامی دایەوە:

- رۆڵە گیان، تۆ خەبەرێك بنێرە ژوورەوە، ئەوان هەموو دەیناسن...

- یەکێ من نەیناسم، ئەوانەی ژوورەوە لە کوێ دەیناسن؟ من تا ئێستا ناوی وام بە بەر گوێ نەکەوتووە.

- برا گیان، (ئیبراهیم زەبووك زادە) نوێنەری ئەنجوومەنە!!

- من نوێنەری وا ناناسم.

(ئەمین بازرگان) دەمی بردە بن گوێی (ئیسماعیلی بەندەی خودا)و بە هێدی گوتی:

-ئەو کابرایە بە ناوی نوێنەرایەتی تەفرەیشی نەدابین!؟

(ئیسماعیلی بەندەی خودا) تووڕە بوو:

- کورە، وس بە!! ئەمە چ جۆرە قسەیەکە دەیکەی!!؟

ئاخیری، لەوێش هیچ ئەنجاممان دەستگیر نەبوو. بڕیارمان دا بچینەوە مالّی. ئاخیری هەر دێتەوە مالیّ؟

تا سەعات دەی شەو، لەو دەورو بەری مالّی پیاسەمان کرد. (زەبووك زادە) هیچ خەبەری نەبوو. (ئیحسان تەفاویت) گوتی:

-کاتێ ئێمە لێرە نەبووین، نەهاتبێتەوەو چووبێتە مالّەوە؟! چووینە بەر دەرگاو لە زەنگمان دا. ئەم جارە دایکی هاتە دەرەوە گوتی:

- پێش نیو سەعات (ئیبراهیم) تەلەفۆنی کرد. پێم گوت کە ئێوە هاتوون، زۆری کەیف پێ هات. سەلامی هەبوو. گوتی: دەبێ زۆر ببوورن. من ئەم شەو لە بالّوێزخانەی ئەمریکام. ناتوانم بێمەوە مالێ. با سبەی سبەینێ تەشریف بێننە مالّەوە.

ئەو شەوە، لە ئوتێل ماینەوە. سبەینەی رۆژی پاشی، زۆر زوو چووینە مالّی (زەبووك زادە). ئەم جارە ژنێکی بێگانە هاتە بەر دەرگاو گوتی:

- (ئیبراهیم خان) لە مالّەوە نییە.

- ئەی خانمەکەی لە کوێیە؟

- چۆتە سالۆن قژی چاك بکا.

- ئەی دایکی لە کوێیە؟

- چۆتە حەمام.

چووینە قاوەخانەیەك. فراوینم بخۆین. (ئەمین بازرگان) گوتی:

-بێ شك دەبێ کارێکی پێویستی هەبێ، بۆیە وا زوو چۆتە دەرەوە!! قەیدی نییە. نیوەڕۆ دەیبینین!!

نیوەڕۆیش نەماندی. شەویش نەماندی. سبەینەی رۆژی پاشیش چووین لە مالّەوە نەبوو. پێنج رۆژی رێك لە سەر یەك بەیانیو نیوەڕۆو ئێوارە لە دوایەوە رامان کرد، نەمانتوانی بە زیارەتی بگەین.

ئەو کراسە سپییانەی کڕیبوومان هەموو پیس بوون. دووبارە یەکەو کراسی ترمان کڕی. ئەوانیش بە چڵك بوون. دیتمان نەخێر فایدەی نییە!! بڕیارمان دا هەر یەکە بە نۆرە، نۆبەت لە ماڵەکەی بگرین.

بیستو چوار سەعاتێکیش بەم جۆرە تێپەڕی. دیسان نەماندی، گوتمان:

- نەکا ئەو بۆرە پیاوە لە ڕێگایەکی دی، یان لە لوولەی سۆبەوە بچێتەوە ژووریو بێتە دەری!!1

بە تەواوی نومێدمان بڕی. بڕیارمان بگەڕێینەوە شارۆچکەکەمان.. ڕۆژێ، لە قاوەخانە دانیشتبووین، قسەمان دەکرد. من گوتم:

- مەگەر ئەو بێناموسە پێی بە شارۆچکەکەمان نەکەوێ!!

(مەلا بەدر)، کە ئەوەندەی پارەی لە ئوتێل خەرج کردبوو، ڕۆحی گەیشتبووە سەر لێوی. گوتی:

- ئەوەندەی تف لە چارە دەکەم کە ئاو بیبا.

(ئەمین بازرگان) بزەیەکی گاڵتەجاڕی هاتێ:

- بەخوا هیچمان پێ ناگرێ. شەرت بێ دوای ئەم هەموو کارە پیسانەی دیسان فێڵمان لێ دەکاو قەرداریشمان دەکاتەوە.

خاوەنی قاوەخانەکە گوێی دابووە قسەکانمان. سکی پێ سووتاینو گوتی:

- ئێوە دەردتان چییە؟

ئێمەیش لە سەری هەتا بنی مەسەلەکەمان بۆ باس کرد. خاوەنی قاوەخانەکە گوتی:

- چارەسەری دەردی ئێوە بە من گەیشت. من ئێستا دەیدۆزمەوە.

- چۆن دەیدۆزیتەوە؟

- تەلەفۆن بۆ ماڵی دەکەم.

- برا گیان، ئێمە لە سبەینێ تا ئێواری نۆبەتمان لە ماڵی گرت، هیچ ناچێتەوە ماڵێ.

- ئێوه سەبرەکم لێ بگرن.

-خاوەنی قاوەخانەکە تەلەفۆنی بۆ ماڵی (زەبووك زادە) کرد:

- ئێرە ئەنجوومەنی شووراى میللییە. (ئیبراهیم بەگ) لە ماڵەوەیە؟

(زەبـووك زادە) یەکسـەر هاتـە سـەر تەلـەفۆن!! خـاوەنی قاوەخانەکـە یەکسـەر دەسکی تەلەفۆنی دایەدەست (ئیحسان تەقاویت)و ئەویش دەستی بە قسە کرد:

- سەلام (ئیبراهیم بەگ)، سوپاس بۆ خودا تۆم دیتەوە. من (ئیحسان)...

(زەبووك زادە) بە رەڵای دەنگی لە تەلەفۆن دەهات:

- ئۆ!! (ئیحسان) گیان، بە خێر هاتی! خێرو بەرەکەتت هێنا. ئەوە کەی هاتی؟!

- (ئیبراهیم ئاغا)، ئێمە دەستەیەکین. پێش چەند رۆژێ هاتین‌و خەریك بووین بە دوای تۆدا دەگەڕاین.

- چ دەڵێی بابە، سەیرە!! الله اکبر! ئەی مـن ناونیشانی ماڵەوەم پـێ نـەدابوون؟ باشە چۆن نەتاندۆزییەوە؟ وای وای!! بەدبەختینە! زوو تەشریف بێنن. لـە ماڵـەوە چاوەڕێتان دەکەم.

ئەوەندەی نەما بوو سەرم ببەمە بن دەسکی تەلـەفۆن‌و چـەند جوێنێکی تـەڕو تـازەی بـدەمێ. بـەڵام دیسـان سـەلەواتێکم لێ دا. هەسـتاین چـووینە مـاڵی. یـەك پێشوازی لێ کـردین، هـەر خـوا بزانـێ! یـەکێکی مـاچ دەکـرد، باوەشـی بـە یـەکێ دا دەکرد!! دایکی لە خۆی زیاتر میهرەبانی لەگەڵ کردین.

(زەبووك زادە) دووبارە دەستی بە هەمان تەلەکەبازی پێشوو کردەوە:

- هـەموو کـاری دەوڵـەت مـن ئـەنجامی دەدەم. بـە بـێ پرسـی مـن هـیچ ئیشـێك ناکرێ.

بەدبەخت ئەوەندەی ئـەقڵ داوە بـە دەوڵـەت، ئـەقڵی بـۆ خـۆی نـەماوە. هـەموو کارەکـانی دەوڵـەتی پێـك هێنـاوە، بـەڵام بەنـداوو کارخانـەو راکێشـانی ئـاو بـۆ شارۆچکەکەمان هیچ باسی نییـە. هـەر باسیشی نـەکرد. ئـەی ئێمـە بۆچی هاتینـە ئێرە؟

ئەوەندەمان قسەی بێ سەرو بەر کرد تا بوو بە شەوو کاتی چوونەوە ئوتێل دا هات؟

- باشە جەنابی (ئیراهیم بەگ)، ڕوخسەتمان بدە مرەخەس دەبین!

- ئەوە چ دەڵێن؟ ئەوە چ قسەیەکە؟ من چوار ساڵ، یەك جار ئێوە دەبینم. ئەویش دەتانەوێ بڕۆن؟ ئەگەر لێ بگەڕێم بڕۆن، خەڵك چ دەڵێن؟ ئەم شەو دەبێ بتانبەم ئەنقەرە ببینن.

حۆی پیش کەوتو ئێمەیش کەونیە شوێنییەوە. لە ماڵەوە دەرچووین. یەك ترومبێل بەشی نەدەکرد، دوو ترومبێلمان گرتو سوار بووین‌و ڕۆیشتین. (زەبووك زادە) پارەی خوردەی نەبوو. (ئەمین بازرگان) پێی گوتم:

- کورە، پازدە لیرە بدە لێخوڕەکە پاشان حیسابی دەکەین.

پارەکەم داو چووینە مەیخانەیەك. پێشخزمەتەکان جلی سەیرو سەمەرەیان لە بەر بوو. هەر هێندە چاویان بە (زەبووك زادە) کەوت، تا ناوقەد چەمانەوەو ئیکلامیان کێشا...

(زەبووك زادە) وەڵامی ئەوانی وەردەگرتەوەو ئاوڕی لە ئێمە دەدایەوە.

- دەبینن؟ ئەمانە هەموو ئەمن دەناسن!!

لە دڵی خۆدا گوتم: کابرا ئێمەی بە کەر داناوە. ئێ، گارسۆن ئەرکی ئەوەیە ئیکلام بکێشێ.

ئاخیری لەوێ خواردمانەوەو مەست بووین. (زەبووك زادە) چاوی داگرتو گوتی:

- ئێستا هەستن بچین کەمێکیش رابوێرین!!

گارسۆن وەسلی حیسابی هێنا. هەموومان دەستمان لە گیرفانمان را کرد جزدانی پارەمان دەرهێنا. هەرکەس بەوانەی تری دەگوت:

- ئەتۆم بمرێ، نابێ!!

- لێ ناگەڕێم تۆ پارەکە بدەی!!

- بە سەری تۆ نابێ!!

(زەبووك زادە) هاواری كرد:

- سەبر كەن! بەلاش خۆتان مەپچڕنەوە.

بە قیافەیەكی تایبەتی هەزار لیرەییەكی دەرهێناو فڕێی دایە سەر مێز.

- ئەرێ بەخوا كابرا بۆتە چتۆ ئاغا؟!

گارسۆن پارەكەی برد. دوای نەختێ هاتەوە: زۆر داوای بووردن دەكەم، خوردەمان نییە. تكایە خۆردەمان بدەنێ.

(زەبووك زادە) لە گیرفانەكانی گەڕا. وای!! دادو بێداد دەبینێ پارەی خوردەی پێ نییە!!

(ئەمین بازرگان) ئاوڕی لە لای من دایەوە:

- تۆ حیسابگری. ئەمەیش بدە. پاشان حیسابی دەكەین....

من لەو زرنگترم... كە ئەم قسەیەی كرد. من وەكوو یەكێ لە سەر هەق بێ، گوتم:

- تۆم بمرێ نیمە... ئێوە لوتف بفەرموون پاشان حیسابی دەكەین.

(ئەمین بازرگان) ناچار بوو پارەكە بدا... لەوێ هاتینە دەرەوەو سواری ترومبێل بووین. لە بەر ئەوەی (زەبووك زادە) پارەی خوردەی نەبوو، ناچار بووین پارەی لێخوڕەكانیش بدەین. ئەم جارە چووینە شوێنێ رێك وەكوو بەهەشت وا بوو. ژنی نیوەڕوو قووت لە بەر دەستو پێیان دەهاتنو دەچوون. ئێمە، تا ئەو شەوە مەیخانەو ئەو شتانەمان نەدی بوو، ئیحسان تەقاویتیش كە دەیگوت گوایە هەموو كەلێنو قوژبنێكی ئەنقەرە شارەزایە، گوتی:

- منیش تا ئێستا ئاوهام نەدیوە...

(مەلا بەدر) ئەوەندە واقی وڕما بوو، ئەگەر ئەنگوستیشت بڕبوایە، ئاگای لێ نەبوو. گارسۆنەكان دوو مێزیان دایە پاڵ یەكو دانیشتین. (زەبووك زادە) پرسی:

- جەنابینە، هەرچی دەتانەوێ بخۆنەوە. بەینی برادەران (دەفەرموو دەی) پێ ناوێ. من لە پڕ گوتم:

- ویسکی.

جەنابی (هەمزە)یش هەر هێندە ئەم وشەیەی لە زاری من بیست، گوتی:

- منیش ویسکی دەخۆمەوە.(ئەمین بازرگان) بە خەندەیەکی تایبەتی گوتی:

- پیاو دەبێ لەگەڵ رای زۆرینەدا بێ... منیش ویسکی دەخۆمەوە.

(مەلا بەدر) پرسی:

- فیسکی چییە؟ پیاوی تەواو ئەو جۆرە شتە بی نرخانە ناخواتەوە!

(ئیسماعیلی بەندەی خودا) سەری لەقاند.

- پیاو نابێ رێو رەچەڵەکی خۆی لە بیر بکا. من موخلیسی ئەو ئارەقە شێر شکێنەم کە باوکو باپیرانمان دەیانخواردەوە. من فیسکی .. میسکی بە میشکمدا ناچێ.

(ئەمین بازرگان) لە تەنیشت (ئیحسان تەقاویت) دانیشتبوو. بەردەوام لە قەپرغەی دەداو لە سەرەخۆ دەیگوت:

- توخوا، پێیان بڵێ زوو بێنن!! ئەویش ئەو مەشرووبە گرانبەهایە! کابرا هەزار لیرەییەکی لە گیرفانیدایە. ئەگەر حیسابەکەمان کەم بێ، دیسان دەبێ ئێمە بیدەین!!

دیتم راست دەکا. دەستمان بە خواردنەوە کرد. وەکوو ئاو ویسکیمان لە ناو پەرداخ دەکردو بینمان پێوە دەنا.

(مەلا بەدر) گوتی:

- من هیچ لەو فیسکییە ناگەم. پێیان بڵێ شیری شێر بێنن.

لە پڕ نەمانزانی کێ خەبەری ناردبوو هەر هەندەمان زانی دەورو بەرمان پڕ خانمی جۆراو جۆر بوو...

(ئیسماعیلی بەندەی خودا) بە هاتنی ژنەکان زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی:

- باش بوو!! حیسابەکەمان دەگاتە هەشت سەد، نۆ سەد لیرەو هەزار لیرەییەکەی (زەبووك زادە) خورد دەبێتەوە.

(مەلا بەدری ئاقلمەند) هەموو ئەقڵو هۆشی لە دەست دابوو. خانمێکی قژ سیس خەریك بوو دەستی بە ریشی مەلا دادەهێنا. دیار بوو فریوی دا بوو:

- جەنابی حاجی، من سیغە ناکەی؟

(مەلا بەدر) ئەوەندەی خواردبووەوە، حەرامو حەلاڵی لە یەك جیا نەدەکردەوە... ئەو ژنەیش کە تووشی من ببوو، زۆر خڕو پڕ بوو. هەم رستانی بووو هەم هاوینی. دەستم لە هەر شوێنێکی دەدا ناو لەپم پڕ دەبوو. دوا شت کە بە بیرم دێتەوە، ژنەکە دەستی گرتمو بردمییە ناو لۆج.

- وەرە ئازیز گیان.

ئیتر دوای ئەوە چی بوو؟ نازانم. کە چاوم کردەوە، دیتم لە ئوتێلەکەی خۆمان، لە ناو نوێن کەوتووم. دەرگای ژووری تەنیشتم کردەوە. دیتم هاوڕێیان پرخو هۆڕیانە. بە خەبەرم هێنان:

- یاللا!! کوڕینە، هەستن. ئێمە هاتووین لێرە بخەوین؟

هەر کەسە لە خەو رتدەپەڕی لەوەی تری دەپرسی:

- ئەوە ئێمە لە کوێین؟

- چۆن هاتینە ئێرە؟

- کێ ئێمەی هێنایەوە ئوتێل؟

- هیچێکمان لە بیرمان نەبوو، ئاخیری چ ببووو کێ ئێمەی هێنابووەوە ئوتێل... جەنابی (مورتەزا) گوتی:

- توخوا وازم لێ بێنن!! تاقەتی جوولانەوەم نییە!! هەمووومان وەکوو ئارووییەکی لە ناو قەرابەی تورشیان نابێ، لیك هەڵوەشابووینەوە. دیتمان (مەلا بەدر) دیار نییە:

- کوڕینە، (مەلا بەدر) چی لێ هاتووە؟

(ئەمین بازرگان) چووه ئاودەست. زۆری پێ نەچوو بە لەسەرو سنگدان هاتەوە:

- کوڕینە، گیرفانیان بڕیوم!!

دەنگی وا هەڵبڕی بوو، هەر لە ژنی منداڵ مردووی دەکرد. میوانەکانی ئوتێل لە دەوررەمان کۆ بوونەوە. (ئەمین بازرگان) بەردەوام هاواری دەکرد:

- ئەمە چ وەزعێکە!؟ ئەمە چ وڵاتێکە؟! نە پۆلیس هەیە، نە ئاسایش!! نە کارمەندی ئاگاداری!! هاوار سووتام! بەدبەخت بووم!! چندە رووتیان کردم! لێ ئەگەڕان پێنج فروشم لە گیرفان بمێنێ!

(ئیسماعیل بەندەی خودا) بەرۆکی گرتو رایکێشایە لاوە:

- جەنابی (ئەمین) بێدەنگ بە! ئەگەر رۆژنامەنووس بزانن، دێنو دەنگو باسمان بڵاو دەکەنەوەو دەنووسن (ئەو شاندەی بۆ داواکاری ئاوبەندو کارخانە هاتبووە ئەنقەرە لە مەیخانە رووتیان کردوون. ئەو وەختە حەیاشمان دەچێ. رووی گەڕانەوەی شارمان نامێنێ. توخوا، نەختێ بێدەنگ بە!

- چۆن بێدەنگ بم؟! هەشت سەد لیرە پارەیان بردووم. ئەو بێناموسانە هیچ دینو ئیمانو ویژدانیان نییە. ئەو بێ غیرەتانە بای یەك پاکەت جگەرە پارەیان لە گیرفان نەهێشتووم!!

- بابە، ئابڕوومان مەبە!! کە گەیشتینەوە شار رۆژێ، یەگ گلۆزە جگەرەت دەدەمێ!!

(ئیسماعیل ئاغا) دەیەویست (ئەمین بازرگان) کڕ بکاتەوە. دەستی بردە گیرفانی بۆ ئەوەی ... دیتی ئەویش هیچ پارەی لە گیرفاندا نەماوە. وەکوو فرفرۆك بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوەو هاواری دەکرد:

- مەسلمانینە، رووتیان کردووم! پارەیان بردووم! بەدبەخت بووم!

منیش لە خۆم کەوتمە گومان. دەستم لە گیرفانم راکرد بزانم منیش بەڵایەکم بە سەر نەهاتووە؟ لە پڕ لە جێی خۆم وشك بووم. بەڵێ پارەی منیشیان بردبوو. دەستم بە هاوارو(وای...وای...وای...) کرد. ئێمە شیوەنو زاریمان دەکردو لە سەری

خۆمان دەدا، خاوەنی ئوتێلو ئەفەرەکان تریق تریق پێدەکەنین!! بە کورتی لای خەڵکی ئەنقەرە بە تەواوی رسوا بووین.

جەنابی (هەمزە) گوتی:

- کورینە، تازە ئێرە جێگای ئێمە نییە!! با بچینەوە شاری خۆمان!!

- پارەی گەڕانەوەمان نییە.

جەنابی (هەمزە) پیاوێکی بە هووردە بوو. کیسەکەی لە بن قۆڵی چاکەتی دووری بوو.. زنەکان جێگای پارەکەیان پێ نەدۆزرابووەوە... زۆر بە شانازیو بوغرایی گوتی:

- من پارەم هەیە بە قەرز دەتاندەمێ.

ئەی (مەلا بەدر) لە کوێیە؟ وا باشە لێرە جێی بێلینو بڕۆین.

(ئیسماعیل ئاغا) بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە:

- بێ شك (مەلا بەدری ئاقڵمەند) لە ئەشقی ئەو خانمە ئەقڵی لە دەست داوەو رەوانەی شێتخانە کراوە!!

لەو باسو گفتو گۆیەدا بووین، (مەلا بەدر) بە ئاە ناڵە هاتەوە. سەرو کەللەی بەستڕابووەو کراسی جیڕ بە جیڕ ببوو. کە هاتە ژوورەوە، خۆی فڕێدایە سەر کورسی... گوتم:

- مەلا، ماڵ خراپ، ئەمە چ وەزعێکە!؟

(مەلا بەدر) بە هاوار وەڵامی دایەوە:

- کورینە، گەردەنم ئازا کەن. باوەڕ ناکەم تا سبەینێ بمینم!!

- ئەمە چ قسەیەکە، مەلا؟ خوا نەکا!

- نا. هاوشارییە ئازیزەکانم، کار لەوە تێپەڕیوە!! ئیتر عومرم تەواو بووە!!

- مەلا، وا بزانم لێدانت خواردووە!

-بەخوا، تاقەتی قسە کردنم نییە. هەر ئەوە دەڵێم یەك دەستە زەلام تێم وەرهاتنو لێیان دام. ئەویش چ لێدانێك!! بە دارو تۆپز!! یەکێ ماندوو دەبوو،

یەکێکی تر لێیدەدام!! یەکێ دەستی دەئیشا تۆپزەکەی دەدایە یەکێکی تر. ئەوەی ئێسکی ساغ بێ لە گیانم نەماوە!!

- باشە، بۆچی لێیانداى؟ چییان دەویست؟!

- چییان بویستایە؟ پارەیان دەویست. پارە!! ئەو ئارەقە وەزعی تێکدام. کە دوا پێکم خواردەوە، لە هۆش خۆم چووم. لەگەڵ دارکاری هاتمەوە هۆش خۆم!! یەکێ دەیگوت:

- زوو کە، پارەکەت دەربێنە!!

- پارەی چی؟

- وەسلی حیسابی مەیخانە لای تۆ ماوە.

ئەو وەسلەی دەیگوت سێ هەزار لیرە بوو. گوتم:

- بابە، چمان خواردۆتەوە، ئەوەندە دەکا؟

یەکێ تۆپزێکی وای خێواندە پشتم، دەنگم لە گەرووم نووسا. برادەرەکانت بێ ئەوەی حیسابەکە بدەن رۆیشتوون. ئێوە رۆیشتبوونو منیش تووش هاتم. دیتم هیچ چارەم نییە. جزدانم دەرهێناو لە بەر دەمم دانان.

- ها! ئەم جزدانە بۆ ئێوە. من لەوە زیاترم نییە.

دوو سەدو پەنجا لیرەیان لە گیرفانم دەرهێنا. گوتیان:

- پیرە سەگ، پارەکە بدە نەوەك هووردو هەڕات دەکەین!!

- ئەگەر بمسووتێنن‌و مشکییەکەم بە با بکەن، لەوە زیاترم نییە.

گوتیان:

- حاجی ناکەس بەچە، ئێمە ئێوە باش دەناسین. چەند کەسێکی وەکوو تۆمان بەسەردا تێپەڕیوە. یاللا پارەکە دەربێنە، بزانم!

- وەللا... وەبیللا.. نیمە. بەخودا، نیمە!!!

بەڵام گوێیان بە قسەکەم نەدا. هەر تۆپز بوو بڵند دەبووو بە پشت‌و شانم دەکەوت. دیتم نەخێر، ڕێگای هەڵاتم نییە. گوتم:

- سەبر کەن! لێم مەدەن تا بتاندەمێ. کەمێ پارەم بۆ کفن‌و دفن پاشاکەوت کردبوو. لە ناو قۆڵی سەلتەکەم دورووبووم، دەوری پێنج هەزار لیرە دەبوو، دەرم هێناو بۆم هاویشتن.

- حیسابی خۆتان بگێڕنەوەو ئەوەی ترم بدەنەوە. ئەمە پارەی کفن‌و دفن‌و فاتیحەیە!!

بێ ویژدانانە هەموویان برد.

- پیرە سەگ، پێنج هەزار لیرە، بووە بۆ کفن‌و دفن؟...

دووبارە کەوتنەوە لێدانم.

- یاللا پارە دەربێنە!!

- بابە، تەواو، هیچ نەماوە!! وەرن سەراپای گیانم بپشکنن.

- ئێمە باشت دەناسین. پارە لە جێی وا دەشاریتەوە، ئەقڵی ئەجندەیش ڕێی پێ نابا.

- دیتم ئەگەر پارە دەرنەهێنم، ڕۆحم لە ژێر دارو تۆپز دەردەچێ. هەندێ پارەم لە ناو نیفۆی شەلواردا بوو، ئەویشم دەرهێناو پێمدان‌و گوتم:

- ها بگرن. بەڵام ئەگەر (زەبووك زادە) بزانێ، هەمووتان لە ناو دەبا.

- (زەبووك زادە) کێیە؟!

- نوێنەری ئێمەیە.

- بڕۆ. لەعنەت لە خۆت‌و لە نوێنەرت!! هەستە. زوو لێرە بزر بە!!

بە سەرەسمك فڕێیاندامە دەرەوە. بە پرسیاران‌و بە زەحمەت هەتا خۆم گەیاندەوە ئێرەو تا چل‌و هەشت سەعاتی تر لە سەر ئەم چوارپایە هەڵناستم.

(ئیحسان تەقاویت) گوتی:

- بۆچی سەرو دەم‌و چاوت بەستۆتەوە؟

دەستی بە تکاو پاڕانەوە کرد:

- توخوا، هەقتان بە سەر دەم‌و چاوم نەبێ!!

لەفافمان لە دەمو چاوی کردەوە. چ ببینین باشە؟! ئای... وای... (مەلا بەدر) ریش و سمێڵ و برژانگ و برۆی هیچ نەما بوو. دەمو چاوی دەتگوت کەللەی مەڕە. یەك پارچە سپی بوو.

- مەلا، ئەمە چ بەزمێکە!؟

- هەر لێ گەڕێن، هاوڕێیان! ئەو بێ شەرەفانە دەردێکی وایان پێ کردم هەر مەپرسە!! دەست و پێیان بەستم. لە تەوقی سەرمەوە تا بنی پێم، نوورەیان لە هەمووی دا.!

- ئەی ئێستا تەگبیری چییە؟!

مەلا چاوی پڕ فرمێسك بوو. گوتی:

- هاوڕێینە، من ئیتر بە سەلامەتی نامێنم. شەلوارم لە پێ بکەنەوە کیسەیەك لە ناوپیستێری شەلوارم هەیە لە بەر چاوی هەمووتان کیسەکە بکەنەوە. ئەگەر مردم، با جەنازەم لە وڵاتی غەریبی نەمێنێ، ئەم پارەیە تا شاری خۆمان بەش دەکاو بایی مەسرەفی کفن و دفن و فاتیحەیش دەکا. تەنیا ئەو تکایەم هەیە: وا مەکەن کەس دەمو چاوم ببینێ و ئەم نهێنییە بۆ کەس باس مەکەن.

بەڵێنمان پێدا. بۆ سبەینەی رۆژی پاشەکەن گەڕاینەوە شار. یەکەمین ئیشمان ئەوە بوو دەستوورمان دا (عوسمان قەساب) گوێرەکەیەکی سەربڕی و کەوڵی کرد. مەلا بەدرمان لە پێستەکە گرت و لێومان دووری. دوای حەفتەیەك، مەلایان لە نلو پێستەی گوێرەکە دەرهێناو بردمانە حەمام. لە حەمام نارەقەیەکی باشی کرد. جوان شووشتمان و چڵك و قرێژمان لە لەش کردەوە. ئیتر لە مردن رزگاری بووو عزرائیل بەرۆکی بەردا. دوای ئەوەیش مەلا دوو مانگ لە ماڵەوە کەوت و سمێڵ و برۆی هاتەوە.!!

کاتێ لە ئەنقەرە هاتینەوە، دیتمان فەرماندارەکەمان گوازراوەتە بۆ جێگایەکی دی.جەنابی میرزا (رمزا) لە جیی ئەو ببوو بە وەکیلی فەرملندابیی.

مانگێـك بـه سـەر ڕۆیشتنی فەرمانـدار تێپـەڕی، (زەبـووك زادە) نامەیـەكی بـۆ (هەمزە جووت بەدزادە) نارد. نووسیبووی:

- لـه بـارەی فەرمانداره‌كەتانـەوە، كـه سـوورن لـه سـەر ئـەوەی دەبـێ بگـۆڕێو شكاتتان لێ كردبوو، دوێنێ قسەم لەگەڵ وەزیری كشتو كاڵ كرد.، گوتم: یـان ئـەو فەرمانداره بگۆڕە، یان لەگەڵت تێك دەدەم.

خوا عەمر درێـژی كـا، قسـەی نەشـكاندم. بـەڵێنی داوە لـه مـاوەی یـەك حەفتـه بیگۆڕێ. لەوانەیه دادگاییشی بكا. ئیـنشاڵڵا فەرمانداریێكی باشتان بـۆ هەڵدەبـژێرم!! تاقی بكەنەوە. ئەگەر دیتتان باش نییه، بۆم بنووسن، ئەویش ڕەت دەكەمەوە!! 1

له خوای به زیاد بێ، فەرمانـدار له وڵاتەكەمانـدا وەكـوو نـۆكو كشمیش ڕژاوە!! لـه بـارەی دروسـت كردنـی ئاوبەنـدو كارخانـەو قـیرو سەرچـاوەی ئـاویش هـیچ ناڕەحەت مەبن! بووجـەی هـەر هـەموو بەرنامـەكانم دابـین كـردووە. بـەم نزیكانـه دەسـت پـێ دەكـا، بـه تایبـەتی كارخانەیـەكی گـەورەی تواندنـەوەی ئاسـنم بـۆ ئێـوە داناوە... بەم زووانه كارخانەكه دادەمەزرێنین. ئەو دووكەڵەی لـه كارخانەكـه دێتـه دەرەوە، چاوی ناحەزان كوێر دەكا.

زۆر سەرمان له خوێندنەوەی ئەو نامەیه سوڕما. ئێمـه شـكاتمان لـه فەرمانـدار نەكردبوو. داماوە تەنیا لـه ماڵـەوە دەچـووە دایـەرەو لـه دایـەرە دەگەڕایـەوە مـاڵێ، لەوە زیاتر قەت نەدەچووە هیچ شوێنی تر.

جەنابی (هەمزە جووت بەدزادە) گوتی:

- مـن دەزانم نەخشـەی نـوێی (زەبـووك زادە) چییه؟ بـه نـاوی ئێمـه شـكاتی نووسـیوەو لـه ژێـرەوە مـۆری كـردووەو داویـەتی بـه وەزیـر. ئێسـتا ئـەم نامەیـەی نووسیوە بۆ ئەوەی ئەگەر تۆژەرەوەیەك پرسیاری له ئێمه كرد،

بڵێین بەڵێ، ڕاسته.

دوو سێ رۆژ دوای نامەکەی (زەبووك زادە)، فەرمانداری نوێ هات. سیمای ئەوەندەی تووڕەو رووی ئەوەندە گرژ بوو، پیاو حەزی نەدەکرد پارەیشی لەگەڵ بەش بکا.

هەر لە رۆژی یەکەمییەوە سنگی خۆی باش داکوتا. فەرمانی دا کورسییەکانی ژوورەکەی هەڵبگرن بۆ ئەوەی خاوەن کار ناچار بن بە پێوە بوەستن!! وەڵامی سەلامی هیچ کەسی نەدەدایەوە تا بە چاك‌و چۆنی رادەگا.

دیتمان ، با. ئاوها نابێ... زۆر خراپ تێ کەوتووین. بە لاویو ئیمان گەیاند ئەگەر خۆی چا نەکا، لای (زەبووك زادە) شکاتی لێ دەکەین. دەزانن چی وەڵام دایەوە؟

- من (زەبووك زادە) ناناسم. (زەبووك زادە) نوێنەرە، بۆ خۆی نوێنەرە!! من نمایندەی دەوڵەتم، هاتوومەتە ئێرە ئێوە بکەمە ئینسان. هەر کەس قسە لە خۆی گەورەتر بکا، زمانی دەبڕم!!

- بڕیارمان دا مەسەلەکە بۆ (زەبووك زادە) بنووسین. بۆ ئەوەی تەمبێی بکا. جەنابی میرزا (رەزا) گوتی:

- نەختێ سەبر بگرن... من باشتر لە زمانی دەگەم. ئەوەی من بزانم ئەو کابرایە بەرتیلخۆرێکی نمرە یەکە!! لەگەڵ خۆی پێك بێین باشترە لەوەی مەسەلەکە بە سەرەوە بگەیەنین.

ئەو جۆرە کەسە هەر هێندە بگەنە جێگایەك دەست بە (ئالدرم بلدرم) دەکەن. راستییەکەی دەیانەوێ خۆیان بسەپێنن. نەختێ سەبر بگرن وەکوو مۆم نەرم دەبێ.

- برا، ئەوە هیچ نییە... با ئەو داوا بکا تا ئێمە بیدەینێ. هەڵبەت ئەویش مەسرەفی دەوێ... ئێمە لە خوامان دەوێ فەرمانبەرێك داوایەکی هەبێ. بەرتیل وەربگرێ‌و کارەکانمان ئەنجام بدا. حەلاڵی بێ. کەلکی چی هەیە فەرمانبەر تەنیا بڕیارو یاسا بە رووی پیاودا بکێشێ.

قسەکەی جەنابی میرزا (رەزا) راست بوو. هێشتا مانگێك پێ نەچووبوو، فەرماندار نەرم بوو. وای لێ هات لە عومری خۆمان فەرمانداری وا باش‌و بە سوودمان نەدی بوو.

جاران، ئەگەر یەك ساڵ لە بەر دەرگای فەرماندار بخەوتبای، ئیشیان نەدەڕواندی، بەڵام ئێستا بە ماوەی دە دەقیقە ئیشت جێ بە جێ دەبێ. ئەم جەنابی فەرماندارە هەر هیچ (نا)و (نابێ)ی بە سەر زماندا نایێ. کارمەندەکانی فەرمانداریش زات ناکەن بە ناوی (یاسا رێ نادا)و (پێچەوانەی ڕێنماییەکانە) خەڵك بێنن‌و ببەن!!

فەرماندار هاواریان لە سەر دەکا:

- پێویستە کاری هاوڵاتیان بڕوا. یاسا یانی خزمەت کردنی مرۆڤ!!

کابرا ئەوەندە باش بوو، خەڵك وەکوو دایك‌و باوکی خۆیان خۆشیان دەویست. ڕۆژێ، هەموو خەڵکی لە دەوری خۆی کۆ کردەوەو گوتی:

- دەمانەوێ یاسای چاك کردنی کشت‌و گاڵ جێ بە جێ بکەین. زەوی بدەین بە جوتیاران.

- هەرچی زەوی دەوڵەت هەبوو هەمووی بە سەر جوتیاراندا دابەش کرد. پیاو هەبوو، چل ساڵ بوو لە سەر زەوی‌و موڵکی خۆی لەگەڵ دەوڵەت لە کێشەدا بووو نەیدەتوانی زەوی باوك‌و باپیرانی وەربگرێتەوە، کەچی ئێستا بە ماوەی یەك دەقیقە ئیشەکەی پێك دەهات. هەموو خەڵك دوعایان بۆ فەرماندار دەکرد.

ڕۆژێ لە پارت کۆنفراسمان هەبوو، باسی هەموو شتێکمان دەکرد. (مەلا بەدری ئاقڵمەند) گوتی:

- هاوڕێیان، روخسەت بدەن شتێکتان پێ بڵێم: من هیچ سەرم لە کارەکانی ئەم فەرماندارە دەرناچێ!!

مەلا، تازە ریش‌و سمێڵی هاتبووەوەو وردە وردە دەهاتە ناو خەڵك. پرسیم:

- مەلا، بۆچی؟ کارەکانی فەرماندار چۆنن؟ تۆ سەریان لێ دەر ناکەی؟!

- ئیشی وا دەکا بە مێشکی مرۆڤدا نایە! ئێوە هەرچی دەڵێن، بڵێن، من لەو کابرایە بە گومانم. ئەو کابرایە نابێ فەرمانداری راستی بێ!!

- ئەوە چ قسەیەکە، مەلا؟

بەڵێ ، فەرمانداری راستی نییە. یانی ئەو پیاوە بە رەسمی لە لایەن دەوڵەتەوە لێرە دانەمەزراوە. فەرمانداریك لە لایەن دەوڵەتەوە بێ، ئەوەندە باش نابێو رەفتاری لەگەڵ خەڵك ئەوەندە پیاوانە نابێ!! بۆیە بە لای منەوە، ئەم ماست موویەکی تێدایە.

- ئاخر بۆچی؟

- بۆچیو مۆچی نییە!! ئەوەیە کە گوتمو تەواو!! ئەم کابرایە فەرمانداری راستی نییە. وەسسەلام!!

- مەلا نەختێ هێواشتر قسە بکە! خوا نەکا، قسەکەی پێ دەگاتەوە.

ئەم مەسەلەیە بەو جۆرە مایەوە. فەرماندار بە سەنگینی خەریکی کارەکان بوو. زەوی دابەش دەکرد. شوێنی دوکانو خانووی بە خەڵك دەبەخشی. رۆژێ پارێزگار کارێکی بە پەلەی دەبێ، تەلەفۆن بۆ فەرمانداریی دەکا. ئەو کاتە فەرماندار لە ژوورەکەی خۆی نابێ. جەنابی میرزا (رەزا) تەلەفۆن هەڵدەگرێ. لە کاتی قسە کردندا دەڵێ:

- جەنابی فەرماندار تازە چووە دەرەوە.

کە جەنابی (رەزا) ئەم قسەیەی لە دەم دێتە دەرەوە، پارێزگار هاوار دەکا:

- فەرمانداری چی؟ ئەی فەرماندارمان لەوێ لا نەبرد؟!

- قوربان ئەو رۆیشت. فەرمانداری نوێ دەڵێم!1

- فەرمانداری نوێ کەنگی هاتووە؟

- دەوری سێ مانگ دەبێ، قوربان!

- بەخوا بابە، سەیرە! من ئاگام لە هیچ نییە!! ئەی ئێستا لە کوێیە؟

- چووە زەوی بە سەر خەڵکدا دابەش بکا...

- زەوی چی دابەش دەکا!؟

- سەراپای زەوییەکان بە نرخێکی زۆر کەم بە سەر خەڵکدا دابەش دەکا: ناو بازاڕ، گۆڕەپانی شارۆچکە، دەوروبەری مزگەوت، گۆڕستانەکان. هەمووی داوە بە خەڵك!!

پارێزگار واقی وڕما!

- من سەرم لەم ئیشانە دەرناچێ! مەگەر گۆڕستانیش دابەش دەکرێ؟!!

- قوربان ئەو فەرماندارە، (زەبووت زادە) لە پایتەختەوە ناردوویەتی. پارێزگار بە وڕیو بێ بایەخی وەڵامی دایەوە:

- زۆر باشە، من بەیانی خۆم دێمە ئەوێ.

بەیانی بەرە بەری نیوەڕۆ، پارێزگار هاتە شارۆچکەکەمان:

- کوا ئەو فەرماندارە؟!!

فەرماندار وەکوو پارچە سەهۆڵێکی هاوین توابووەو بە ناخی زەویدا چووبوو. ئەوەندەی بە دوایدا گەڕاین هیچ خەبەری نەبوو. کەس نەیدەزانی کەنگی دەستی دابووە جانتاو کڵاوی و رای کردبوو.

گوتمان:

- قوربان، بۆی هەیە (زەبووك زادە) داوای کردبێ و بە کارێکی پەلە چووبێتە ئەنقەرە. پارێزگار تووڕە بوو. بە هاتو هاوار چوو بۆ ئەوەی کاری پێویستی بەرامبەر بکا. ئێمەیش برووسکەیەکمان بۆ (زەبووك زادە) لێدا: ( ئەو فەرماندارەی ناردبووت بزر بووە.) وەڵامی برووسکەکەی دایەوە: (من هیچ فەرماندارم بۆ ئێوە رەوانی نەکردووە. جەنابی میرزا (رەزا) بۆ ئێوە لە هەموو کەس باشترە.)

بە کورتی، ئێمە هیچ سەرەدەریمان لەو کارانە نەدەکرد. بە رێکەوت ئەو رۆژە رۆژی هاتنی رۆژنامە بوو. بەرید هاتو رۆژنامەفرۆش بەستەی رۆژنامەی وەرگرتو بە سەر خەڵکدا دابەشی کرد. ئێمە لە قاوەخانە دانیشتبووین. هەر

کەسێ تەماشای رۆژنامەی دەکرد، (ئاخ..و.. واخ..و..ئاه..)ی لە دەم دەهاتە دەرەوە. وەکوو یەکێ کارەبا لێیدا بێ لە جێی خۆی وشك دەبوو. سەرم لە هەڵس‌وکەوتی خەڵکەکە سوڕما. رۆژنامەکەم وەرگرت، بزانم مەسەلە چییە!! چ ببینم باشە؟ وێنەیەکی فەرمانداری ئێمەی چاپ کردبووو لە ژێرەوە نووسیبووی: (فەرمانداری ساختە دەستگیر کرا.)

بەڵێ، جەنابی ئازیز، چل ساڵ یەك جار فەرمانداریکی باش هاتە ساروچکەکەمان ئەویش ساختە دەرچوو. ئەگەر کار هەر بەوەندە تەواو ببوایە باش بوو. سەراپای تۆژەرەوانی دەوڵەت رژانە ناو شارۆچکەکەمان. سێ کەس لەو کارمەندانەی لە فەرمانداریی کاریان دەکرد دەستگیر کران. فەرمانداری ساختە ئیشی پێ کردبوون. لە بەر ئەوەی جەنابی (رەزا) ئاقڵ‌و دونیادیتە بوو، بەرەی خۆی بە پاك‌و تەمیزی لەو ناوە دەرهێنا. ئێمەیش ددانی خۆمان تیژ کردبووەوە چاوەڕێی (زەبووك زادە)مان دەکرد.. ئەگەر بکەوتایە بەر دەستمان، هەر بە خاوی دەمانخوارد! ئەو بەزمەی ئەو بێنامووسە بە ئێمەی دەکرد لە هیچ شوێنێکی دونیادا نەبووە.

مەلا بەدر گوتی:

- ئاخر ئەو بێنامووسە ئێستا کە بۆتە نوێنەر نابێ سەر لێرە بدا!! ئەگەر پێی بێرە بکەوێ، قەلەمی پێی دەشکێنم.

ئێمە ئەم قسانەمان دەکرد بەڵام هەوڵمان دەدا نەکەوێتە بەر گوێی ناحەزان. پەندێکی پێشینانە دەڵێ: (دەستی شکاو ئۆباڵی بە ئەستۆیە.)

بە هەر حاڵ، هەر چۆنی بێ (زەبووك زادە) لە خۆمانە.. ئێمە خۆمان هەڵمانبژاردووە... چۆن بە بێگانان بڵێین غەڵەتمان کردووە... رۆژێ سەر لە بەیانی، بیستمان (زەبووك زادە) نیوە شەو هاتۆتەوە. ئەگەر خەبەری جەنگی جیهانیمان ببیسایە، ئەوەندە نەدەحەپەساین!

یەكسەر لە بارەگای پارت كۆبوونەوەمان بەستو دەستمان بە بیروڕا گۆڕینەوە كرد. كە چووینە لای چ بلێینو لە كوێوە دەست پێ بكەین؟. (زەبووك زادە) پەیامی نارد، دوای نیوەڕۆ لە سالۆنی ئوتێل پێشوازی هاولاتیان دەكا.

سەعات دووی دوای نیوەڕۆ، هەموو لەوێ كۆبووینەوە. ناحەزەكانمان پێش ئێمە هاتبوون.جەنابی (برهان الدین)یش هاتبووو لە گۆشەیەك دانیشتبوو. دوای ساعاتێك ئینجا (زەبووك زادە) هاتە ئوتێل. لەگەڵ هاتنی ئەو دەنگی چەپڵەلێدانو هوڕا بەرز بووەوە. یەكەمین كەس كە چەپڵەی لێدا (برهان الدین) بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم:

- هەندێ كەس چەند بێ شەرمو رووقایمن!! ئەو هیچو پووچە سەگبابە كە پاش ملە ئەو هەموو قسە خراپەی پێ دەگوت، سەیر كەن ئێستا چۆن هانی دەدا.

(مەلا بەدر) گوتی

- راست نییە نهێنی خۆمان لای بێگانان ئاشكرا بكەین. ئێمە ئەگەر خراپەكانی (زەبووك زادە) بلێین، ناحەزان بۆ مەرامی خراپ بە كاری دێنن!!

جەنابی (هەمزە) تووڕە بوو:

- مەلا گیان، ئەمە چ قسەیەكە!؟ لە بیرت چوو لە سەر ئەو كابرایە ریشو سمێڵیان تاشیت؟ ئێمە دەبێ قسەی خۆمان بكەین..

(ئیسماعیل بەندەی خودا) گوتی:

- لە سەر ئەو كابرایە، من پارەكەم چوو. پێویستە شەرم بخەینە لاوە.

نا. بابە، كابرا نوێنەری ئەنجوومەنە. لەوانەیە تووشی بەلایەكمان بكا. باش نییە!!

(زەبووك زادە) لەو سەری ژوورەوە دانیشتبوو. بە رووی هەموو كەس دەخەنییەوە. كە هەموو شوێنێ پڕ بوو، دەستی بە قسە كرد:

- هاوشارییانی بەڕێز، بۆ ئەوەی دەردەدڵو داواكارییەكانتان لە ئەنجوومەن باس بكەم، هاتووم بۆ ئەوەی لە نزیكەوە قسەتان لەگەڵ بكەم. هەر كەس، هەر داوایەكی

هەیە، با بە بێ شەرمو بە بێ لە رووداوان باسی بکا. گوێ لە هەمووتان دەگرمو بە پشتیوانی خودا هەمووتان بۆ جێ بە جێ دەکەم. ئەمە ئەرکی سەر شانی خۆمە. چ لە پارتی خۆمان بێو چ لە پارتی تر. بە لای منەوە هیچ جیاوازی نییە. هەموومان خەڵکی یەك وڵاتین.

(ئەمین بازرگان) زۆر تووڕە ببوو:

- توخوا، وەرە تەماشای ئەمە بکە!! جووجەی دوێنێیە رای لە ئێمە نییە.. کابرا هاتووە گوێ لە دەردمان بگرێو لە داواکانمان بپرسێ. کوڕە، ئەی تۆ حەوت حەڵکی ئەم شارۆچکەیە نیت!؟ ئەی تۆ لە ناو ئێمەوە سەرت دەرنەهێناوە؟ هێشتا ئاگاداری دەردی ئێمە نیت؟!!

خەڵکەکە لەگەل هەر قسەیەکی (زەبووك زادە) هەستی خۆیان دەردەبڕیو چەپڵەیان لێ دەدا. (زەبووك) بە جوولەی دەستو سەر سوپاسی دانیشتوانی دەکرد..

- بەڵێ، هاوشارییانی زۆر زۆر ئازیزم، من ئامادەم بە دڵو بە گیان گوێ لە قسەکانتان بگرم. بەڵام منیش یەك داوام لە ئێوە هەیە: یەکەم جار پێویستە ئەو کارە بەسوودو خزمەتگوزارییانەتان عەرز بکەم کە بۆ ئەم شارۆچەیە کردوومە. هاوڕێیان باوەڕ بکەن لە ئەنقەرە یەك دەقیقە بێ کار نەبوویم. شەوو رۆژ، زەحەتم بۆ ئێوە دەکێشا!!چونکە دەمەوێ ئەو قەردەی لە سەر منتانە بیدەمەوە.

بێ گومان بیستووتانە پێش ماوەیەك شاندێکی ئێوە هاتە ئەنقەرە. من پێشوازییەکی باشی شاندەکەم کرد. ئەگەر پێشوازییەکەم کەمو کورتییەکی تێدا بێ، دەبێ بمبوورن. شاندەکەم بردە لای سەرۆك وەزیرانو لە پێش خۆیان داوام لە سەرۆکی وەزیران کرد زوو کارگەیەکی چیمەنتۆ بۆ ئەم شارۆچکەیە دروست بکەن. ئەندامانی شاندەکە هەموویان لێرەن و شایەدن کە چەندمان چالاکی بۆ پێشخستنی ئەم شارۆچکەیە کرد.

(زەبووك زادە) رووی بۆ لای (مەلا بەدر) وەرگێڕاو پرسی:

- مامە مەلا، بە هاوشارییان بڵێ من چ قسەیەکم لەگەڵ سەرۆك وەزیران کرد. دە قسە بکە! بۆچی بێدەنگ بووی!!

لە دڵی خۆمدا گوتم:

- ئێستا کاتی ئەوەیە (مەلا بەدر) هەموو کارە پیسەکانی (زەبووك زادە) بەو گۆڕە وەر بکاو تەواو ئابڕووی ببا.

(مەلا بەدر) لە کوێ دانیشتبوو، هەر لەوێ بۆی سەلماند:

- بەڵێ، راستە!! زۆرتان قسە کرد.

- تف لە چارەت!! مەلای بێ شەرەف!! لانی کەم شەرمت لەم ریش‌و سمێڵەت بکە!! چۆن درۆی وا گەورە دەکەی؟ هەی هیچ‌و پووچی بێ ئابڕوو!!

(زەبووك زادە) گوتی:

- جەنابی مەلا هەستەوە سەر پێ... بە قایم قسە بکە با هەموو هاوشارییان گوێیان لێ بێ.

مەلا لە جێی خۆی هەستایەوە:

- بەڵێ، جەنابی (زەبووك زادە) ئێمەی بردە لای جەنبی سەرۆك وەزیران... دەوری دوو سەعات قسە لە بارەی شارۆچکەکەمانەوە کرا. جەنابی سەرۆك وەزیران فەرموویان ئێمە ماڵ‌و گیانمان لە دەست جەنابی (زەبووك زادە)دایە. هەر ئەمرێکی بکا، یەکسەر جێ بە جێی دەکەین. حەیف کە تەنیا داوای یەك کارخانەمان لێ کرد! ئەگەر داوای دە کارخانەیشمان بکردایە، دەیدا. خودا سایەی (زەبووك زادە)مان لە سەر کەم نەکا!! بە راستی جێگای شانازییە بۆ ئێمە.

وای خودایە، ئەم مەلایە چۆن لە بەرامبەر ئێمە درۆی وا گەورە دەکا!؟ ئاخر بڵێ هەی مەلعوون، ئێمە لە ئەنقەرە جگە لە ئارەق خواردن‌و ژن بازی‌و لێدان خواردن چیمان کرد!؟

(زەبووك زادە) گوتی:

- هەر بژی مەلا!! تەنیا یەك شتت لە بیر کرد. دوای ئەوەی سەروکی وەزیران دەستووری دا کارخانەمان بۆ بێنن، ئەی مەسەلەی دروست کردنی ئاوبەندیش باس نەکرا؟ بۆچی باسی ئەوەت نەکرد؟ بۆ ئەوەی هاوشارییان دڵیان پێ خۆش بێ.

مەلا بە شەرمەزاری وەڵامی دایەوە:

- ببوورە ئەوەیانم لە بیر کرد.

مەلا ئەوەندە بە شێوەیەکی ئاسایی قسەی دەکرد، من خۆیشم گومانم لە شتەکە کرد. لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەوانە بەبێ منیش نەچووبنە لای سەرۆك وەزیران؟!! خۆ من یەك دەقیقە لێیان جودا نەبوومەوە. بۆی هەیە ئەو کاتەی لە ئوتێل نوستبووم، ئەوان چووبن. ئەی بۆچی هیچ بە منیان نەگوت!؟ بزانە چۆن رەگو کۆکیان دەردێنم؟

(زەبووك زادە) گوتی:

- جەنابی (ئەمین بازرگان)، تۆیش ئەوەی دیوتە بۆ خەڵکی باس بکە بۆ ئەوەی دڵنیا بن. بۆی هەیە (مەلا بەدر) هەندێ شتی لە بیر کردبێ. دە قسە بکە! هەستەوە! شەرم مەکە!

(ئەمین بازرگان) لە جێی خۆی هەستا:

- ئێمە نازانین درۆ چییە! تۆ بە جۆرێ قسەت لەگەڵ سەرۆکی وەزیران دەکرد دەتگوت قسە لەگەڵ کارمەندێکی بەر دەستی خۆت دەکەی! باشم لە بیرە پێت گوت: ئەگەر بە ماوەی حەفتەیەك کارەکانم پێك نەیێ، جارێکی تر ناوت ناهێنم.

بە قسەکانی (ئەمین بازرگان) لە سەدا سەد دڵنیا بووم کە هاورێیان منیان تەفرە داوە. کاتێ کە نووستبووم چوونەتە لای سەرۆکی وەزیرانو منیان بە خەبەر نەهێناوە.

من لەو بیرانەدا بوومو لە رکان گەرووم دەگوشرا کە (زەبووك زادە) رووی کردە من:

- جەنابی (مورتەزا)، تۆم بردە لای وەزیری پیشەسازی چیم پێ گوت؟ لە بیرتە گوتم: ئەگەر زوو نیشەکانمان جێ بە جێ نەکەی، خۆت دەزانی ها؟!

دیتم کاتێکی باشە بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆم بکەمەوەو بە هاوڕێیان نیشان بدەم کە زەبووك منیشی بێ ئەوان بردۆتە لای وەزیری پیشەسازی. گوتم:

- بەڵێ، قوربان، لەگەڵیا بەشەڕ هاتی. تەنانەت جوێنیشت پێدا.

بە کورتی (زەبووك زادە) یەك لە سەر یەك فێڵ و تەڵەکەبازیی دەکردو درۆی هەڵدەبەست. پاشان رووی لە یەکێکمان دەکردو دەیپرسی:

- وایە یان نا؟ تۆ شایەدی!!

ئێمەیش کە یەك لە یەکێ کەودەنتر و چرووکتر بووین، وەکوو بووکەشووشەی قورمیشکراو سەرمان دەلەقاندو قسەکانمان بۆ دەسەلماند. لەگەڵ هەر قسەیەکی دەیکرد دەنگی چەپڵەڕێزان و هوراکێشان بەرز دەبووە ئاسمان. خۆش ئەوەیە (برهان الدین) زیاتر هاتبووە جۆش. دەیگوت:

- هەر بژی (زەبووك زادە)!! خوا سایەت لە سەر ئێمە کەم نەکا!!

دانیشتنەکە تەواو بووو خەڵکەکە پەرتەیان کرد. لەگەڵ هاوڕێیان چووینە بارەگای پارت. کەس قسەی نەدەکرد. لە شەرمەزارییان نەماندەتوانی تەشای رووی یەکتر بکەین.

بە (مەلا بەدری ئاقڵمەند)م گوت:

- تف لە چارەتان ، هیچ و پووچینە، ئێوە بە کۆمەڵ چوونە لای سەرۆکی وەزیران، بۆچی بە منیشتان نەگوت؟

- کێ چۆتە لای سەرۆکی وەزیران؟ ئێمە کەی سەرۆکی وەزیرانمان دیوە؟

- دەك خوا زەلیلتان کا!! ئەدی ئەو درۆیانە چییە کردتان!!؟ بێ شەرمینە، سەد سوێندتان دەخوارد زەوی لەگەڵ دەلەرزی...

- چارەمان نەبوو. لە ناو ئەو هەموو خەڵکە دەمانتوانی چ بڵێین!؟ ئابڕووی پارتەکەمان دەچوو! ئەگەر بمانگوتبا: (وا نییە!) ئەوسا ناحەزانی پارتەکەمان چییان دەگوت؟ ناوڕم لە لای (ئەمین بازرگان) دایەوە:

- پیاوی تەواو، تۆ چ دەڵێی؟!

- مەسەلەکە پەیوەندی بە پارتو سیاسەتی وڵاتەوە هەبوو. وای دەویست درۆ بکەینو سوێندیش بخۆین!! کە گوێیان لێ دەبێ ئێمە چووینەتە لای سەرۆکی وەزیران، ئابڕووو ئوعتوباری پارتەکەمان بەرز دەبێتەوە!!

- تف لە رووی هەمووتان!! حەیف بۆ ئەو نانەی ئێوە دەیخۆن -!! 1

(ئیحسان تەڤاویت) زۆر تووڕە ببوو. زەق زەق تەماشای دوڕ چاوی کردمو هاواری کرد:

- ئەی بۆچی باسی خۆت ناکەی!؟.. خۆت لە ئێمە زیاتر سوێندت خوارد!!

- من بە ئێوە هەڵخەڵەتام... وامزانی ئێوە بێ ئاگادار کردنەوەی من چوونەتە لای سەرۆکی وەزیران...ئەگەر نا، من راستیم دەگوت.

(مەلا بەدر) گوتی:

-بە هەر حاڵ ئێستا ئەوەی چوو، چوو. با بانگی (زەبووك زادە) بکەین بێتە ئێرەو چەند قسەیەکی باشی لەگەڵ بکەین!!

خاوەن ئوتێل بزەیەکی گاڵتەجاڕی هاتێ:

-ئەگەر (زەبووك زادە) بدۆزنەوە، دوو قسە هیچ نییە، دوو سەد قسە بکە!!

(زەبووك زادە) سواری ماشین بوو و چووە ئەنقەرە: (حاجی حاجی مەککە!!) ئیتر فەلەك دەستی بە دامانی ناگا!!

بەڵێ، برادەری ئازیز، دەبینی ئەم (زەبووك زادە)یە چۆن تەماشای دەمو چاوی مرۆڤ دەکاو مرۆڤ ناچار دەکا درۆ بکا... ئاخ!!! تۆ نازانی ئێمە لە دەست ئەو زەبوکزادە بێ شەرەفە چەند لە رەزالەتو زەلالەتداین!! ناشبینە ئینسان!! ئێمە

کەللەمان پووکە. دەڵێی پڕ کایان کردووە.. کە خەڵك کابرایەکی ئاوها بێ ڕێو جێ دەکەن بە نوێنەری خۆیان، دەبێ چاوەڕوانی ئەو زەلیلیو ڕسواییە بکەن!!

ئێمە نە پێش دەکەوینو نە هەنگاوێك دەچینە پێش. نازانم تاکەی دەبێ زیانی نەزانیو کارنەزانیی خۆمان بدەین!!! لەوانەیە تا دوامینی عەمری خۆمانو تا دوامێنی عومری (زەبووك زادە)..!

# (18)

## (خەڵك لە هەموو شتێ دەگەن!)

برادەری ئازیزو خۆشەویست...

تۆ نازانی لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی کە لە تۆ دوور کەوتوومەتەوە سەروسیماو تەنانەت رەوشتو رەفتارم چەند گۆڕاوە!؟ ئەگەر بمبینی رەنگە نەمناسیتەوە. ئەو رووە خۆشو بە پێکەنینەی کاتێ هاتمە ئێرە هەمبوو، ئێستا بووە بە روویەکی گرژو شەکەتو نائومێد... ئەگەر مرۆڤ دێویش بێ، دوو ساڵی تەواو لە شارۆچکەیەکی دوورو لە غەریبایەتی بژی، لە ناو دەچێ.

دانیشتن لە شاری گەورەو بیر کردنەوە لە خەڵك کارێکی زۆر ئاسانە!! ئەو رۆژەی هاتمە ئێرە، دڵێکی زۆر پاكو سافم هەبوو!! زۆرم حەز دەکرد خزمەتی میللەت بکەمو ئێستا پێکەنینم بە یادی ئەو ساویلکەییو کەودەنییەی ئەوسام دێ. بە راستی ئەو کاتە مرۆڤێکی زۆر گێلو گەوجو کەودەن بووم!!

ئای چەند چاك دەتوانین خۆمان هەڵبخەڵەتێنین!! سەر تا سەری ژیانمان درۆو فرتو فێڵ تەفردانە! ئێمە هەموو رۆژێ، تووشی چەندەها فێڵو کەلەکە دەبینو تەنیا بۆ خاتری یەك قسە چاو لە هەموو شتێ دەپۆشین: ( خەڵك لە هەموو شتێ دەگەن!).

کەسانێکی زۆر تەنیا بە بیستنی ئەم قسەیە مەراییکەرانە بێدەنگ دەبن. ئێمە لە ژیانمان لەو درۆیانە راهاتووین: (خەڵك نازاننو هەست بە هیچ شتێ ناکەن!)

ئەگەر بیانزایە، یان هەستیان پێ بکردایە، ئەوەندە فریویان نەدەخواردو ئەوەندە فێڵیان لێ نەدەکرا!!

پێش چەند ڕۆژێ، دیسان ڕۆشنبیرانی شارۆچکەکەمان، کە چەند جار ناوتان بیستوون، وەکوو (مەلا بەدری ئاقڵمەند)و (ئیحسان تەقاویت)و (هەمزە جووت بەدزادە)و (ئەمین بازرگان)و (ئیسماعیل بەندەی خودا)و جەنابی (مورتەزا) خودا سەلامەتی کا، کۆببوونەوە باسی ئەوەیان دەکرد کە خەڵك هەموو شتێ دەزانن. چیرۆکی سەیرو سەرنجکێشیان لە بارەی دەرکتردن و هۆشی خۆیان بۆ یەکتر باس دەکرد. کە نەك تەنیا نیشانی تێگەیشتن نەبوو، بەڵکو گەوجایەتی ئەوانی دەگەیاند! من زۆرم هەوڵ دا هیچ قسە نەکەم، بەڵام خۆم پێ نەگیرا. گوتم:

- جەنابینە، ئەم نیشانەتان چی ئاقلانەیە؟بە ناوی ئەوەی : (خەڵك هەموو شتێ دەزانێ!) خەڵکتان غافڵ کردووەو خۆیشتان گەوجانە تەفرەتان خواردووە!! ئەو خەڵکەی ئێوە دەڵێن هەموو شتێ دەزانن، فەرموو لەو هەموو بەهرەیەی ژیان چییان هەیە؟!. ئێوە باشترین کارتان دەرگەوانیو وەستاییو کۆڵهەلگرییەو ژنو منداڵەکانتان هەمیشە بە حەزرەتەوەن یەك سك تێر خواردن بخۆن!!

ئێمە ئەگەر لە ڕاستیی تاڵو ناخۆشی بگەیشتباینو بمانزانیایە خەڵك بە بێ فێربوون ناتوانن ببن بە داناو تێگەیشتوو، بیرمان لە چارەیەك دەکردەوەو بێ شك بە ئامانجی خۆمان دەگەیشتین!! بەڵام حەیف دەمارگیریی نابەجێ بەری چاوی گرتووینو میللەتی خۆمان لە هەموو میللەتان بە بەهێزترو باڵاتر دەزانین.

برادەری ئازیزو خۆشەویست...

لە بارەی ئەو ناڕەحەتیو ناخۆشییەی لێرە دەیچێژم، هەرچی بۆت بنووسم هێشتا هەر کەمە.. پێویستە لەگەڵ یەك دابنیشینو ماوەی دە پازدە ڕۆژ لە سەر یەك بۆت باس بکەم!1

من لێرە تەواو خەرفاوم. ناتوانم لێرە بەرگەی بەردەوامبوونی ژیان بگرم!! تا ئێستا چەندین جار داوام بۆ وەزارەت نووسیوە بمگوازنەوە شوێنێکی تر. بەڵام هیچ

وەڵامیان نەداوەتەوە. خۆیشم دەمزانی وەڵام نادەنەوە. تا ئێستا کێ دیویەتی ئیشێك بە بێ ڕاسپاردنو بە بێ واسیتە هەر لە خۆیەوە بە بێ پارتیبازی بکرێ؟

من لە سەرانسەری دونیادا هیچ پارتم نییە، بۆچی بەلاش ئومێدەوار بم!! ڕۆژ بە ڕۆژ نائومێدترو هەناسە ساردتر دەبم!! دڵم تەنیا بە یەك شت خۆشە، ئەویش دیدەنی (زەبووك زادە)یە!! (زەبووك زادە) ئەم ساڵ لە هەڵبژاردندا بە جۆرێ شکستی هێناوە، دەڵێن تا دوو سێ حەفتەی دی دێتەوە شارۆچکە!

ماوەیەك بوو ناوی زەبووك زادە لە سەر زاران نەما بووو کەس هەفی بە سەریەوە نەبوو. هاوشاریو هاوڕێیانی (زەبووك زادە) هیچ باسی (زەبووك)یان نەدەکرد. بێدەنگییەکی غەمگین جێگای جۆشو خرۆشی کۆنی گرتبووەوە. خەڵکەکە وایان لێ هاتبوو، ئەگەر هەنگاوێکیان بهاویشتایە، لە هەنگاوی دووەم پەشیمان دەبوونەوە. دەتگوت دیسان خاکی مردوویان بە سەر شارۆچکەدا وەر کردووە!!

پێش چەند ڕۆژێ، کە دوای چەند ماوەیەك، لە قاوەخانە باسی (زەبووك زادە) هاتە پێشەوە، لە (مەلا بەدر)م پرسی:

-مەلا، ئەوە چۆنە (زەبووك زادە)، بەو هەموو زرنگییە، شکستی هێناوە؟ پێکەنینێکی گاڵتەی کردو وەڵامی دایەوە:

- ئەگەر بیاندایە دەست ئێمەی گەوجو گەلۆر دیسان دەنگمان دەدایێ. ئەم جارە ئەمر لە سەرەوە هاتبوو نابێ ناوی (زەبووك زادە) لە ناو لستەکەدا بێ. هەڵبەت دیارە لە ئەنقەرەیش باش ناسیویانە!!

من ئەوەندە هۆگری (زەبووك زادە) بوویم، سنووری بۆ نییە. هەر هێندە بێتەوە، دەچمە لایەوەو قسەی لەگەڵ دەکەم. بەڵکو ئەو گرێیەی دوو ساڵە لە ناو دڵم کۆبۆتەوە،بە تاڵ ببێ.

چاوەڕێی نامەی دادێ دەکەم کە بێ شك شتی گرنگت بۆ دەنووسم.

قوربانت...

# (19)

(...)

ئاخیری ئاشنایەتیم لەگەڵ (زەبووك زادە) پەیدا كرد... دوی شەو، لە یانەی مامۆستایان یەكترمان دی. لەگەڵ سەرنجی یەكەمدا، خۆشەویستییەكی زۆری لە دڵم پەیدا بوو. هیچ لە مرۆڤی قۆڵبڕو تەلەكەباز ناكا.رەفتارو هەڵس‌و كەوتی ڕێك پێچەوانەی ئەوەیە. كە تا ئێستا لێم بیستووە. زۆر بە شیرینی‌و دڵگری قسە دەكا. مرۆڤ ئەگەر دوو سەعات دابنیشێ‌و گوێ بداتە قسەی هەست بە ماندوو بوون ناكا.

هەستم كرد ئەویش هەوەسی بە من دێ. هەر زوو بە گەرمی كەوتینە قسە. هەرچەندە تەمەنمان زۆر جیاوازە، لەگەڵ ئەوەشدا، باش لە یەكتر دەگەین. (زەبووك زادە) زۆر سەخڵەت‌و ناڕەحەتە كە شكستی هێناوەو لە هەڵبژاردنی ئەم دەورەیە خستوویانەتە لاوە. لە ژیان بێزار بووەو زۆربەی كاتی خۆی بە تەنیایی لەماڵەوە بە سەر دەبا. هاوشارییەكانیشی نایانەوێ هات‌و چۆی بكەن‌و ئەگەر لە جادەو كۆڵانەیش لێی راست بێن، سەلامێكی لێ دەكەن‌و دەڕۆن. جێی سەرسامیش نییە. یەكێ ئەوەندە خەڵك تەفرە بداو فێڵیان لێ بكا، شكی تێدا نییە دەبێ بە مایەی رق‌و نەفرەتی خەڵكەكە.

قسەكەمان زۆری درێژە كێشا. ئەوەندەی هەوڵم دا نەمتوانی قسەیەكی تەلەكەبازیی، یان شتێكی تەفرەدان لە قسەكانی هەڵكرێنم!!

جۆرە هەستێكی بەزەیی‌و دڵسۆزیم بەرامبەر بەو لە دڵ پەیدا بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم:

- دیارە هاوشارییەكانی لە حەسوودی‌و بەرچاوتەنگی ئەو قسانە دەكەن.

داوای مەشرووبمان کرد. مەی، شەرمو لە ڕوودامـانیی نەهێشتینو دۆستـایەتیو دڵسۆزیی زیاتر کردین.

وەکـوو ڕۆژ لام ئاشـکا بـوو کـە (زەبـووك زادە) لـە ڕووی ئـەقڵو زیرەکییـەوە، بلیمەتـە. بـەڵام بۆچـی لـە هەڵبژاردنـدا شکستی خـواردووەو خستوویانەتە لاوە؟ ئەمەم بەلاوە مەتەڵێك بوو زۆرم حەز دەکرد هۆکەی بزانم...

دوای ئەوەی چەند پێکێکمان بە سەلامەتی یەکدی خواردەوەو زیـاتر بـە ڕووی یەکدا درایەوە، خۆی سەری قسانی کردەوەو گوتی:

- بـێ شـك لـەو ماوەیـەدا، زۆر شـتت لـە بـارەی منـەوە بیسـتووە. بـڕی ئـەو هاوشارییانەی ئەوەندە من لای لایدان گەورەو بەهێز نیشان دەدەن!!

نکوولی کردن فایدەی نییە! زۆربەی ئەو قسانەم باس کرد کە بیستبوومو گوتم:

- ئەگـەر هـەزارێکی ئـەو قسـانە ڕاسـت بوونایـە، تـۆ دەبوایـە ئێسـتا سـەرۆکی وەزیران بی! چۆنە لە نوێنەرایەتیش وە لایان نای؟!

زۆر بە گرانو سەنگینی وەڵامی دایەوە:

- برا، تۆ چ دەڵێی؟ تۆ لە کوێی؟ منیش پێش ئەوەی بچمە ئەنقـەرە، وەکـوو تـۆ بیرم دەکـردەوە. وامـدەزانی پیـاوێکی زرنگـم، بـەڵام کـاتێ کـە چـوومە ئەنجوومـەن، ئەوسا زانیم چ هەلەیەکم کـردووە. ئـەوێ شـێری وای تێدایـە هـەزار کەسـی قـۆڵبڕو تەلەکەبازیی وەکوو من بە نینۆکی پەنجەی گەورەیان نابێ!!

تۆ نازانی دایکان چ جۆرە کوڕێکیان هێناوەتە دونیا!! من لە پـازدە، شـازدە سـاڵی دەستم بە تەلەکەبازیو تەفرەدانی خـەڵك کـرد، ئـەوان، بـە ڕۆح، بـەر لـەوەی بێنـە دونیاو بە کردەوە لە دامەنی دایکیانەوە دەستیان پێ کردووە.

زۆرم کەیف بەوە هات کە گوێی لێ نەبوو بە ڕاستو ڕەوانی باسی کـەمو کـورتی خۆی دەکردو گوێی لێ نەبوو کە خەڵك بە تەلەبازو قۆڵبڕ ناویان دەبرد...گوتم:

- لەوانەیە هاوشارییەکان لە حەسوودییان ئەو قسانە بکەن.

پێکەنیو وەڵامی دایەوە:

- هاوشارییەکانی من (نەدیو بدین). سووچییان نییە. با بچنە ئەنقەرە بۆ ئەوەی ببینن (قۆلبڕ) بە چ دەڵێن؟

ماوەیەك کڕ بوو. دووبارە چەند پێکێکمان خواردەوە، گوتی:

- حەیف!! مرۆڤ ئەگر هەر دە پەنجەیشی وەکوو مۆم لە بەردەم ئەو خەڵکە بسووتێنێ، دوا جار دیسان ئەو قسەیەی نابێ بیکەن، هەر دەیکەن!!

نازانم چیرۆکی (روشدی)یان بۆ باس کردی؟ یان نا؟

- نەخێر. بۆیان باس نەکردووم.

- چۆنە لە بیریان کردووە ئەم مەسەلەیەت بۆ باس بکەن؟ بەڵێ، جەنابی (روشدی) دختۆرێ بوو دەوڵەت رەوانەی ئێرەی کرد بوو. ئاوو هەوای ئێرەی لێ نەدەکەوت. کەسیش نەبوو هاتو چۆی بکا. وای لێ هات وەکوو شێتی لێ هات. داوای لە پایتەخت کرد بیگوازنەوەو نووسی دەمنێرنە هەرچی دۆزەخێك دەچم، بەلام ئامادە نیم یەك چرکەسات لێرە بمێنمەوە.

بەلام لە پایتەخت، کێ گوێ بەو قسانە دەدا؟ داماوە دختۆر (روشدی) داوا لە دوای داوای دەنووسیو هەموو داواکان لە پایتەخت لە سەر یەك کەڵەکە دەبوون!!

دختۆر لە نەخۆشەکانی نەخۆشتر بوو. لە باتی چارەسەر کردنو نەوازشی نەخۆشەکانی، لەگەڵیان بە شەڕ دەهاتو مشتو مڕی دەکردن. جەنابی (برهان)یشی دەناسی؟ ئەو هێنایە لای منو باسی گیروگرفتەکەی بۆ کردم. بە راستی سکم بە حاڵی دختۆر سووتا. داماوە هەقی بوو. یەکێ لە پایتەختی ولات گەورە بووبێو شەوی لە ئاهەنگو کافەو سەماخانە بردبێتە سەر، بێ گومان لە شارۆچکەیەکی دوورو بێدەنگ هەڵئاکاو دەکەوێتە شێتخانە. گوتم:

- هەرکارێکی لە دەستم بێ بۆی دەکەم.

هەڵبەت ئەو کارەی دەمگوت بە پارە پێك دەهات. لە ولاتی ئێمەدا، هەموو زۆرو دەسەلاتو پارتەکان لە لایەك، پارەی لامەزەب لە لایەك!! برا گیان، ئەم میللەتە لە

بنچینەوە تێك چووە. ئەمڕۆ، هەتا وەزیریش ئەگەر بەرتیل وەرنەگرێ، هیچ کاری جیٚ بە جیٚ ناکا.

ئێمە ڕەوشتمان زۆر دابەزیوەتە ژێر سفر. دەمزانی ئەگەر بکەومە دوو ئیشەکەی، هەموو وا دەزانن بەرتیلم لیٚ وەرگرتووە. هەر کەسە خۆی چۆنە، خەڵك بەو جۆرە دەبینیٚ!! هیچ کەس بە خێری باوکی ناکۆکیٚ. ئەگەر دوو سیٚ هەزار لیرەمان بدایە، ئیشەکەی پێك دەهات. سەیرم ئەگەر لە گیرفانی خۆم بیدەم، پارەیەکی کەم نییە. ئەگەر رەپو راست پییان بڵێم بیری تر لە من دەکەنەوە. چارەم نەبوو مەسەلەم لە دختۆر (روشدی) گەیاند. یەکسەر چوار هەزار لیرەی دەرهێناو لە بەر دەمی دانام...

- برا، ها، هەزار دیناری بۆ خۆت بخەرە گیرفانت، ئەوەی تر بەو ناونیشانە بخەرە پۆستە...

خودا شاهیدە دەستم بە پارەکە نەکەوت. من زۆر دەترسم پاش ملە قسەم لە سەر بکەن. تەنانەت هەندیٚ پارەم لە گیرفانی خۆم خەرج کردو شتێکم دایە ئەو کەسەی کارەکەی بە دەست بوو تا دختۆر گوازرایەوە. بەڵام فایدەی چییە ئەو (برهان الدین)ە بێناموسە پاش ملە قسەی وای لە سەر کردم، هەر مەپرسە!! هەر کەسیٚ بوایە لە جێی من، شێت دەبوو. دوور لە رووی ئێوە یەکیٚ نەبوو پێی بڵیٚ: هەی سەگبابی بیٚ شەرەف، کیٚ هات لێت پاڕایەوە، بێیتە لای من؟ هەی بێناموس، تۆ خۆت هاتی دەستت ماچ کردمو هەزار سوێندت خواردو خۆت قوربانو سەدەقەی منداڵەکانم کردبۆ ئەوەی ئیشەکەت بۆ پێك بێنم. باشە بۆچی نمەك بە حەرامی دەکەی؟ بۆچی پاش ملە قسە دەکەی؟

(زەبووك زادە) تێك چووبوو. فرمێسکی لە چاو قەتیس مابوو. ئەوەندەی نەما بوو بگری. منیش نارەحەت بووم. بە زەحمەت خۆم پیٚ رادەگیرا... بە راستی ئەوانەی پاش ملە باسی ئەو پیاوە دەکەن، کەسانی درۆزنو ساختەچین.

پێکێکی ترمان هەڵدا. (زەبووك زادە) ئاهێکی قووڵی هەڵکێشاو بەردەوام بوو:

- من باش دەزانم تۆ ئەو ماوەیەی لێرە بووی، چ دەردو ئازارێکت کێشاوە؟

لە کاتێکا کە زۆر تێکچووبووم، دەستم پێ کرد باسی ناڕەحەتیو غەمو خەفەتی خۆمم کردو گوتم:

- گوێ مەدەرێ!!

(زەبووك زادە) بە جوولاندنەوەی سەر، پشتگیری قسەکەی کردم:

- لە کۆنەوە گوتوویانە: (تێر ئاگای لە برسیو سوارە ئاگای لە پیادە نییە.) ئەوان خۆیان لە پایتەخت هەموو شتێکیان هەیە، لە کوێ بیر لە خەڵك دەکەنەوە؟

زۆرمان خواردبووەوە، بەڵام من مێشکم بە تەواوی کاری دەکرد. تروسکایی ئومێدم کەوتبووە دڵو وام هەست (زەبووك زادە) ئەگەر بیەوێ ، دەتوانێ ئیشەکەم بۆ پێك بێنێ.

لەو ماوەیەدا توانیبووم دوو هەزار لیرە پاشەکەوت بکەم. بە شەرمەوە. سەرم دانەواندو گوتم:

- برادەری ئازیز، نەجاتی منیش لە دەست تۆ دایە. وەرە بە گیانی منداڵەکانت سوێندت دەدەم. وەرە مەسەلەی گواستنەکەم بۆ پێك بێنە.. دوو هەزار لیرەم هەیە. بێ گومان لە مەبەستم دەگەی..!!

پێکەنیو دەستێکی لە شانم دا:

- ناڕەحەت مەبە. بەڵێن دەدەم کارەکەت بۆ پێك دێنم. ئەوەندە بە دڵنیاییو بە ئارامی قسەی دەکرد، بێ دەستی خۆم، دەستم بردە گیرفانمو ئەو دوو هەزار لیرەیەم دەرهێنا کە ئەو ماوەیە پاشەکەوتم کردبووو بێ هیچ دوودڵییەك لە بەر دەمم دانا. یەکەم جار ویستی وەرنەگرێ. بەڵام کە زۆر سوور بووم، پارەکەی هەڵگرتو هەرێی دا بە ماوەی یەك حەفتە کارەکەم پێك بێنێ.

کە (زەبووك زادە) هەستا رۆیشت، (ئەمین بازرگان) هاتە لامەوە سەرنجێکی بەزەیی لێدامو وەکوو یەکێ کە کابرایەکی سیلدار بلاوێنێتەوە، گوتی:

- وای... وای... تۆیش ئیشت تەواو!! بەدبەختو داماو بووی.

بە ئەنگوست نیشانەیەکی (زەرب)ی لە سەر میز کێشاو بەردەوام بوو:

- ئەگەر هەر زوو ئاهو ناڵەت لێ هەڵنەستا، من سمێڵم لە بنەوە دەتاشم!!

* * *

سەعاتێکی تر من لێرە دەڕۆم. وا نەزانی (زەبووك زادە) ئیشەکەی پێك هێناوم و ئەمری گواستنەوەی دەرهێناوم. نەخێر! کابرا پارەکەی وەکوو پاقلاوە لێ خواردم و قومە ئاوێکیشی لە سەر کرد. ئێستا ئەوە دوو مانگە، هەر ئەمڕۆو سبەم پێ دەکاو دەڵێ: (سەبر کە، بەم زووانە ئەمرەکەت دەگا.) ئیتر ناتوانم ئەم شارۆچکەیە بمێنمەوە. ئیستیقالەم دا لە پەروەردە. پاس لەبەردەم ئوتێل ئامادەی ڕۆیشتنە، سەعاتێکی دی لێرە دەڕۆم.

بێ شك زۆر حەز دەکەی بزانی چیم لە (زەبووك زادە) کرد. من هیچ گلەیی و ناڕەحەتیم لەو نییە. پارەکەمی حەلاڵ بێ. دەرزێکی زۆر گەورەی دامێ نرخی زۆر لە دوو هەزار لیرەکە زیاترە. هی وەکوو ئەو هیچ سووچیان نییە. ئێمە خۆمان سووچداری ڕاستەقینەین. کە فریوی (قۆڵبڕ)ی وا دەخۆین. قۆڵبڕەکان مرۆڤی بە مێشك و دەروونناسن. زۆر زووو زۆر باش لایەنی بێ هێزیمان دەست نیشان دەکەن و پەنجەی لە سەر دادەنێن. ئێمەین کە بە تکاو پاڕانەوە وایان لێ دەکەین بێن کڵاومان لە سەر بنێن.

لێرە دەڕۆم، بەڵام دەزانم بچمە هەر شوێنێ ڕوو بە رووی ئەو زەبووکانە دەبمەوە... نازانم دەچمە کوێ و چ دەکەم؟ تەنیا ئەوە دەزانم کە ئیتر تا ماوم هیچ مرۆڤی قۆڵبڕ و شەللاتی ناتوانێ تەفرەم بدا.

لەوانەیشە بە پێچەوانەوە بێ... ئاخر لە کۆنەوە گوتوویانە: (بنیادەم شیری خاوی خواردووە.)

تەواو.

